منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# کاروان

٨٦

گۆڤاریکی رۆشنبیریی مانگانەیە ئەمیندارێتی گشتی‌ی رۆشنبیری و لاوان بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

ئابار / ١٩٩٠ سالێ هەشتەم



# كاروان

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە.. ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان بەزمانی کوردیی و عەرەبی دەری دەکا

سەرنووسەر
حکمت حاجی سلیم

جێگری سەرنووسەر
حسین ڕەشوانی

لەم ژمارەیەدا



٨٦

ئایاری / ١٩٩٠

ساڵی هەشتەم

ئەدرەس:
هەولێر ئەمینداریتی
گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان
گۆڤاری کاروان: ت : ٢٠٨٨٢

لەنامەخانەی کتێب و بەڵگەنامەکان لە بەغدا ژمارە ،٤٨٣، ی ساڵی ،١٩٨٢،ی دراوەتێ.

● ئەو ووتارانەی نەشیان بۆ بلاوکردنەوە: نادرێنەوە بە نووسەرەکانیان.

لەچاپخانەی ڕۆشنبیریو لاوان لە هەولێر چاپکراوە

نرخی ،٥٠٠، فلسە

● خزمەتگوزارانی کورد

# موفتی زەهاوی

● کاوە عزیز سعید ●

گەلی کورد وەك هەموو گەلانی سەر رووی زەمین بۆی هەیە شانازی بەگەورە پیاوان و هەڵکەوتوانیەوە بکات، چونکە ئەم نیشتمانەی ئێمە دایکی بەوەفای نالیو جزیریو خانیو مەولەویو گۆران و بێتوشیو نۆدییو سجادیو خالْ...... هتد، بگرە بەچەندەها کەڵە پیاوانی تر کە هەتا هەتایە مێژووی گەلەکەمان شانازیان پێوە دەکات، ناویان بەسەر رووپەرەی مێژووەوە بریسکەو تریسکەیان دێ، وە بوونەتە سەرمەشقی باش و چاکی بۆ پاش خۆیان و گەلێك کەڵکیان بە نەوەکانی پاش خۆیان گەیاندوەو خزمەتی بێ ووچانیان کردووە.

بوونەتە رۆژێکی روناك لە ئاسۆی دەم گەلی نەتەوەکەمان، وەبگرە چەندەها زانلو دانای وامان تیا هەڵکەوتووە کەبونەتە مایەی شانازی هەموو گرۆی موسڵمانانی سەر رووی زەمین، هەمیشە بەرێزو ستایشەوە ناویان دەبەن پێویست بەنمونە ناکات و کتێبە مێژوویەکان گەواهی ئەم راستیە دەدەن، شوێنێکی وەك شاری سلێمانی کە بەچەندەها زاناو رۆشنبیری تیا هەڵکەوتووە، لەبەر زۆری ئەو زانایانە کەسیان لەکەسیان دیار نەبوون هەمووکات پێش برکەی زانین و تێکۆشان بووە.

یەکێك لەو زانایانە «موفتی زەهاوی»یە. ناوبانگی بەزیرەکیو بلیمەتی سەردەمی خۆیەوە دەرکردووە، کەچی هێشتا لەبەر ئەوەی کە جێگای تایبەتی دیاری نەبووە بەهۆی زۆری ئەو زانایانە ئەبێتە هۆی مایەی کۆچی یەکجارەکی لە سلێمانیەوە بۆ کەرکوك و ئنجا بەهۆی زیرەکیو پایە بڵندیەوە ئەچێتە بەغداو هەرلەوێش ئەمێنێتەوە بنەماڵەکەیان لەو یکانە جێ گیردەبێت و خۆشی هەر لەوێ کۆچی دوایی دەکات هەر ئەوێش دەبێتە ئارامگای پیرۆزی.

## ژیان و خوێندنی:

ناوی محەممەد کوری مەلا ئەحمەدی کوری حەسەن بەگی کوری روستەم بەگی کوری کەیخسرەو بەگی کوری ئەمیر بابا سلێمانی کوری فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەی پشدەرییە، بەم پێیە موفتی لە خانەوادەی بابانە، لە ساڵی ١٧٩٧زدا لە شاری سلێمانی لە دایك بووە سەرەتای خوێندنی لەلای باوکی بووە ئنجا چۆتە لای زانای بەناوبانگی کورد «شێخ مارف نودێیی ١٧٥٣ز- ١٨٣٨ز» چەند زانستێکی ئەوکاتەی لەسەر دەست وەردەگرێت وەك (نحـو و صرف و بلاغـەو عروض) بەتەواوەتی و چالاکی هەموویان لەلا تەواو دەکات و هەردەم شانازی بەم خوێندنەوە کردوە[1].

تەنانەت کاتێ کەچووە بۆ بەغدا مەلا عەرەبەکان زۆر سەرسام بوون بەعەرەبی زانێکی وەك موفتی وەپێیان ووتوە تۆیەك کە کوردی ئەم عەرەبییە لەکوێوە ئەزانیت ، بەلام ئەم لەوەلامدا بە شانازییەکەوە دەڵێ لەلای شێخ مارف نودێیی عەرەبیم خوێندووە)[2]. دوای ئەم خوێندنە چۆتە لای زانای بەناوبانگ (شێخ عەبدوڵای خەرپانی ١٧٣٨ ـ ١٨٣٣ز) بۆوەرگرتنی چەند زانستێکی ئیسلامیتر بەتایبەتی (شەرع و مەنطیق) ئەوەی ئاشکرایەو وون نابێ قوتابیانی ئەوسای کوردستان کون و قوژبنی هەموو شوێنێکیان پشکنیوە بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری وە هەر مامۆستایەك بەزانستی ناوبانگی بووە، موفتیش وەك قوتابیان ئەوسا بارگای پیرۆزی دەپێچێتەوەو بەرەو (سنە) دەکەوێتە رێ بۆ لای مامۆستای زانا شێخ سەعیدی تەختی بۆ وەرگرتنی خوێندنی بیرو باوەری ئیسلامی «علم الکلام» بەلام مردن یەخەگیری مامۆستاکەی دەبێت و ناچار ئەچێتە لای برا گەورەکەی کە ناوی (شێخ قەسیم ١٧٢٠ـ١٨١٨ز) بووە، ماوەی چەند ساڵێك ئەمێنێتەوە تا بە تەواوی شارەزایو و بلیمەتی بەچەنگ دێنێت. موفتی زۆر ئازاو ووریا بووە لەدوای ئەو هەموو خوێندنە هەر دەست هەڵناگرێو بەرەو شاری (سابلاغ) ئەکەوێتە رێ لەلای زانای بەناوبانگ (مەلا

مەحەممەدی ئیبن رەسوولی ١٧٦٧ـ١٨٣٠ز) ئەمێنێتەوە تا بەتەواوەتی هەموو زانیاریەکی ئیسلامی لەلا تەواو دەکات و لە ساڵی ١٨٣٠ز هەر لەوێ ئیجازەی خوێندنی پێ بەخشراوە ئنجا گەراوەتەوە[٣] بۆ کوردستانی عیراق لە پێشا لە (خۆشناو)و دوای ئەوێ لە سلێمانی مامۆستابووە.

موفتی زۆر دەست کورت و نەدارابـوو بەلآم تا بڵێی زانــاو دانابووە، لەبەر هەژاریو مالا چاکیەکەی خەڵکی هانیان داوە بچێتە ئەستەمبووڵ، کە لەپاداشتی لێهاتوویی‌و زانابیەکەیدا سوڵتان فرمانبەریەك، یا گوندێکی پێ‌ببەخشێ‌و لەدەست کورتی رزگـاری بێ، ئەویش کەچوٚتە ئەستەمبووڵ لەهەرلایەك لێیان نەپرسیـوەتـەوەو چی‌بـەدەستەوە نەماوە، کەوتوٚتە کرێکاری‌و لەپاشـەکـەوتی رۆژانـەکـەی، بەرگێکی قەشایەنەی کریوەو، سەرلەبـەیـانیـەك بەدار دەستێکـەوە، چوەتە بارەگای شێخو لئیسلام، وە رایگەیاندوە کە تێ گەیوەو بەخەو دیویەتی ئاینی ئیسـلام هەقەو ئەیەوێ ببێتە موسڵمان لەسەردەستی شێخو لئیسـلام ئاینی ئیسـلام وەربگرێ، لەلایەن خەلیفەو صەدرو لئـەعـظەم و گەورە پیـاوانـەوە بار بوویـەکی بەنـرخ کراوە مامـۆستایەکی بۆراگیراوە کە بەدوومانگ لە خوێندنی قورئان بوٚتەوە، خۆی ناوی (محەممەد)ی لەدوا ئیسلام بوونە درۆکەی بۆ خۆی هەڵبـژاردووەو گەورە پیـاوان پەسـەنـدیان کردووەو خەلیفەش نازناوی (ئەفەندی) پێ بەخشیووە و مامۆستاکەشی لەزیرەکی‌دا نازناوێکی تری (فەیض)ی داوەتێ چونکە ئەوەندە بەهـرەمەندبوە لەزیرەکیدا، ئەمجا بوەتە (محەممەد ئەفەندی فەیض)و لەوێ کراوە بەمـامـۆستـاو دوای پێنج ساڵ لەسەر خواستی خۆی خەلیفـە سێ گونـدی پێ ئەبەخشێ‌و دیسانەوە گەورەکان باربوویەکی دیکەی ئەکەنەوەو ئەگەرێتەوە بۆ سلێمانی.[٤]

ئەم گەشتەی موفتی بۆ ئەستەمبووڵ ٥ ساڵ دەخایەنێت کەئەو پێنـج ساڵەش بەر (١٨٣٤ـ١٨٣٨ز) ئەکـەون و دیسـان ئەو سەردەمی ژیـانی (مـوفتی) بەرفـەر مانـرەوانی (سـوڵتـان مەحموود)ی دووەمی عوسمانی ئەکەوێ کە (موفتی) فێڵەکەی لەسوڵتان و کاربەدەستانی ئەو ساکە کردووە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کەموفتی لەو ماوەیەدا پێگەیشتووەو بوٚتە خاوەن گوندو سامانێکی زۆرو رێزێکی یەکجار گەورەی لێ گیراوە ئنجا گەراوەتەوە بۆ سلێمانی چونکە ژن و ماڵ و منالی لەوێ بوون، وەهەروەها نیشتیمانیشی بووە.[٥]

دوای ساڵێـك مانـەوەی لە سلێمانی لە ساڵی ١٨٣٩ ئەحمەد بەگی موسلیم کاغەزی بۆ موفتی نوسیوە کە ببێ بەمودەریسی مزگـەوتی (موسلیم) لەگەرەکی (قۆریەی) کەرکوك ئەویش کە جێگـەی خۆی بە ئاسـوودە نەدیـوە بە خێـزانەوە بۆ دواجار سلەیمانی بەجێ دێڵێ‌و رووئەکاتە کەرکوك ئەم ئەحمەد بەگە زۆر رێـزی موفتی گرتـووەو خزمەتی کردووەو، چەن ساڵێك موفتی لەوێ تەدریسی کردووە، خوێنـدەواری بەرزی پێگـەیـاندووە.

چوار پێنـج ساڵێـك لەوێ ماوەتـەوە لەنـاوەنـدی ساڵانی (١٨٤١ـ١٨٤٤)دا بە ئیجگـاری لەکـەرکـووکیشەوە چوە بۆ بەغـداو لە ساڵی ١٨٤٤زدا لەبـەغـدا مودەریس بووە پاشتر سەرۆکی مودەریســین . زیـرەکی موفتی دەنگی دابـوٚوە ئەو هۆیەش بووە کە لەساڵی ١٨٥٢ لە لایەن والی ئەو ساوە (گوزلکی رەشید پاشا) بکرێتە موفتی شاری بەغدا بەیەکجارەکی لەوێ نیشتـەجێ‌بـووە، ئەمیش ئاکـامی لەدوورە وڵاتی دا سەر نانـەوەکـەی مەولانا خالیدو نالی‌و حاجی قادری کۆیی‌و شێخ رەزا... هتد بوو بەچارە نووسی.

تا ساڵی (١٨٩٠ز) کۆچی دوایی دەکـات و هەر لەو شوێنەی کەدەرسی تیـا وتـوٚتـەوە لەمـزگەوتی سلێمانی کەبە (مدرسة السليمانية)[٦] بەناوبانگە بەخاك دەسپێرێت.[٧]

**ماڵ و خێزانی موفتی:**

موفتی دووژن و دوو کەنیـزەکی[٨] هەبووە ئەم ژنانە یەکێکیان ناوی گوڵنـاز بووە، پێش چوونی بۆ ئەستـەمبوڵ لە سلێمانی مارەی کردووە پێنج کورو کچێکی لێ بووە، ئەوی تریان پیرۆزی ناو بووە خەڵکـی کۆیـە بووە چوار کورو کچـێـکی لێبـووە.

کەنیـزەکـەکـانیش ناویـان رەنـدی‌و رەیحان بووە. رەندێ لە ئەسـتـەمـبـوڵ سوڵتـان پێـشـکـەشی کردووەو هەرلەوێ گواستویەتیەوە،سێ کورو کچێکی لێبووە. بەلآم رەیحان کاتێ چوٚتە بەغدا والی پێی بەخشیوە، تەنها کورێکی لێبووە. کورانی موفتی بەرەو دوا بەم جۆرە لەدایك بوون [عبد الله، عبد الحكيم، علي، محمـود، محمد رشيد، محمد صالح، عبد اللطيف، محمد سعيـد، عبـد الحميد، محمد سليم، عبد الغني، جميل صدقى عبـد الجليـل][٩] شایـەنی باسیشـە ئەم کورانـەی زۆربەیان وەجـاخی باوکیـان رۆشنتـر کردوٚتـەوەو لە لایـەن حوکمرانی ئەوکاتەدا جێگەی تایبەتیان هەبووە، نەك لەبەر ئەوەی کە کوری ئەو پیـاوە گەورەیەن بەڵکو پلەو پایەی خۆیان شایستەی ئەو جێگەیە بووە کەپێی گەیشتوون.

بۆ نموونە یەکێکی وەك جەمیل صدقی کوری موفتی کە بە شاعیر بە ناوبانگ بووە، هەروەها چەندەها پلەو پایەی هەبووە لەلایەن دەسەلآت دارانی ئەو رۆژە بۆ نموونە کراوە بە ئەندامی مجلس معـاريف و ئەعیـانی ئەوسـا، هەروەهـا بوٚتـە بەرێـوەبـەری

چاپخانەی ولایەت و سەرەك نوسەری رۆژنامەی زوراء، وەبگرە لەچەندەها پلەو پایەی تر دەوری خۆی بینیوەو شایانی باسیشە کەپانزە کتێبی دانراوی خۆی هەیە.[10]

**هەوڵ و کۆششی:**

تەمەنی بیست ساڵان بووە کە ئیجازەی خوێندنی وەرگرتووە، ئیتر هەر لەوکاتەوە توانای ووتنەوەی دەرس و پێ گەیاندنی قوتابی هەبووە.

تاوێکیش لەوەمەیدانەدا نەوەستاوە، کە هەشتا ساڵی رەبەق دەکا، لەم ماوەیەدا چەندەها زاناو قوتابی پێ گەیاندووە، بۆ نمونە (شێخ عبدالرحمن ی قەرەداخی ١٢٥٣-١٣٣٥ك)، (مەلا عەلی قزلجی ١٢٤٠-١٢٩٦ك)، (مەلا ئەحمەدی کوێر ١٢٤٥-١٣٣٥ك)، (مەلا مەحەممەدی مەحوی شاعیر ١٨٣٠-١٩٠٦ز) (شێخ مصطفی کوری شێخ بابە رەسوڵی بەرزنجی ١٢٣٥-١٣٠٢ك)..هتد.

بەچەندەها زاناو بلیمەتیتر کە ژمارەیان خۆی دەدا لەشەش هەزار قوتابی کەلەبەردەم موفتی دا چۆکیان داداوەو فێری خوێندن و زانین بوون.

شایانی باسیشە کە ٣٨ ساڵ لەسەریەك لە کۆتایی تەمەنیدا موفتی بەغدابووەو لەگەڵ دەرس ووتنەوەشدا فتواو ئامۆژگاریشی کردووە[11]. موفتی بۆ هیچ پرسیارێ دانەماوەو یەکسەر وەڵامی داوەتەوە[12]، زیرەکیو بلیمەتی یەکجار جێگای سەرسورمانە، خاوەنی بیری خۆی بووە، بەتواناو چوست و چالاکی سەردەمی خۆیی بووە، لەهەموو زانستێکدا پێشەواو زانا بووە، لە پیشەو دەستەکەوتی رۆژانەدا قەڵەندەرێکی بێ نموونەبووە. بەسە بۆ پایە بڵندی موفتی کە شاعیرێکی وەك شێخ رەزای تاڵەبانی لە دوو دێر شیعردا موفتی بەهەموو گەردوون ناساندووەو ئەڵێ:-

«ئەی مادەری گیتی تۆ هەتا ئیستا نەزاوی
زاتێکی وەکو فەیضی ئەفەندی زەهاوی»

★ ★ ★

«مومکین نییە ئیدراکی حەقایق بەتەواوی
مومکین نییە ئیدراکی نەکا زەینی زەهاوی»[13]

★ ★ ★

**مەردایەتیو ئەمەك ناسی:**

غیرەت و مەردایەتی موفتی بەناوبانگ بووە هەر لەوکاتەوەی کە شاری سلێمانی بەجێ هێشتووەو روی کردۆتە کەرکوك و بەغدا بەهیچ جۆرێ لەخۆی بایی نەبووەو نەگۆراوە، وە تا بڵێی بەئەمەك بووە، داڵدەی چەندەها بێ نەوایانی داوە، لانەی بۆ چەندەها هەژاران بنیات ناوە، دڵی چەندەها رەبەنی خۆش کردووە. بەچاوی پر بەزییەوە نۆڕیویەتیە ئەوکەسانەی کەئیش و کاریان کەوتۆتە لای نەخوازەڵا ئەو کوردانەی کە رۆژگاری ناهەموار ناچاری کردبن بەکۆچ و چوونە بەغدا، ئیتر ئەگەر دەستیان گەیشتبێتە یەکێکی وەك موفتی ئەوا بەختیار سەرفرازبوون موفتیش کەم تەرخەمی نەکردووە، وەبەباشی دەستی گرتوون و لەلای والی یا هەر کەسێکی تر بێ تکای بۆ کردوون تا دای مەزراندوون، سەرگورشتەی وای لێ ئەگێرنەوە کە شایانی ئەوەیە بەئاوی تەلا بنوسرێتەوە کەپریە لە ئازایەتیو مەردایەتی بەرامبەر بەنەتەوەکەیی، هەرگیزاو هەرگیز لە مۆرکی کوردیەت بەهیچ جۆرێ وەرنە چەرخاوەو سەرراست و نەترس بووە. لەسەر هیچ جۆرە قسەیەك پەکی نەکەوتووەو ئازا هاتۆتە وەڵام، مەحوی ئاسا هەر کەسێ شێتانە بەردی تێ گرتبێ ئەو بەرقی تێکرتووە. لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی یەکجار قسەخۆش بووە، هەق وویست و خوا پەرستێکی بێ نمونە بووە لەرێبازی ئیسلام بەموو لای نەداوەو گۆش کراوی رەفتاری جوان و باوەری خاوێن بووە.

**لەمەیدانی شیعرو نوسیندا:**

موفتی وەك زۆربەی زانا بەناوبانگەکانی ئیسلام دەستێکی باڵای هەبووە لەشیعردا، بەڵام خۆی پێوە خەریك نەکردووە، ئەوەتا وەك شانازیەك لەتاکە شیعرێکی عەرەبیدا ئەڵێ:

لو يحسب الحسب المرء علا فوق معالى
كنت بالعلم وبالشعر على العالم العالى

واتە [ئەگەر یەکێ بەوە جاخ زادەیی ژوور هەمووکەسێ بکەوێ من بەزانایییو شاعیری ژوور هەمووکەسێ ئەکەوم]. بەڵام لەبەرئەوەی زیاتر بە زانایەکی ئاینی بە ناوبانگ بووە، زۆر خۆی پێوە خەریك نەکردووە. یەکێکی وەك مەعروف رەسافی شاعیر دەڵێ [ئەگەر بێت و موفتی هێندەی نیوەی من و جەمیل صدقی خۆی بەشیعرەوە خەریك بکردایە گەڵی گەڵێ لەئێمە شاعیرتر و شیعری زۆرتر ئەبوو].

شیعرەکانی موفتی ئەوە دەردەخەن کە زۆر بەیانی کوتو پرو لەبۆنەیەکی تایبەتیدا و بەبێ خۆبۆ ئامادەکردن واتە بەدەمیو [ئیرتیجالی] دەری بریون، ئەوەش بۆتە هۆی زۆر بڵاوبوونەوەی شیعرەکانی و گەڵێ جاریش نەگونجاوە بنوسرێتەوەو لەناو چوون، چونکە بەزۆری دانەنیشتووە بۆ شیعر دانان تاکو

نوسخەیەکی لەلای خۆی بمێنێتەوە. ئەوەتا زانای بەهەشتی [شێخی خاڵ ١٩٠٤ـ١٩٨٩] دەفەرموێ [موفتی هەرچەند بە شیعرەوە خەریك نەبووە، کەچی لەگەڵ ئەمەشا کە وورد ئەبیتەوە لە شیعرەکانی، دەرئەکەوێ کە لە سەرچاوەیەکی روون و رەوانەوە هەڵ قوڵاوون وەلە دەریایەکی زۆر قووڵی گەورەی بێبنەوە هەڵگیراون بەڵام ـ داخی بەجەرگم ـ ئەو شیعرانەی کە بوویەتی کۆنەکراونەتەوە، وەهەر شیعرێکی کەوتۆتە لایەك، بێگومانم هەزاران شیعری موفتی لەگەڵ ئەوکەسانەی کەلەبەری بووە مردوون، کراون بەژێر خاکەوە، وەچوونەتەوە پەردەی نەبوون یاخود لەکون و قوژبنی کتێب خانەکانا ماونەتەوە تابزن ئەیان خوا، یا دڵۆپە لەناویان ئەبا، یا ئاگر یان پێ ئەکرێتەوە][14]. جگە لەچەند دێرێکی کەم نەبێ کەلەکاتی خۆیدا شێخی خاڵ لەزمانی ئەم و ئەو، نوارینی چەندەها پەراوێزی ئەو کتێبانەی موفتی کەدەرسی تیا وتۆتەوە وبگرە کتێبی ئەو قوتابیانەش کەلەلای موفتی دەرسیان خوێندووە، کۆی کردوونەتەوەو خستونیە دوو توێی کتێبێکەوە لەگەڵ ژیان و بەسەرهات و زیرەکیو بلیمەتی موفتیدا لە ساڵی ١٩٥٢دا بەچاپی گەیاندووە.

ئیتر هیچی ترمان پێنەگەیشتووە، وە ئەو چەند دێرانەش بریتین لەعەرەبیو فارسیو کوردیو تورکی. بۆ نمونە ئەم دوو دێرە شیعرە کوردیەی ئەخەینە روو.

مەم دڵێ خستمە تەشویش و خەیاڵ و خەترە
کە بەدیقەت نەزەریشی دەکەمێ مەمنوعە

★ ★ ★

خوا هێشتە ئەگەر دائمە تۆ بتخەنە سەرچاو
لەم عالەمدا عەینی درۆیە وەکو عەینەك

هەروەها دەستێکی بالاشی هەبووە لەنوسینی پەخشانداو لەسەر دەمی خۆیدا دەنگی دابۆوە بەتایبەتی لەنووسینی وتاردا، هەروەها لەدوانگەشدا کەئەو وتارانەی دەخوێندەوە کەس هەستی بەوە نەدەکرد کەئەمە کوردە. بۆ دارشتنی ووشەو پێکهێنانی رستەی پرمانا، ووردە کاری لەروانگەی رەوانبێژییەوە. وەجێی داخە کە نوسینی وەك کتێب نییە، هۆکەشی ئاشکرایە وزانراوە، کە (٨٠) ساڵی رەبەق بەدەرس وتنەوەو پێگەیاندنی قوتابیان خۆی خەریك کردووە، وەك خۆی لەچوارینەیەکدا دەڵێ:ـ

عاق تدریسی عن التالیف لکن
ما انا من فضل ربی متأسف
من تلامیذی الفت کتاباً
کل سطر منه في العلم مؤلف

واتە [دەرس وتنەوەم بوو بە بەرهەڵستی کردنم بۆ دانانی کتێب بەڵام لەرەحمەتی خواوە دڵ تەنگ نیم چونکە لەقوتابیەکانم کتێبێکم داناوە کەهەموو دێرێکی دانراوێکە لەزانستێکدا]

بەڵێ نکوڵی لەوە ناکرێت کە موفتی بەچەندەهای پێگەیاندووەو ئەوانیش بوونەتە چرایەکو خزمەتی زۆریان کردووە، چ بە نوسراو یا بە ووتنەوەی دەرس.

وەبگرە زۆریشیان بەچەندەها پەراوی زانستیان نووسیو گیانی موفتیان پێشادکردو چاوی خوێنەوارانیان پێ رووناك کردەوە. جێی خۆیەتی کە دێرێ لەوشیعرانەی (سەید ئەحمەدی راوی واعظ) بۆ نمونە بهێنینەوە کە لەشینی چلەی موفتیدا ووتوویەتی:

اذ لاتری ذا العصر فضلاً في المرء
الا ومنه صدوره في المورد

واتە [رۆشنبیرانیو خوێندەوارانی عیراق لەدوای (موفتی) یا قوتابی خودی موفتی، یا قوتابیی قوتابی ئەون][15]. ئەمانەی کە باسم کردن مشتێکە لە خەروارێك و دڵۆپێکە لەدەریا بەرینەکەی موفتی زەهاوی، مەبەستیشم تەنها ئەوەیە ئەوزاتە بلیمەتە لەیاد نەکەین. ئیتر هەزارەها سڵاو لەگیانی پاکی موفتیو ئەوانەی وەك موفتی بوونەتە مەشخەڵی رێگاو هەمیشە بۆخزمەتی کردنی گەلەکەمان لە بارو بێووجان بوون.

پەراوێزو سەرچاوەکان:

١ـ علماؤنا في خدمة العلم والدين. ص٥١٧، عبدالکریم محمد المدرس
٢ـ مفتی زەهاوی لاپەرەی ١٠ دانراوی شێخ محمدی خاڵ
٣ـ علماؤنا ص٥١٨
٤ـ رۆشنبیری نوێ ژمارە ١٠١ لا ١٠٧ لاپەرەیەکی پێچراوە لەژیانی موفتی زەهاوی لەنوسینی (هۆشەنگ)
٥ـ هەمان سەرچاوە لا ١١٩
٦ـ ئەم مزگەوتە کەوتۆتە سەر کەناری روباری دیجلەو لەخوار وەزارەتی بەرگری یە ئێستاش وەك خۆی ماوەتەوە.
٧ـ موفتی زەهاوی لاپەرە ٢٠.
٨ـ کە نیزەك: هاوواتای (جاریة)ی عەرەبییە، وە بەئافرەتێکی کافر دەوترێ کە موسڵمانان لەجەنگا بەدیل ئەیان گرن لەبەرئەوەی کەلەئاینی ئیسلامیدا رەوانییە بکوژرێن. مارەدەکرێن و هەروەکو ژنی خۆشیان دەبێ سەیر بکرێ بەرامبەر بەهەموو مافێکی ژن و مێردایەتی.
٩ـ موفتی زەهاوی لاپەرە ٣٩ـ٤٢ وە هەروەها سەرچاوەی ژمارە ٤ لا ١١٦.
١٠ـ دیوان جمیل صدقی الزهاوی ـ بیروت ـ ـ دار العودة ـ طبعة الثانیة سنة ١٩٧٩.
١١ـ علماؤنا في خدمة العلم والدين ص ـ ٥٢٠
١٢ـ رشتەی مرواری بەرگی شەشەم لا ٥٦ ـ ٥٧.
١٣ـ دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی ـ ١٩٤٦ ـ لاپەرە ٨٠ـ٨١.
١٤ـ موفتی زەهاوی لاپەرە ٤٩ ـ ٥٠.
١٥ـ رۆشنبیری نوێ ژمارە ١٠١ لا ١١٤

# وشەبەندان و نەوبەهاری ئەحمەدی خانی

لێکۆڵینەوەی : رەئووف ئەحمەد ئالانی

## ● بەشی دووەم ●

### بەفرو بەرف

هەردووکیان بۆ یەك تاکە مەبەستن : «هەڵی بەستوو، وەك لۆکەی سپی، کلووکلوو لە ئاسمانەوە دەبارێتە سەر زەوی».

ئایا کوردی کە جارێك (بەفر) بەکاردەهێنێ‌و جارێکی دی (بەرف) بەکاردەهێنێ، سەر بە لەحن و هەڵگەڕانەوەیەکی فۆنەتیکیە وەك لە ـ تەرزەو تەزرە ـ دا، یان هەڵ کشانەوەیەکە بۆ بەرەبەیانی مێژووی وشەکە؟

جارێ بەخـۆم رەوانابینم بڕیار لەسەر بنجایەتیی هیچ کامیان بدەم بۆ ئەوی دی.

أ ـ ئەوە ئاشکـرایـە کە وشـەکـە نێو کۆی زمانە ئارییەکانە. لەنـزیکـە زمـانی هینـدیو فارسیش دا بێـژەی [بـەرف] بە پێچەوانەی [بەفر] جێ گیربووە. ئەوەش لەبەرچاوە کە زاڵەزمانی فارسی لەمێـژە خۆی بەدێـرینـە زمـانی کوردی مر کردوە و زەرووئـاسـا هەڵی مژیوەو بە سەدان وشەی کوردی نەژادی ـ بەدەستگـاو ئاهـەنگی خۆی لە کوردی لانـەواز کردوە. دەبـا ئەوەنـدە مەرد بین ئەو زەوت کراوانـە بەلانـەی خۆیـان شادبکەینەوەو بە فۆنۆلۆژیی کوردی دەستەمۆیان بکەینەوە.

لەو بارەیەوە نەکوێرە رەگەز پەرستانەچ بیردەکەمەوەو نە ئەوەنـدەش خۆم بە کەم دەزانم کە بڕوام بەهـەبـوونی خۆم نەمێنێ.. بە ئاشکرا بانگی لێهەڵ دەدەم:

ـ هەم و خۆم ناکەمە دەروزەکەری بەر ئاستانەی هیچ لایەك.

بـ «ڤەفرە» ی ئاوێستا، زادەزمانی دێرینمانەو بەکەمە گۆڕانێکی دەنگ سازییەوە پەلی هاویشتوە؛ کەواتە بۆ بەراوردی ئەم خشتەیە[١٦] :ـ

| کۆمەڵەی یەکەم | کۆمەڵەی دومم |
|---|---|
| ١ـ [ڤەفرە] ئاوێستا | ١ـ[ڤەرف] پەهلەوی |
| ٢ـ ڤەورـ بادینان | ٢ـ ڤەرڤەـ زازا |
| ٣ـ وەفرـ گۆران. | ٣ـ وەروەـ هەورامان |
| ٤ـ وەورێـ زازا | ٤ـ بەرفـ[١٧] بۆتان و هبندی و فارسی |
| ٥ـ بەورـ جاف | |
| ٦ـ بەفرـ سلێمانیو موکریان زوربەی شوێنەکان | |

**پێشەکی :ـ بەبێ چەندو چـوّن ، دەنگ گۆڕکێ لەنێوان [و، ڤ، ف، ب، ە، ا، یَ، ] دا ، خۆکـردی سەرانسەری زمانی کوردییەو کارێکی ئاسایییە**

بەنموونە:

١ـ بەیەك خستن = پێك خستن/ سلێمانی.

٢ـ وێك خستن/ موکری.

٣ـ ڤێك خستن/ شێوەی سەروو. وەك:

«ڤێك خستن ئەحمەدێ خانی

ناڤێ نوبارا بچوکان دانی» ل.خ/ لاپەرە ـ ٢٩.

٤ـ ڤرە ڤر، ڤراندن = فرە فر، فراندن: جوولاندن.

٥ـ ڤا، ڤادار [زازا]: با، بادار.

٦ـ هەڵپەرکە = هەڵپەرکێ. شاناخسە = شاناخسێ..

٧ـ ناو، نێو = ناڤ، نیڤ... هتد.

ئەگەر بۆ باری سەرنجیش بێ، بەیاسای بنکەی دوانە «ثنائی» لەبنیادی وشەی ئاریدا، بەرابەر بە سیانە «ثلاثی» لە بنیادی وشەی سامیدا، گەردانێك بەو وشە ئاوێستاییەی لەمەر خۆمان دەکەم و لە روانگەی لێکدراوەوە دەی روانمێ:

ا ـ ڤە = ڤا = وا = با = باد / وشەیەکی مێدییە [18].

ب ـ فر، فر = رەگی [فران، فراندن]: رانین و پەرش [19] دەبێتە:

بەفر = سیفە: ئاوەڵناوی بەرکار+ پاشگرە ناوی [ە] = ناوی ـ بەفرە = ڤەرە = بەفرە.

بۆ سەلماندنی ئەوەی کە بزوێنی [ە] پاشگری ناوە، نموونەی ئێستا دەخەمە بەرچاو:

ـ کڵاو + کوور: ئاوەڵناوی کڵاولار + ە = «کڵاوکوورە» ناوی جۆرە باڵندەیەکی کڵاولارە.

هەروەها [باڵەفرە]: ناوی فەرخە باڵندەی تازە باڵ گرتووە.

بەهەمان هاوکێشەی [ڤەفرە] بۆ ناوی [باران] = ڤا = وا = با = باد+ ران/ رەگی- رانین = ڤاران، واران، باران. لەگەڵ کەمە گۆرانێك دا.

أ ـ (ڤەور)ی بادینیو (بەور)ی جاف یەك دەقن = بەفر = ڤەفر. بەتێ چوونی پاشگری «ە» هەروەها [وەفر]ی گۆران و [بەفر] ی موکری بەکەمە دەنگ گۆرانێکەوە لەگەڵ تێچوونی پاشگرە ناوەکەدا.

لە [وەورێ] ی زازادا، تەنیا پاشگرەکە شکاوەتەوە بەلارەژێری [ێ] و دەقەکەی پاراستوە.

ب ـ لە کۆمەڵەی دوەمدا، شێوە زازاییو هەورامییەکە، رەوش و سیمای ئاوێستیەکەو پەهلەویەکەیان پێوەدیارە: ڤەرڤە = ڤەرف بەهەمان خۆ پاراستن: وەروە = ڤەرڤە.

هێشتا ئەم دوانە تەواوترن لە پەهلەوییەکە.

لە بۆتانیو هیندیو فارسییەکەدا، تەنیا دەنگی [ڤ] گۆراوە بە /ب/. کۆمەڵەی یەکەم بە هەر شەش دەقەکەوە کاری نەکردوەتە سەر گەردان و ساختمانی دەقە ئاوێستاییەکە، ئەوەی رووی داوە دووشتە

١ـ ئاڵوگۆرێکی ساکار لە برێ دەنگ داو دۆخی پێك هاتنی وشە لێکدراوەکە بە سەلامەتی ماوەتەوە.

٢ـ بەهۆی زۆر بەکارهێنان و خواستی سووك گوتن پاشگرەکەی لێ سواوەتەوە، ئەویش نەك بە تێکرایی؛

شێوە پەهلەوییەکە، هەڵگەراوەیەکی ناچڵێ ئاوێستاییەکەیەو بەو دەقەی خۆی بەر یاسای وشەسازیی کوردی ناکەوێ لەوشەی لێکدراودا هەڵ گەرانەوەکەی وەك (مێروو لە و مێلوورە) یە یەکەمیان بریتیە لە (مێروو + لە ی پاشگری گچکە ناو، ناتوانی لە دوەمیان دا بڵێی پێك هاتووە لە: [مێلوو + رە] چونکە شتێك نیە ناوی [مێلوو] بێ.

بەهەر حاڵ ئەم دەقە هەڵگەراوەیە، لە زۆر زمان دا خۆی دارشتوەو زۆر بەکزیو نامووییی لە بۆتانیو هەورامیدا سیمای دیارە.

**ئەنجام:**

ـ هیچ خەمخۆرێکی کوردی، بەوە رازی نابێ، تەنیا بۆ تاکە مەبەست و واتایەك دەقەوارە وشەی بەیەکداچوو بخاتە زمانی نووسینەوە؛ دوای ئەو هەموو رەتانەو دیمانەبیری «نظری» یە، دەرکەوت کە بێژەی «بەفر» باشتر بنکە مێژووییەکەی پاراستوە.

ـ بەم لێکۆڵینەوەیە دەرکەوت کە زمانی کوردی زۆر دێرینترە لە زمانی فارسیو پاشماوەی ئاوێستای تێدا پارێزراوەترە. بەراوردی ئەو دوو کۆمەڵەیە بەڵگەیەکی زیندوەو رێگەبەستی ئەو بوختانکەرانەیە کە بەچاوی رەمەکیو پاشینەی ئەولاو ئەولا روانیویانەو دەروانن زمانەکەمان. یان دەیانەوێ رەوتی زمانە ئەدەبییەکەمان سەرەولێژ بکەنەوە. دە لێبگەرێن و کەموڵەیەك لە

ـ بەفراوەکەی مەولەوی بخۆنەوە:

«گاچون بۆی نەسیم وەرووی شەتاودا
گاچون گوڵ، نەپای چۆرەی ـ وەفراو ـ دا».

٧ـ «فخذ» رانە (ضرس) ددانە (شفّە) لێف
(ظهر) پشتە (سرّة) ناڤك (جوف) ناف»

لەوانەیە پێم بڵێن ئەم کابرایە شتی ئاشکرا دەکوتێتەوە؛ ئەوە خەڵکەو دەڵێ [ددان] و خەڵکیشە دەڵێ [دان]... ئەوەش دەزانم کە شێخ مارف نۆدێیی/ ش لە ـ ئەحمەدیـ یەکەیدا [ددان]ی نووسیوە.

چ خانیو چ شێخ مارف زاراوەکەیان بە کامڵی بۆ نووسیوین.. بەڵام ئێمە لە مەیدانی نووسین دا، نەکامڵانە هاتووینەتە دەست؛ چاو بگێرە بە بەرهەمی زۆرینەی نووسەرانمان دا کە

نووسیویانه:

ـ دانسـاز، دان پێـدانـان = اعتـراف ـ هەروەها، دانكەندو دانكردن و...هتد لەلایەن خۆمەوە ئەو كردەوەیە بە گەمەی زمان دەزانم؛ ئاشكـرایـە كە [دان] وەك چاوگەكار، بە مانای شت پێدان و شت بەخشینەو قەدەكەی ـ دا ـ یەو رەگەكەی ـ دەـ یە. لەدۆخی نەرێشدا، نەدان ـ ە: دای، دایان، دەدەن، نادەن، بدەن. بەهەمان روخسارە دەنگ، ناوە بۆ دانەوێڵە، وەك دان ـ ی دا بەمریشكەكان. ئەمەیان دەچێتە خانەی رێكەوتە دەنگەوە؛ بە زانستی وشەسازی [دان]ی چاوگ بەرەگ و قەدیەوە گەردان دەكا چا سادە بێ یان ناسادە بێ. [دان] ی بەمانای وشكەتۆو تەنیا بە لكێن و زێدەی دیكەوە وشە دەخاتەوە ساختمانەكەی ناگۆڕی و ئاڵوزی پەیداناكا.

بەهەمان فۆرم [دان] مۆرفیمێكی رێزمانییەو ناوەلكاری شوێنی پێك دەهێنی، وەك [گوڵ + دان].

مەبـەستی من ئەوەیـە لە سەرەتـاوە گێروگـرفتـەكـان بوروووژێنم و دەردە زمـانییەكان زەق بكەمەوەو[20] بە ئاسانی چارەیان بكەین.. دەنا ئەوە ئاخاوتنی كوردی بە دەیان و پتر وشەی هاوبێژ جەڵەدەكا.. هەر لە [دان، دانە، ددان. دانو، دانە دانەو.. هتد تا دەگەنە تەغار.

ئەوا ئەم فرێـزمان نووسی: «دان وەرین» بەچی بزانین مەبـەست رژانی دەنكـە دەنكـەی برێشكەو هەنارە یان هەڵ وەرینی كەڵبەو خرێیە؟

لەشیكـردنـەوەی رێـزمـان داو بەتـایبەتی لەمەیدانی فێركـردن دا، تووشی فەلاكـەت دەبـین، داەـاوێكی فێرخوازی كوردی نەشارەزا كە بۆت نووسی [پارەی دانی وەرگرت] لەسێ لاوە زەینی پەرت دەبێ:

١ـ پارەی ددانی وەرگرت/ دان: ددان

٢ـ پارەی دانەوێڵەی وەرگرت/ دان: دەنكە دەنكە.

٣ـ پارەی بەخشین و وانێكی وەرگرت / دان: [....]

هیـچ نەبێ دەتوانین لە پێناوی دەستوورسازیدا، ئەو ئاڵۆزە زمانیانەكەم بكەینەوە:

ـ دان: بەخشین و پێدان بە گەردان خۆی جیادەكاتەوە.

ـ ددان: ریزە ئێسقانی دانە دانەی سەر كاكیلە.

ـ ددان + ە = ددانەی مشارو شتیوا.

ـ ددانساز / ئاوەڵناوی كارا

ـ ددان پێدانان/ بەخوازە: اعتراف.

ـ دانە = دەنكە دەنكەی شت. هتد:

«هاتم بەبۆنەی خاڵت. تووشی بەڵای زولفت بووم

تەیرێكی نابەڵەد بووم، نەم زانی ـ دانە و داوە»

وەفایی ـ ل ١٥٢

[ناف و ناو]

ئەو دوو بێژەیە سەر بە چ بنكەیەكن و لە كوێوە سەریان هەڵ داوە؟

تێچێنێك:

گەردوون زانەكان دەڵێن، ئەگەر «توونێلە رەشە» یەكی هێندەی دەرزیلەیەك لەو سەری كاكەشانەوە داخزێو خۆیدا بە گوێ زەویداو لە چاو تروكانێكدا ورگی زەوی نەسمیو تێی نەتـەقـانـد، ئەوا ئەم دنیایە لە كفلەكوونێك دا، یەك جارەكی تەرتوتونا دەبێ!!

وشـەی زمـانیش كە لە مەڵبـەندی خۆی ترازاوگۆڕانی بەسـەردا هات، لە ئاوازو رووخسـاردا، لووتـی دەبـێ بە هاوبێـژێكی دوورە مەبـەستیـەوەو چ گۆڕانێكی دەنگسـازی بەسەر ئەمیان دا هات، هەمان گۆڕانە دەنگ بەرەنگاری ئەویش دەبـێو دەم و دەراوی ناوچـەیی، بێ بەزەییـانـە ـ لێیـان وەخۆدەكەوێو دەچنە یەك كەوڵەوە. ئەو مانای ئەم و ئەم مانای ئەو دەقـۆزێتـەوە؛ ئەم رووداوە یەكێكە لە فیتنە هەوێنەكانی فرەشێوەیی تاكە زمانێك..

ئەوجـا. بۆئـەوەی قسەكانم نەبنە دیمانەبیریی رووت، بۆ ئەم لێكۆڵینەوەو بەراوردەی خوارەوە:

چەمكـە زمانێكمان هەیە كە پێی دەڵێن «اسم» چەمكە زمـانێكی دیكـەشمـان هەیە كە پێی دەڵێن: نێوەندو «جوف». مەنتیقی زمان داوای دوو بێژەی جیاوازو سەربەخۆ دەكا بۆ هەر یەكێك لەو دوو مەبەستە.. دواتر بەتاوی لكێن نەك دەنگسازی، بۆ دەیان زاراوەی دی، یان بە خوازە زاوزێ دەكەن.

ئێمـە لەو بارەیـەوە، مشـوور خۆرنیی، تەنیا ئەوەیە كە ئەمبـارە سۆرەو تۆرەی دەنـگ گۆركێ بە گژیەكدا دەكەین و دەستەداوێنی رەوش و حاڵ و مەقام دەبین؛

بەنموونە:

وەك لە هەنـدێ سەرچـاوەم هەڵ كراندوە، بۆ ئەو دوو

مەبەستەی کە هێنامنە گۆڕێ، دوو زاراوەی ئاوێستایی و مێدیمان هەن:

أ- «نام» وەك لەم دەقەدا:

«فە - نام - ستایش اوی همی بود» واته - به [ناو] وستایشی ئەوەی کە هەمیشە بووە- بەوسادەییە، فارس دەقی [نام] ی کردە ملکی خۆی و لە کوردی دابڕی. وەك وشەیەکی نامۆ، دەقی [نـام] بەسـادەیی لە هەسـت و چێـژی کوردەواریدا نەحەواوەتەوە.. ئەمە بێجگە لە هەندێ لقە شێوەی گۆران داو بەتایبەتی لە هەورامیدا کە [نام]ی وەك خۆی هێشتوەتەوە. ئەوجا هەر ناوچەیەو بەدەنگسازیی خۆی لە بێژەی [نام] وەخۆکەوتوە.

١- لەبەر ئەوەی کە دەنگی /م/ لەسازگەی لێوەوەیە، کوردە کوێستانییەکان گۆڕیویانە بە /ڤ/ وەك [ناڤ].

٢- کار بەئەوەشەو نەوەستاو، هاوسنوورەکانی موکریانیش - بۆ خۆدابرین هەڵ کشاویەکەشیان گۆڕیوە بەلارەژێر، وەك [نێڤ].

٣- گەرمێنیش حەز بەدەم کردنـەوە دەکەن، دەنگی /م/ یان گۆڕیوە بە /و/ وەك [ناو]

٤- لەموکریشدا - وەك دیاردەیەکی تایبەتی هەمان - ناو - یان کردوەتەوە بە [نێو].

ئا بەو شێـوەیـە، چوار بێـژەی هاو واتـا لە بنـجی [نام[21]]هەڵ کەوت بەرابەر بە تاکە چەمکی «اسم»، بەلام وەك بۆی دادەکشێم، ئەم کارە بە ئەوەندەوە ناوەستێ!

ب- «ناوە = ناوژە: ناوچە»[22]

بەگـوێـرەی توانی خۆم لەو دقە مێدیە دەکۆڵمەوە: بۆم دەردەکەوێ، لە رووی پێك هاتنەوە ئەو جووتە بێژەیە دارێژراون لە [ناو + ە] یان [ناو + ژە] لەبەر ئەوەی کە دەنگی /ژ/ و /چ/ نزیـك بەیەکن، ئاڵوگۆڕ دەبن. بە تێ پەڕبوونی رۆژگار دەنگی /ژ/ تێ چووەو «ناوە» رەگی داکوتاوە و لە حاڵی حازریش دا وەك ئاوەڵکار، کوردەو دەی لێ و دەی لێتەوە:

(ناو ناوە- سەرمان لێ بدە) ناوکە = ناوە... ناو جەرگە ... هتد.

باشترین نموونـە ئەم زاراوەیـە [ناوە]: بەرووله دارێکە دەخرێتە ناوەراستی وشەمبەرەی نیرەوە. لێرەدا پاشگری «ە» ئاوەڵکاری «نـاو» ی کردوە بە ئامـێرەنـاو. سەبارەتەکەش بریتی یە لە نێوەندیەتی و نێوجەرگەیەتی.. کەواتە بنجی ئاوەڵکارەکە [ناو = جوف] ی مێدیەو هەربەسادەیی واتای (ناوچە) بەدەستەوە دەدا. هانا دەبەمە بەر ئەم بیرەوەریەم و پشوویەك:

«لەدەوروبەری سالی ٩٤٤ - داو لە کۆنە گوندی - ئاوکورتێ - تازە فێری خوێندنەوە بوو بووم.. خوشکە رەحمەتیەکەشم یاریدەی دەدام. رۆژێکیان لەگەڵ شتـومـەکی پێچـراوەی شاریدا، پەرمیەکی زەردهەڵ گەراوی پانوپۆڕی هات بەدەستەوە.. دوای قەدەرێك پەنجـەی خستە بان دێرێك و فەرمووی: رەئووف! ئەوەتـانێ ناوی- هەمـزاغـای - ی بڵخـوانێی کن خۆمـانیان خستـوەتە غەزەتەیەوەو باسی ردێنە سوورەکەشیان کردووە: - ئێمـە رۆڵەی ئەم [ناو] ین لامان وایە، هەرچی ریشی سوورە هەمزاغایە -»

لەبەر ئەوەی کە مۆسیقای [ئەم ناوین] م پێ سەیربوو، ئەو گوتەیە لە زەینم دا چەسپی!!

ئێستا دەفامێنم کە ئاوەڵکاری [ناو] بەبێ پاشگر بۆ دەوروبەرو نێوند لە کاردایە. خۆ ئەگەر بشڵێین (رۆڵەی ئەم ناوەین) لەباری مەسـەلەکـە ناگۆڕێ و بزوێنی «ە» ی دوای - ناو - پاشکۆی راناوی ئیشاریی - ئەم - ە، لێرەدا نەبەشی - ناوە - ە و نە پاشگریشە.

سەرەنجـام بەرلەوەی کە [نـام] گۆڕانـی بەسـەردا بێ، ئاوەڵکاری[ناو] بنجی بووە و گۆڕانی بەسەردا هاتووە، وەك: - ناو = نێو، ناڤ، نێڤ ، نیڤـ.

ماڵی فۆنـەتێکم برمێ ئەو چوار پێنج بێژمیە جارێك هەموویان دەکـا بە گژ واتـای «اسم» داو جارێکی دی هەموویان دەکا بەکوڵکی واتای نێوەندو جەوف دا !!

بمانەوێ و نەمانەوێ، تازە بەسادەیی [نام] مان بۆ ماڵی نابێتـەوەو لەبـەر ژەوەندی سەربەخۆیی زمانەکەمان نیە؛ هەر ئەوەندە بی خەینە نووسینمانەوە، دوو هەرا بەرپادەبێ:

١- هەندێ زمانەوانی خۆمان، تیژتر دەبن لەسەر ئەو قسەیە کە دەڵێن: (مـەڵبـەندی زمانە ئەدەبیەکەمان، خاسێت و ماسێتی ئێدە کوردانی لە نێوایدانینە).

٢- عەجـەمـەکـانیش ئەوەنـدەی دیکـە ئەم قسە ناژیرانەیە تاودەدەن: «زەبانی کوردی دونبال و عامیەئی ما هەست»؟!

بەلاشیـانەوە کوفرە کە ددان بەم راستیەدا بنێن: لە پێش ئەوانەوە «نام» و «ناو» دوو وشەی ئاوێستایی و مێدین!

تەنیاچارەمان خستنە کاری ئەو لایەنە هونەری یە کەلە

لایەن خۆمەوە ناوم لێ ناوە تایبەت کردن .. ئەگەر نارِ استە و خۆش بێ لە ئەدەبیاتی دوو شاعیردا، ئەو کارە هونەری‌یەم بەدی کرد:

أ- ئامارێك لە دیوانی - نالی - دا کە بەرابەر بە ئیسم هەر نووسیویەتی [ناو = نام] و بەرابەر بە نێوەندو زەرف - مەگەر لە دەستی دەرچووبێ - هەر نووسیویەتی [نێو] نەك وەك شێوە موکری بو هەردووکیان [نێو] نەك وەك شێوە سلێمانی کە هەردوکیان هەر دەنووسن [ناو]

ب- ئامارێك لە دیوانی پرتەوی[٢٥] هەکاری‌دا کە بۆ ئەویان نووسیویەتی [ناڤ = نام] بۆ ئەمیش [نیڤ].

دەبا ئێمەش لە دواچوان نەچین و لە کەمە دەنگ گۆرِکێ‌یەك سوود وەربگرین و خۆمان لەو هەموو سۆرەو تۆرەیە رزگار بکەین و بنووسین:

[ناو: اسم] و [نێو: جوف][٢٦]

٨ «اجعل، بکێر (اسحق) بهێر (اضرب) بقوت (انظر) بنێر. (اقرا) بخون (أعلم) بزان (ایمان) ب مەعنا باوەرە»

- بهێر = بهارە:

کاری فەرمانە بۆ کەسی دووەمی تاك. لە شێوەی نێوەندی‌دا، راناوی (ە) وەردەگرێ و چاوگەکەشی (هارین)ە و بەچەشنی شێوەی سەروو، (هێرین) نی‌یە. گۆرانی هەڵ کشاوی «ا» بەلارەژێری «ێـ» لەحنێکی ناوچەیی‌یەو بنجی‌نی‌یە. لەزمانی نووسین دا ناشێ بەجووتە (بهێر، بهارە) بخرێنەکار؛ چونکە تووشی بەربلاوی دوو جۆرە گەردانمان دەکاو ناتوانین دەستووری لەسەر دابمەزرێنین.چاویش لەوە دەپۆشرێ کە ناوەدەنگی [هێرە و هارە] بە واتای - بارە - ی بزن و دەنگی داروخان - لەزمانەکەمان دا باون. بەڵام بەربەستی ئەم رێکەوتە دەنگانە لە زمان دا، کارێکی هێجگار زەحمەتە!

- بقوت = بکوتە:

بەهەمان گەردانی پێشوو، یەك ریشەن. هەرچەندە دەنگی «ق» لەزمانی کوردی‌دا بووەتە فۆنێمێك و ناتوانین لەهەموو شوێنێك دا جێی پێ لێژبکەین.. وەك - کور - و - قور - یان - قەل - و کەل و ...و ...لەونموونانەدا، ئاڵوگۆریی دەنگی قاف و کاف، شیرازەی زمانەکەمان هەڵ دەوەشێنێتەوە. رەگی (قوت) ئاڵۆزی پەیدا دەکا لەگەڵ (قوت)ی بەمانا: قیت و قنج و زیت دا.

ئێمە کە لەجەرگەی زمانەکەمان دا، چاوگی «کوتان» مان بۆ رەخساوەو بە رێکی دەکەوێتە گەردان و چەندان زاراوەی لێکەوتووەتەوە و لە جیهانی کتێب دا جێگیربووە، هیچ پێویست ناکا سەرلەبەری دەنگی «ك» ەکانیان بگۆرینەوە بە [ق] کە لە رەچەڵەکی زمانەکەمان دا گومانی بنجایەتی لێدەکرێ. لایەنی هونەریش لە نووسینی باودا، رێگەنادا بەوە کە بەهاوتەریبی ئەم دووچاوگە [قوتان ، کوتان] وێکرا بخەینە گەردان.

- بنێر / بۆتانی
- بنۆرە / موکری
- بروانە / سلێمانی

بەبێ لێکۆڵینەوەیەکی زانستانەی مێژووی وشە ناتوانم لەم سێ چاوگەدا، بریار لەسەر بنجایەتیی هەرکامێکیان بدەم: (نێرین، نۆرین، روانین) کە بە تاوی دەنگسازیی ناوچەیی لەیەك بنکەوە هەڵ چەرخاونەوە بۆ یەك چەمك: «تەماشاکردن» جارێ گەردان کردن بە هەرسێکیان دەبێتە گەمەکردن بەزمانی نووسین . ئەو زاراوانەی کە لە چاوگی «روانین» کەوتوونەتەوە، بێتو چاوگەکە دەستکاری بکەین بە تاوی یەك رەتی گەردان، دەشێ هەڵ بوەشێنەوە، بەنموونە زاراوەی «روانگە» کەوشەیەکی فۆلکلۆری‌یەو لە چێژو وتادا، هۆش و گۆشمانی پێراهاتوە لە چاوگی (روانین)ە، کاری کردە نی‌یە بی‌کەینەوە بە (نێرگە، نۆرگە)!!

- زانین و زانست:

وەك خانی فەرموویەتی: اعلم = بزانە.. یان بەبێ راناو (بزان)، چاوگی [زانین] مان دەخاتە بەردەست و دەشێ کارێك رەچاوبکەین خۆماڵیانە بێینە دەست.

ئەوا دیارە لە زمانی فارسی‌دا چاوگی [دانستن] و چاوگەناوی [دانش] و ئاوەڵناوی [دانا] و ئاوڵکاری [دانشگە، دانشگا، دانشگدە] .. هەن

ئێمە لە گەردانی [زانین و ناسین] دا بەرابەر بە «علم، معرفة» زۆر رەت بڵاوین؛ لەزمانی عەجەمان دا رەگی چاوگەکە [دان] ە بەزێدەی [ش] و [ست] زاوزێیان پێکردوە. لەکوردی‌دا [زان] رەگی (زانین) ە هەرای لەسەر نی‌یەو رێك لەگەڵ «علم»ی زمانی عەرەبی جووت دەبێ. با هەندێك تەبایی بە خۆمانەوە ببینین و ئارێك لێکدی بدەینەوە:

دوای دامەزراندنی کۆری زانیاریی کورد لە

بەغدا [٢٧] چەند زاراوەیەك دابەزی، وەك:
١ـ زانیاری: علمیی.
٢ـ زاراوە زانستیەکان: المصطلحات العلمیة.
٣ـ زانکۆ = زانین ـ ین + کۆ: الجامعة
٤ـ زانا: العالم

هەروەها لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی خوێندنی کوردییەوە:
١ـ زانست: المعرفة
٢ـ زانیاری: علوم، معلومات

لەلایەکی دیکەوە، هەنگاوی پێشوو پەبڕەونەکراو زاراوەی [زانستگا = الجامعة]

لە ئەدەبیات و نووسین دا، وەك خۆی مایەوە! تەنانەت، خوالێخۆش بوو مامۆستا صادق بهادین، کە لەوێدا ئەندامی کارابوو لەسەر بەرهەمەکانی خۆی نووسیویەتی «ژ چاپی کری بێت ئەکادمی یا کوردی»

هیچ ڕۆشنبیرێکی دڵسۆز بەو خۆ خۆییە رازی نییەو دەبا کەمێك بەندیواری یەکدی بین و زۆرینەی ئەو وشەو زاراوانەی کە لە چاوگی [زانین] ەوە گەردان دەکەن، باریان لێ نەگۆڕین بەنموونە کە بڕیاردرا [زانکۆ] و لەسەر وشە سازییەکی خۆماڵی و نەك دوورەگ، لەپای چی بیخەینەوە سەر قاوانی زمانی فارسیو بەبالای ـ دانشگا ـ دا، هەڵ بڕوانین؟!

کەواتە با لە روانگەی (خانی) یەوە بۆ علم و زانین بڕوانین. بەداخەوە مەودای ئەوەم نیە کە بە لاباس درێژە بە گەردانی زانین بدەم!

**ـ باوەڕ: بڕوا**

خانی ئەوەی داوە بە دەستەوە کە زاراوەی «باوەڕ» گشتیترو فراوانترە لە چەمکی (ایمان)؛ کە فەرموویەتی: ایمان ـ بە مەعنا ـ باوەڕ ـ ە.

لێرەدا پێویستمان بەدەور کردنەوەیەکی فەرهەنگییە:
أـ باوەڕ: واتاناوە بۆچەمکی کاری بەڕاست زانینی شتی. مەسەلەیێ و ... وەك: باوەڕبکە ئەم کارە وانییە.. باوەڕت هەبێ! درۆت لەگەڵدا ناکەم.
بـ ڤاڤەر: بەهەمان واتای پێشوو. وەك پیشان دراوە ئەم وشەیە، وەچی راستەوخۆی [ڤاڤەر] ی پەهلەوییەو لە دوو کەرت پێك هاتووە:
١ـ کەرتی دووەمی [ڤەر] لە ئاوێستادا بریتییە لە «ڤەرەنە». بە گوێرەی ئەم سەرچاوانە (ف.معین.ف. برهان)
ـ ڤەر ـ بە واتای ناسینەوەو بڕواکردنە.
٢ـ لەدینی زەردەشتیدا، تاقیکردنەوەیەك هەبووە بۆ دیاریکردنی تاوانبارو بێ تاوان... دوو جۆرە «ڤەر» هەبووە: ڤەری گەرم و ڤەری سارد: بۆ ئیسپات کردنی بێ گوناهی لە ڤەری گەرم دا (ئاگر) و (ڕۆنی داغ کراو) بەکار هاتووە. لە ڤەری ساردیش دا ـ بۆ تاوانبار دۆزینەوە ـ کەڵك لە شیرەی گیاو ژەهر وەرگیراوە. وشەی «باوەڕ» بەم مانایەیە کە ئەو کەسە راست دەکاو ئامادەیە ڤەری لەسەر تاقی بکرێتەوە؛ هەروەك گوتبێتی بە ڤەر راست دەکەم! [٢٨]
جـ باوەڕ ـ لەسەر کێشی خاوەر: بەمانای چوونە دڵی قسەیە.. خۆگری.. راستی [٢٩].

لاری لەوەدا نییە کە وشەی [ڤاڤەر = باوەڕ] لەرووی فۆرمەوە گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتوە بەسەرنجدانی ئاخاوتنە ناوچەییەکانی کوردیی ئێستامان ئاڵوگۆڕی نێوان دەنگەکانی /ڤ، ف، ب، و/ هێجگار ئاساییو لەبەرچاوە. هەرچەندە زاراوەی [باوەڕ] لەحاڵی حازردا بووەتە ناوکۆیی دووزمان، بەڵام بە هەڵ کشانەوە بۆ شێوە پەهلەوییو ئاوێستاییەکە وسوورێك بە مێژووی مادەکان دا دەی سەلمێنێ کە ئەو زاراوەیە لە بنج دا سەر بە نەژادی کوردییە. زاراوەی
(فەڕو بەدفەڕ) وشیوەی بەکارهێنانیان و کارکردنیان لەباری دەروونیدا، هەر هەمان پاشماوەی ئاوێستاییە. زۆر لە دەمی شارەزووریەکان شیرینە کە بە گەش بینییەکەوە دەڵێن:
«نوورت لێ بوارێ! فەڕت بۆ هاوردین.»

لەزمانی کوردیدا وشەی «بڕوا» شان بەشانی «باوەڕ» لەکاردایە. پتر بەرەو ئەوە دڵنیامان دەکا کە بێژەی ـ بڕوا ـ هەڵ گەڕاوەی ـ باوەڕ ـ بێ لەگەڵ ئەوەش دا، هەمیشە لە تەکیدا هاوتەریب نییە، واتە لەبڕێ دەربڕین دا وشەی [بڕوا] دەگونجێ و وشەی [باوەڕ] باشارناکا! بەر لەوەی کە تاوتو بە چەند دەق و نموونەیەك بکەم بۆی هەڵ دەکشێمەوە:
١ـ بڕوا = باوەڕ/ موکری (بۆقامووسی زەبیحی)
٢ـ بڕوا ـ کرمانجییەو بەمانا باوەڕە

۳- بڕوایی، بڕوانی: یاری، هاوڕدن.. دڵی بڕوایی نادا. دڵی یاری ناکا.. دڵی نای گرێ..
بەعەرەبی (میل. رغبة. فتواء القلب/ ف. مەردۆخ.
٤- مامۆستا خاڵیش لە هەمان دەربازگەوە:-

بڕوایی: دڵ کرانەوە بەبینینی شتێك.. دڵم بڕوایی نادا بچم بۆ لای فیسارەکەس. بەکارهێنانیان:
- ئیمان: ئەمەتە [باوەڕ] و یەقینت ببێت بەشەش ئەسڵان / باوەڕ کردن بە ڕەسوولان..
- بیرو باوەڕی پاکە /کەمتر دەگوترێ: بیرو بڕوای پاکە!
- باوەڕی بە خۆیە، بڕوای بە خۆیە.
- باوەڕ ناکەم، بڕوا ناکەم: قەناعەت ناکەم
- باوەڕ پێکراو: متمانە پێکراو / کەمتر دەگوترێ بڕواپێ کراو.
- دڵم بڕوانادا بیبینم / ناگوترێ: دڵم باوەڕ نادا بیبینم!
- بۆ هەمان مەبەستی کرانەوە، ناشگوترێ دڵم باوەڕ ناکا بێبینم!

هەرچۆنێك بێ کەمە جیاوازییەکیان هەیەو بێژەی «باوەڕ» لەگەڵ کاری[بوون، کردن] دا گەردان دەکا. کەچی «بڕوا» لەگەڵ وێرای ئەو دوو کارەش لەتەك کاری [دان] دا گەردان دەکا.

بەش بەخۆم لە بنجی «بڕوادان» بەگومانم؛ کوردیشەو دەڵێ: (دڵم بڕوای نەدا)؟!

بەدووری نازانم کە ئەو دەقە لەگەڵ دەربڕینی (دڵم بەرایی نەدا) دا، تێك ئاڵابێ و گۆڕانی بەسەردا هاتبێ. لەخۆیدا «بەرایی» سەرهەڵ دان و سەرەتای بەربوون و کرانەوەی هەر شتێکە.. وەك: بەرایی لەشکرەکە دەرکەوت.. بەرایی ئاوەکە هات..!

هەرچۆنێك بێ لەبەر ئەو کەمە جیاوازی‌یە ناتوانین دەست بەرداری هیچیان ببین.. لەگەڵ ئەوەش دا [بڕوا] بۆ ئێستای زمانەکەمان خۆی دابڕیوە[۳۱].. بەڵام باوەڕ، بنکەیەو بەڵگە مێژووەکەشی لەبەرچاوە. بەسەلیقەی وردەوە، نووسەر دەتوانێ جێگەیان بۆ دابین بکا: لەشوێنی ئیمان و عەقیدەدا [باوەڕ] بنووسین و لەشوێنی پشت پێبەستن و مەیل و دڵ کرانەوەدا [بڕوا] بەکاربهێنین. مانەوەشیان بەو لەقی‌یە وەك لە نووسینی کۆن و نوێدا دەکەوێتە بەرچاو کارێکی پەسند نی‌یە.. لێ قەدەغەکردنیش کارێکی زەحمەت و ناهەموارە:

«هەرکەسێ هات و وتی من عاشقم بڕوا مەکە
تا لەسەر گۆنای عەزیزم، زەخمی مارانگاز نەکا»

با ئەم تاکە شیعری -نالی- ش دیاری بێ بۆ گیانی پاکی‌خانی:

«بە نالی باوەڕ ت نابێ خەیالت بێت و ببینێ
کە چۆن مەشغوولی نەغمەی گۆشەیی نالینە بازا»

۹-( مصر و بلد) باژارن ئەو (درهم) دراڤ ئەرمووش (حریر) (مانح) سەخی (سائل) (جوکارو (شفاعة) مەهدەرە، ل ٤٤

۱- بازار و باژار:

زاراوەی باژار دەقی بازارەو مشتومڕی نەگەرەکە لە رووی فەرهەنگی‌یەوە، دەگەڕێتەوە بۆ بنکەی [ڤاچار] ی پەهلەوی‌و هیچ تایبەت نی‌یە بە فارسی‌یەوە و لە حاڵی حازردا بووەتە وشەیەکی ناوکۆیی زمانە هیندیە ئەوروپاییەکان. بەپێی سەرچاوە فەرهەنگی‌یەکان، ئەو زاراوەیە بەم ڕەنگەی خوارەوە گۆڕانی بەسەردا هاتوە[۳۲]:

- ڤاچار - ی پەهلەوی، لە پارسی کۆن دا بووەتە
- ئەباجاری - کە پێك هاتوە لە [ئەبا] لەسان سکریتی‌دا [سەبهە] بەمانای شوێنی کۆبوونەوەیە. کەرتی دووەمیشی، چاوگی (جەری)[۳۳] یە و بەمانای لەوەڕانە.

لە کوردیی ئێستامان دا چاوگی [چەرین] بەمانای لەوەڕ لە ئاخاوتنی بادینیداو [چایەر] لە ئاخاوتنی سلێمانیداو (جاڕ) بەمانای پەرێزو شوێن، لەبەر چاون. دەمێنێتەوە ئەم پرسیارە - پەیوەندیی دووکان و بازاڕو بازرگان بە لەوەڕەجارەوە چی‌یە؟!

بەر لەوەی وڵام بدەمەوە بە وشەی (کلاس و کلاسیك) نووسەرانی بەڕێز ئاگادار دەکەمەوە کە بۆ ئەم چەمکە ئەدەبی‌یە پانوپۆرەی ئێستا لە پۆلە بەلەم و کەشتی‌یەوە پەرەیان سەندووە! لەهیچ زمانێکدا ئەوە سەری نەگرتوە کە زاراوەی حاڵی حازر بەرابەری واتای فەرهەنگی هەزاران ساڵ لەمەوبەر بێ. بۆ ئەم پەرەسەندنە تەنیا بۆرە پەیوەندییەك بەخوازە بێ یان نە، بەسە و لە سەری پێك هاتون. بابگەڕێینەوە بۆ پێنج شەش هەزار ساڵ کە ئەم بازاڕو فابریقەو وردەواڵەیە لە مەیدانی کۆبوونەوەکان دا نەبووە. ئاڵشت و مامەڵە بە گۆڕینەوەی کەلوپەل بوود کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (مقایضە). دانەوێڵەو خواردەمەنی گۆڕینەوە - بەر لە داهێنانی دراو - کارێکی بەگوڕی نێو مەیدانە تایبەتی‌یەکان بووە جا لە نێوان چەند گوندێك دا بووبێ یان لە گەورە شارەکان دا بووبێ [بازار]ی ئێستاش بەشێوەی تازەو بە کەرسەی داهێنراو، هەر هەمان دەور دەبینێ.

گۆرانی دەقی ـ بازار ـ لە بۆتانیدا بە [24] باژارو لە سۆرانیدا بە ـ باژێر ـ خۆکردنێکەو دیاردەیەکی ئاشکرایە. وەك [رژتن، رشتن.. کارد کێرد] هەرچەندە سەبارەت بەباری جوغرافیو ئاووهەواو گەمارۆی چوارلانە، شێوەو دەستە شێوەکانی تاکە زمانەکەمان زۆر لێك دابراون و بڕێکیان وەك زمانێکی زۆر جیاواز دەزگای دەنگسازیی خۆی ئەوەندە بە تەوژم خستوەتەکار زوربەی وشەی بنەرەتییەکان تووشی دەنگ گۆرکێو هەڵگەرانەوە بوون. پتر لەوەش زۆر وشەی بەشەك و گشت جێگەیان بە یەکدی هەق کردوەو کارێکی ژێر بێژیانە نییە، بەنموونە:

بازار ـ بەشێکە لە دیمەنە پێك هێنەکانی شارو ناتوانین ئەم رستە خەبەرییەی بۆبخەینە کارو بڵێین:

ـ شار، بازارە یان بازار، شارە. خۆ ئەگەر ناوچەیەکمان خۆی بەوە راهێنا بێ کە بە هەردووکیان بڵێ «پاژار» لەکاتێکدا کە خودی زمانە کە بۆ هەردوو چەمکەکە وشەی تۆکم و لەباری سازاندبێ، کارێکی ناهەموارە دەستووری لەسەر دابنرێو لە نووسین دا پەیرەو بکرێ. دیسان کە زاراوەی «بازار» بەو مێژووە دێرینەیەوە بەهەمان ئاواز بووبێتە زاراوەیەکی نیمچە جیهانی، پێویست ناکا لە دەنگ گورکەیەکی بەرتەسکی ناوچەییدا بێ چرووسنێین. با سەرفرازانە لە ناوی شارباژێر» وردببینەوە: کە ئێستا ناوە بۆ ناوچەیەك و دەشێ گوندێك یان نێوەندێك بەو ناوەوە هەبووبێ. پێك هاتوە لە [شار + باژێر] بە عەرەبی دەبێتە «مدینە السوق» [35] ئەم پێك هاتنە دەی سەلمێنی کەشارو بازار یەك نین

١٦ـ زوربەی ئەو نموونانە لەم دوو فەرهەنگە راگوێز کراون:
ـ فەرهەنگی شێخ محمدی خاڵ ★ قامووسی زەبیحی / چاپی بەغدا.
١٧ـ لەلاپەرە ٤٠ـی نوبەهاردا، خوالێ خۆش بوو مامۆستا صادق بهادین نووسیویەتی:
سەرف ـ ب کرمانجیا بۆتان، دیاربەکرو مۆشێنە.
ـ بەفر ـ ب کرمانجیا هەکاریو بەهدینان و سۆران» تائێرە
مەبەستی مامۆستا لە سۆران، بێجگەی کرمانجیی سەرووە جێی تێبینیو ئلوردانەوەیە.

١٨ـ بادخەن: فەرتەنە عاصفة ـف. خاڵ.

١٩ـ اـ رانکە: جلەوی بەرداش هێنان و لێ خورین
بـ وڕەی لوکە = فرەی لوکە، فرەی لوکە :شی کردنەوەو رەهاکردنی.
٢٠ـ لە هەستی من دا کرکەورست کردنی وشەکانی زمان بە چەشنی تۆری کۆنەندامێکی کارەبان. لە کوێدا هێندەی موویەك تەلێك کورتی هێنا، تەزوو نامێنێ.. لە کوێدا ڕێدەیەکی نالەباری تێ کەوت شۆرت دەکاو، سوتمانێك بەرپا دەبێ!!

٢١ـ بۆ هەمان دەقی پێشوو «فە ـ نام ـ ستایش...»
خردە آوستا ـ ل ١٣

٢٢ـ ناوژە: وشەیەکی میدییە / ف. خاڵ. جـ ٣.
٢٣ـ پاشگری ـ ژە ـ دەشێ ـ چە ـ بێ، وەك لەم دەقانەدا بوەتە پاشگری ناوەڵناوی کاراو گچکە ناوکردن:
١ـ داتاچە: دادوەر / ئاوێستا.
٢ـ ئاوارچە: دەفتەری رۆژانە /ماد ـ ف. خاڵ.
٢٤ـ دیوانی نالی/ کوکردنەوەو لێدانەوەی مەلا عبدالکریم و فاتح مەلا عبدالکریم چ بغدا ٩٧٦.
٢٥ـ دیوانا پەرتویێ هەکاری / صادق بهادین ـ ١٩٧٨
٢٦ـ رۆژی کوردستان ـ تایبەت کردن لە زمانە ئەدەبییەکەمان دا ژمارە ـ ٦٦ ـ رەئووف ئالانی.

٢٧ـ بەپێی یاسای ژمارە ـ ١٨٣ ـ ی ساڵی ١٩٧٠ ـ / یەکەم ژمارەی گۆڤاری کوری زانیاری کورد ل «١٠».

٢٨ـ قامووسی زەبیحی بەرگی دوەم ل ٦٠ چـ ١٩٧٩ بغدا.
★ تێبینی: دیارە تاقی کردنەوەی ـ سوێند دان ـ لە ئایینە دێرینەکان دا زنجیرەیەکی نەپساوەیە و شێوە گۆرانێکی بەسەردا هاتوە؛ بەسەرنجدانی سوورەتی «البقرة» لە قورئانی پیرۆزدا، داستانێکی تەوراتمان دێتەوە بەرچاو:
«لە نێوانی چەند گوندێك دا کابرایەك دەکوژرێو مەردومگەلەکە داوا لە مووسا پێغەمبەر دەکەن کە بکوژەکەیان بۆ بدۆزێتەوە، ئەویش فەرمان دەدا لەسەر ئاوێك گوێرەیەك سەرببرن، ئەوجا ماڵەکان و جەماوەرەکە یەك یەك دەست دەخەنە نێو خوێنەکەیەوەو هاواردەکەن خوایە! ئەم خوێنە بەدەستی من نەرژاوە.. دیارە ئەو کەسەی لە خۆی رانەبینی بێ ئەو تاقی کردنەوەیە بکا، ئەوە بکوژەکە خۆیەتی.

٢٩ـ ا. برهان قاطع. بەگوێرەی زمانەکەی خۆیان تەنیا وشەی «باوەر»ی گرتۆتە خۆیو هیچ هێمایەکی نەداوە بە وشەی «بروا».
بـ مامۆستا خاڵ و مامۆستا مەردۆخیشی، لەسەرو فەرهەنگی خۆیان دا. بەهەمان شێوە مانای ـ باوەر ـ یان لێ داوەتەوەو باری فیلۆلۆژیی وشەکەیان روون نەکردوەتەوە.

٣٠ـ تیکستی عەقیدەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشەبەندی. / ساغ کردنەوەی ـ محمدی مەلاکریم ـ گۆڤاری کۆری زانیاریی عێراق، دەستەی کوردی. ژمارە «٨»، نیگا: ئەم عەقیدەیە نزیکەی [١٦٦] ساڵ پێش ئێستا دانراوە، یەکەم بەردی بناغەی پەخشانی کوردیە، بەشێوەی ئێستای سلێمانی.

٣١ـ کەسەرنجم دایە تەفسیری مامۆستا خاڵ بەسادەیی و لێکدراوی زاراوەی [بروا] ی پتر بەکار هێناوە:
١ـ آمنا بالله: بروامان هێناوە بە خوا.
٢ـ وماهم بمؤمنین کەچی ئەوانە بڕوادار نین / تەفسیری خاڵ، جزئی یەکەم ل ٥٢ چـ ١٩٦٩ بەغدا.

٣٢ـ تەماشای قامووسی زەنیحیو د. معین و برهان بکە.
٣٣ـ قالبە چاوگی (جەری) لەو دووزمانەدا ناکەونەبەرچاو بەڵام وەك دیاردەیەکی دێرینە نزیك دەبێتەوە لە چاوگی هەو رامی، وەك [کوشتەی، لوەی، وتەی... هتد/
٣٤ـ لەسەرووی خۆرهەڵاتی قەڵادزێوە، کوێستانێك هەیەو بە ئاوەرۆی سوێسنایەتیدا شۆردەبێتەوە. چایەرو هاوینە هەواری پشدەریەکان بوو. پێی دەڵێن «باژار» ئەوەندە کوێستانە شارو گوندی تێدا نەبووە. تابڵێی ئاودارو فرەمێرگە. تەنانەت کە ئاژەڵێك قەڵەو بێ، ئەم ئیدیۆمەی بۆ بەکاردەهێنن: «دەڵێی لە کوێستانی باژار لەوەراوە.
بەلای منەوە ئەم ناوە دەمان باتەوە بۆ وشە دێرینەکە [ڤاچار] کە لە مۆڵگەی چەرینەوە سەری هەڵ داوەو سەربە هەوارگەی کوردەوارییە
٣٥ـ اسماء المدن و المواقع العراقية. ل ٢٣٢ ـ بغداد ١٩٧٦ تألیف المحامي / جمال بابان.

# ڕێنووسی کوردی و چەپکێ سەرنج و پیاچوونەوە

● ئەحمەد شێخ مەحمود ●

مرۆڤ هەر لە مێژەوە بۆ ڕاپەڕاندنی مەبەستە جۆراو جۆرەکانی خۆی بیری لە داهێنانی نووسین کردووەتەوە ئەم کارەیش بەگەورەترین و بایەخ دارترین چالاکی دادەنرێت لە ژیانی مرۆڤ و نەخشەی شارستانێتی دا.

ڕاستی‌یەکی بەڵگە نەویستە، کە نووسین دەورێکی باڵای بووە لە خزمەتی مرۆڤایەتی دا سەبارەت بە گواستنەوەو گەیاندنی بیرو هەست و زانیاری و مێژووی دوورو نزیك و چالاکی‌یەکانی مرۆڤ بۆ نەوەی داهاتوویان. نووسینیش بەچەندان قۆناخ و گۆڕاندا تێپەڕیوە تاگەیشتووەتە ئەم بارودۆخەی ئێستای. پێش هەموو شتێك نووسین بریتی‌یە لە گۆڕینی تاکەی دەنگەکانی زمان، بۆ هەردەنگەیش نیشانەیەکی تایبەتی دانراوە کە پێی دەوترێت (پیت)، جا هەر نەتەوەیەکیش نیشانەی تایبەتی بۆ تاکەی دەنگەکانی زمانەکەی داناوەو لە سەر ڕێبازێکی گونجاو ڕێنوسێکی بۆ زمانەکەی هێناوەتەدی، کە هەموو نووسەران و ڕووناکبیران پەیرەوی دەکەن و دەست بەرداری نابن.

بەڵام سەرنجێکی سەر پێی بەزمانەکەماندا هەر زوو بەو ڕاستی‌یە دەگەین کە ئەم مەبەستە بەڕوونی لە ڕێنووسی کوردی‌دا خۆی نانوێنی و هەر یەکەیش بە پێی بیرکردنەوەو بۆ چوونی خۆی لە جۆرە نوسینێك ئاڵاوە کە لەگەڵ کەسانی تردا جیاوازە، تەنانەت بەرهەمی نووسەرێك لەگەڵ نووسینێکی پشیوو تریدا جیاوازی‌یان هەیە، دیارە ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوانەی لە بواری زمان دا خەریکن نەیان توانیوە چارەسەرێکی بنەڕەتی بۆ سەرجەم گیروگرفتەکان بدۆزنەوە و لەم بارەیەوە بۆ چوونیان جیاوازە.

دەستەیەکی زمانەوانەکان باوەڕیان وایە کە ڕێنووسی عەرەبی‌و پیتەکانی بە جۆرێکی تەواو لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردی‌دا ناگونجێ‌و هەیشیانە ڕێنووسی (لاتینی) بە لە بارتر دەزانن بۆ زمانەکەمان.

بەڵام وەنەبێ ئەم دوو جۆرە ڕێنووسە هیچ کامێکیان بێ کەلە بەرو ناتە واوی بن و هیچ جۆرێکیان ژمارەی پیتەکانی لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردی‌دا یەك نین، بەڵکو هەندێ (پیت) یان پێویستی بەزیاد کردنی نیشانەیەك هەیە بەتایبەتی ئەو دەنگانەی کە لە یەکەوە نزیکن وەك: پیتی عەربی (ر) لەگەڵ (ڕ) داو بە لاتینی (R) و (R̈) وەیان (ل)ی سووك و (ڵ)ی قورس، بەلاتینی (L) و (L̄) یان (ج) و (چ) بەلاتینی (C) و (Ç) وەیان (ز) و (ژ) بە لاتینی (z) و (Ẕ) ...ناد..

لە هەردوولادا پێویستی یان بەنیشانەیەك هەیە بۆ جیاکردنەوەیان، جا ئەوەی کە لێرەدا مەبەستە بریتی‌یە لەوەی کە ئێستا لە عیراق دا ڕێنووسی عەرەبی چەسپاوەو پەیرەوی دەکرێن، ئاشکرایشە، کە ڕێنووسی هیچ نەتەوەیەك وەکوو خۆی نەماوەتەوەو بەردەوام لەگەڵ ڕەوتی گەشەسەندنی زمان و نەتەوەکەدا ڕێنووسەکەیش هەنگاوی خێرای ناوەو بەرەو گۆڕان ڕۆیشتووە.

ئیمڕۆ هەموو چاپەمەنی‌و نووسینەکانمان بەڕێنووسی پیتی عەرەبی‌یەو ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم ڕێنووسە گیروگرفتەکانی چارەسەر نەکرێت، بەڵکو پێویستە کە هەوڵی چالاکانە بدرێت بۆ چارەسەرکردن و بەدی هێنانی ڕێنووسێکی یەکگرتوو کە هەموو کورد بەوشێوەیە بنووسنو دووربێ لە جیاوازی، چونکە نووسین یاسایەکی داهێنانەو دەستکردی مرۆڤە لە بەرئەوە مرۆڤ دەتوانێ کە ناتەواوی‌یەکانی چارەسەربکات.

گەر بە سەرپێی چاوێك بخشێنین بە زمانی ئینگلیزی دا، ئەو زمانەی کە سەدان ساڵە زانایان و شاعیران و ڕووناکبیرانی ئینگلیز دەستیان بە داوێنی‌یەوە گرتووە خزمەتی دەکەن کەچی گەلێ بابەتی سەرنج ڕاکیش دێتە بەر چاو، لەگەڵ ئەوەشدا نەبوونەتە کۆسپ لەگەڵ ڕێنووسی زمانەکەیاندا، ئەوەتا فۆنیمی (ch) لەوشەی (mechanic) و (machine) و (watch) دا

هەریەکەیان دەنگیکی جیاوازیان هەیە، لە یەکەمدا دەنگی (k) واتــا (ك) و لە دووەمــدا دەنگی (ʃ) واتا (ش) و لە سێیەم دا دەنگی (ts) واتــا (چ) دەردەردەکــەوێت هەروەهــا پیتی (g) لەوشــەی (bag) و (orange) دا دوودەنگی جیــاوازیــان هەیە تەنــانــەت پیتەکانی (gh) لەوشەی (enough) دا لە بەرانبەری فۆنیمی (F) دا بەکار دێت کە لە کاتێکدا پیتی تایبەتی (F) هەیە، ئەمە بێجگە لەو پیتانەی کە دەنووسرێن و ناخوێندرێتەوە وەکــو(write , autumn , knife) یان دەنگی (θ) (ث) لەگــەڵ دەنگی (ð) (ذ) هەردووکیان لە پیتەکانی (th) دا دەرئەکەون وەك : thin , that

ج- لێرەدا نامەوێ باسەکەم بە نموونەی زمانەکانیتر هەناسە سوار بکەم ئەگینا چەندان نموونەیتر لە بەردەستدان نەك هەر لە زمانی ئینگلیزی دا بەڵکو لە رێنووسی زمانەکانی تردا وەك فەرەنسیو ئەڵمانی، کە لە زمانە زیندووەکانی جیهانن، لێرەدا ئەم چەنــد نموونەیەم بەو مەبەستە خستە بەرچاو کە ئەم هەموو گیروگرفتانە لە زمان و رێنووسی زمانەکانی تردا هەن و کەچی نەیــان توانیــوە کەلێن لە زمــانــەکــەیــان دا دروست بکەن و بەپێچەوانەوە خاوەنی زمان و رینووسێکی چەسپاون و لەسەر دەستووری زمانێکی ئەدەبی یەکگرتوو بەرێوە دەچن وکەسیش بۆی نییــە لە رێبــازی سەرەکی لابــدات کەچی لە زمــانی کوردیدا کە چاومان بە (وێ) دەکەوێت لە شێوەی (برگە) یان (بزوێن) دا بەکارێکی دژوار دێتە بەر چاومان و هەوڵ دەدەین بۆ جیاکردنەوەیان لە یەکتر، یان فۆنیمی (نگ) لە وشەی (هەنگ) دا کوت وپــر دەڵێین چۆن دوو پیت بۆ فۆنیمێ دا دەنرێت لە کاتێکدا کە ئەمانە گیروگرفتی سەرەکی نین و بەتەنیا بەبالای زمانەکەماندا نەبراوە.

بێگــومــان هەنــدێ کەلێن هەیــە لە رێنــووسی کوردی دا کە پێویستیان بە چارەسەر کردن هەیە کەماوەیەکی دوورو درێژە وەك خۆیان ماونەتەوەو کە (دەستەی کورد) لە کۆری زانیاری عیراق دا ئەرکی سەرشانێتیو بەرپرسیارە لێی،

لە ماوەی دامەزراندنییەوە تاکو ئێستا چارەسەرێکی ئەوتۆیان بۆ نەدۆزیوەتەوە تەنها چەند تەقەللایەك نەبێت کە ئەویش بەبێ ئاوردانــەوە لێی ماوەتــەوەو لێرەیشدا ئەمەوێ پەنجە بۆ دوو چالاکی (دەستەی کورد) لە کۆری زانیاریدا : راکێشم.

١ ـ دوای دامەزراندنی کۆری زانیاری لە سەرەتای ساڵانی حەفتابە دواوە لە ساڵی ١٩٧٦دا ویستیان گیرو گرفتی رێنووسی (وو) وە (یی) چارەسەر بکەن و هاتن کەشیدەیان لە سەرداانان و بەمــەیش ویــســتــیــان کە نووســیــنــی کوردی لە (وو) وە (یی) دەربازبکەن و بەم شێوەیە بنووسرێ (ۆ) (ێ) بەلام ئەمەیشیان تاماوەیەك بوو تەنانەت لەدواییدا خۆیشیان لێی پاشگەزبوونەوە .

٢ـ لە ساڵی ١٩٨٧ دا لە ژێر ناوی (رێنووسی کوردی بە پێی بریــارەکانی کۆری زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد) هەندێ بابەتیان بلاوکردەوە کە ئەم کتێبە پێویستی بە روون کردنەوەو شیکردنەوەی زیاتر هەیە .

١ـ لەبــارەی گیروگــرفتی وێنەی دەنگەکانەوە : نووسەرەکەی کارامــانــە دەست نیشــانی وێنــەی دەنگەکانی کردووە بەلام لەباسی (کلۆر کردنی) (د) و (ت) دا دەبوایە باسی کلۆر کردنی (ب) ی فرمــانی داخوازی بکردایە لەکاتی ناسادەیی وشەدا وەکوو :

| فرمانی داخوازی | فرمانی داخوازی لەکاتی کلۆر کردنی(ب)دا |
|---|---|
| تێبکۆشە | تێکۆشە |
| هەڵ بووەشێنە | هەڵوەشێنە |
| تێبگرە | تێ گرە |
| هەڵبستە | هەڵسە |
| نیشان بدە | نیشان دە |
| رابوەستە | راوەستە |
| دابخە | داخە |
| رابخە | راخە |
| لەپێ بکە | لەپێ کە |
| لەبەربکە | لەبەرکە |
| هەڵ بفلیقێنە | هەڵ فلیقێنە |
| دابروخێنە | داروخێنە |

تەماشای ئەم دێرە شیعرەیش بکەن هەروا هاتووە.

هەڵســەتــێــکــۆشــە تاخــوێــنــت گەرمــە
سەرپــۆش فرێــدە، چ وادەی شەرمــە

٢ـ لەبارەی بەکارهێنانی وشەی (ئەم) و (ئەف) لەگەڵ دیاردی بۆکراودا (ل ٢٠) دەڵێت :

ئەگــەر وشەی (رۆ ـ رۆژ) و (شەو) و (ساڵ) بە دوای زەرفی زەمانێ کارێکیان تێدا رووی دابێ ، یاکرابێ ، بەکارهاتن ئەوە

لەگەڵ (ئەم ، ئەف) ە کەیان پێکەوە دەلکێنین وەك (ئەمشەو باران باری) وەلەهەمان لاپەرەدا دەڵێت:
(ئەگەر هاتوو وشەی (شەو) (رۆژ) و (ساڵ) مان بەمەبەستی ئەوە بەکارهێنا رووداوێ، کارێکی تێدا کرابێ ئەوە لێکیان جیادەکەینەوە وەك (ئەم ساڵە نەهاتە)
٣ـ لە (ل ٢٢) داو لە بارەی وشەی ناسادەوە دوای ئەوەی باسی وشەی ناسادە دەکات و چۆنێتی پێکهاتنی روون دەکاتەوە ، باسەکەی ئەوە دەگەیەنێت (ئەگەر وشەیەکی ناسادە بۆ زاراوە یا ناوی ناسراو یا جێی ناسراو تیرەو هۆزی ناسراو بوو، ئەوە وشە ناسادەکە مەودای بەیەکەوە لکاندنیان هەبوو بەیەکیانەوە دەلکێنین وەکوو (دڵشاد) بەڵام ئەگەر وەسفی کەسێ یاشتێ یا ناوی واتاییێك بوو ئەوا ئەو وشە سادانەی کەوشەی نا سادەکەیان لێدێتە گۆرێ لە تەنیشت یەکتردا دەنووسین واتە ئەگەر مەودای لکاندن هەبوو بەیەکیانەوە نالکێنین وەك رەش باو...تاد:ـ
٤ـ لەبارەی گیروگرفتی تێك بەستنی راناوی لکاو (ل ٣٢) دا (باسی گیروگرفتی راناوەکان دەکات لەگەڵ فرمان) داو چۆنێتی پێوەبەستنیان دەڵێت :
(ئەو راناوە لکاوانەی کە لەتەك (فرمان) دا تێك دەبەسترێن لەم شوێنانەی فرمانەکەدا بەدی دەکرێن :
ـ لەدوای (قەد)ی فرمانەوە .
ـ لەدوای (رەگ)ی فرمانەوە .
ـ لە دوای (نیشانە)ی رێژەوە .
ـ لە دوای (پێشگر) ەوە .
**دوای ئەوەی بە درێژی باسی هەریەکە لەمانە دەکات و وردیان دەکاتەوە ، لە (ل ٣٦) دا باسی گیروگرفتی تێك ـ بەستنی راناوە لکاوەکان دەکات لەگەڵ ئامرازی نەفیو نەهی داو لەدوای ئەمانەوە لە (ل ٣٨) دا بەدرێژی باسی گیروگرفتی ئامرازی (ش) لەتەك (فرمان) دا دەکات و بە درێژی لەسەری نووسیون .**
**ئینجا لە دواتردا چەند یاسایەکی رێزمانی هێناوەتەوە بۆ چارەسەرکردنی لکاندنی راناوە لکاوەکان .**
**لێرەدا دەمەوێ بپرسم کە ئایا رێنووس پەیوەندی بە رێزمانەوە چی یە؟ ولە چ زمانێکدا رێنووس لە بە تیشك و رۆشنایی رێزماندا دەردەکەوێت ، بەگوێرەی ئەم وتانەی سەرەوەبێت کەلەکتێبی ناوبراودا بەرچاو دەکەوێت دەبێت نووسەر وچانێك بدات لەکاتی نووسین دا بۆ ئەوەی بیر لەوەبکاتەوە ئایا ئەم وشەیە زاراوەیەیان ناوە ئاوەڵناو یان چ جۆرە فرمانێکە بۆ ئەوەی بتوانێ وشەکانی پێکەوە بلکێنێ یان جیایان بکاتەوە ، یان ئاگاداری**

شێوەی لکاندنی راناوە لکاوەکان بێت بە گوێرەی جۆری فرمانەکان .
جا گەر بەم شێوەیەبێت ئەبێ منداڵ لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا وەیان لە مەڵبەندەکانی قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری‌دا لە پێش ئەوەی فێری نووسینیان بکەین دەبێت فێری رێزمانیان بکەین .
لێرەیشدا پرسیارێك روومان دەگرێتەوە ئەویش ئەوەیە کە ئایا هەموو نووسەرێك ، کە لەلاپەرەی رۆژنامەو گۆڤارەکان دا دەنووسێ ئاگایان لە وجۆرە بابەتە رێزمانی‌یانە هەیە کە لەکتێبەکەدا هاتووە (ئەری ـ نەرێ فرمانی تێپەرو تێنەپەر ـ فرمانی رابوردووی ئیستمراری فرمانی رابوردوو لەگەڵ رانەبوردووی ئینشائی) ئەمانەو هەندێك زاراوەی رێزمانەکە..
گرنگ لەوەدا چی‌یە کەوشەی ناسادە بەیەکەوە بلکێن ئەگەر مەودای لکاندن هەبوو وەیان بەجیا بنووسرێن ، ئایا هیچ لە واتا رێزمانی یاگۆرانی ووشە لە رستەدا وەیان بە کارهێنانی سینتاکسی‌یەوە دروست دەکات .
ئایا رێزمان (ناو ـ ئاوەڵناو ـ لکاندنی‌راناو) لەیەك جیادەکاتەوە یا شێوەی نووسین ؟
دەمەوێ ئەوەبخەمە پێش چاوی خوێنەری بەرێز کە چەند (فونیم) ێك وشە دروست دەکات ، وەچەند وشەیەك لەگەڵ ئامرازەکان دا رستەیەك پێك دێنێ ، وەرستەیش کە گەورەترین و ئاڵۆزترین دانەی زمانە .
ئینجا بەگوێرەی خۆی بەشەکانی ئاخاوتن و رێزمان دێنە کایەوەو جیادەکرێنەوەو دەوترێت ئەوە (ناوە ـ ئاوەڵناوە ـ ئاوە لفرمانە...)و ئەرکەکانیان لە رستەدا روون دەکرێتەوە.
ئەگەر ئێمە نووسینی (بزماری) لە عیراق و نووسینی (هیروگلیفی) لە میسر بە سەرەتای نووسین دابنێین ئەمە بێجگە لە نووسینی ئیدو گرای (وێنەیی) Idogramy مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ ٣٠٠٠ ساڵ پێش زایین بەڵام رێزمان کە

هانووه‌ته کایه‌وه بۆ یه‌که‌م جار له ژێر ده‌ستی یۆنانی‌یه‌کاندا له (ئه‌سکه‌نده‌ریه) له سه‌ده‌ی دووه‌می پێش زایین په‌یدابووه که ماوه‌ی نێـوانیـان ۲۹۰۰ ساڵه که ئه‌ویش نه‌خشـه‌یـه‌ك بوو به‌شـه‌کـانی ئاخـاوتنی تێدا جیـا کردبـووه‌و پاش ئه‌مانیش رۆمـانی‌یـه‌کـان به‌ده‌ستکـاری‌یـه‌وه له‌گـه‌ڵ زمانی لاتینی دا گونجـانیـان و به‌ئـه‌وروپادا بڵاوبووه‌وه‌و شێوه‌یه‌کی ساکاری وه‌رگرت هه‌تا ساڵانی ناوه‌راستی سه‌ده‌ی هه‌ژده‌یه‌م، به‌ره‌به‌ره به‌ره‌و فراوانی هات و هه‌تـا ئه‌م شێـوه‌یـه‌ی ئێستای وه‌رگرت ئه‌مه‌یش به‌ڵگه‌یه‌کی تری گه‌وره‌یه که‌رێزمان په‌یوه‌ندی به‌رێنووسه‌وه‌نی‌یه.

له (ل ۳۹)دا باسی گیروگـرفتی (و)ی عه‌تف ده‌کات و ده‌ڵێت: (واوی عه‌تف له نێوان دوو وشه یان دوو ده‌سته‌واژه‌یان دوو رسته‌دا دێن بۆبه‌یه‌که‌وه به‌ستنیان ئینجا.

ـ ئه‌گـه‌ر له نێـوان دوو وشـه دا هات واوه‌کـه له ته‌ك وشه‌ی پێشوودا ده‌نووسرێت به‌ڵام پێوه‌ی نالکێت وه‌ك من و تۆ ـ ئێمه‌و ئێوه

منیش لێره‌دا ئه‌ڵێم که واوی عه‌تف بابه‌تێکه له رێزمانی عه‌ره‌بی دا به‌کار ده‌هێنرێت بۆ مه‌به‌ستی ئاسان کردن و کورت کردنه‌وه، به‌ڵام له زمـانی کوردی دا، ئه‌و واوی عه‌تفه‌ی له عه‌ره‌بی دا به‌کـار دێت ده‌بێت به (ئـامـرازی په‌یـوه‌ندی) وه‌کوو هه‌موو ئامـرازێکی که، ئه‌گه‌ر که‌وته نێوان دوو وشه یان دوو ده‌سته

واژه، ئه‌وه ده‌بێت به ئامرازی په‌یوه‌ندی وه ئه‌گه‌ر که‌وته نێوان دوو رستـه‌وه ئه‌وه جێگـای ئامـرازی لێکده‌ر ده‌گرێته‌وه ئیتر پێویست ناکات ناوی واوی عه‌تفی لی بنرێ.

به‌ڵام ئه‌گـه‌ر ئه‌و (واو)ه که‌وتـه نێـوان دوو وشـه‌ی ساده‌وه‌و وشه‌یه‌کی لێکدراوی پێك هێنائه‌وه نابێته ئامرازی عه‌تف به‌ڵکو پێی ده‌وتـرێت (نـاوبـه‌ند) که هاریکاری ده‌کات له دروست کردنی لێکدانی وشه‌داو ئه‌م جۆره مۆرفیمانه پێیان ده‌وترێت مۆرفیمی په‌یوه‌ندی له لێکدانی وشه‌داو ئه‌مه‌یش ته‌نیا بریتی نی‌یه له (واو) به‌ڵکو چه‌ند ناو به‌ندێکی‌تر هه‌ن بۆ لێکدانی وشه وه‌ك:

**ه = به‌رده نوێژ**　　**ا و = ره‌نگاو ره‌نگ**

**و = له‌رزو تا**　　**ان = به‌رانبه‌ر**

**ه و = شاره‌و شار**　　**به = گوڵبه‌ده‌م**

لێره‌دا ئه‌توانم بڵێم ئه‌وه‌ی که‌لێن بوو له کتێبی ناو براودا به پێی توانا خستمانه روو، به‌ڵام ئه‌وه‌ی ده‌بێ بوترێ که ئه‌م کتێبه‌ی کۆر له ساڵی ۱۹۸۷دا ده‌رچووه‌و هه‌تا ئێستا چ نووسه‌رێك یا ده‌ستگایه‌کی رۆشنبیری په‌یره‌وی کردووه؟ ئایا ئه‌مه‌ش هه‌ر به چه‌شنی نووسراوه‌کـه‌ی‌تـر (رێنـووسی کوردی) ساڵی ۱۹۷٦ نووسراوێکی نووستووی بێ په‌یره‌وی که‌ر ده‌بێت؟ ئه‌ی که‌واته ئه‌م هه‌وڵ و ته‌قه‌للایانه بۆ! یۆکێ! له‌به‌رچی!...

له کۆتایی ئه‌م باسه‌دا حه‌ز ئه‌که‌م به پێی تواناو بۆ چوونی خۆم هه‌ندێ خاڵ ده‌ستنیشان بکه‌م به مه‌به‌ستی چاره‌سه‌ر کردنی ئه‌م ئاڵۆزی‌یه.

۱ ـ ئه‌م ئه‌رکه به ته‌نیا به‌ند نی‌یه له سه‌ر کۆری زانیاری چونکه گه‌لێ که‌س هه‌ن له کۆر دوورن و بریاره‌کانی کۆر ناسه‌لمێنن و خۆیان به‌بسپۆری زمان ده‌زانن و بیرو رای تایبه‌تی‌یان هه‌یه و ته‌نانه‌ت هه‌ندێکیان له‌و باوه‌ره‌ن که (ئه‌وه‌ی له زار دێته ده‌ره‌وه بنووسرێت) که ئه‌مه به پێچه‌وانه‌ی بریاره‌کانی (کۆر)ه وه‌یه له کلۆر کردنی هه‌ندێ پیت دا که پێویسته بنوسرێت وه‌کوو (ت ، د) کلۆر جا به‌م پێ‌یه واپێویست ده‌کات که ئه‌م کاره به‌ته‌نیا کاری ده‌سته‌ی کورد نه‌بێت و به‌ڵکو بریاری زوربه‌ی شاره‌زایان و زمانه‌وانه‌کان بێت.. نه‌ك به‌پێشنیازو بانگه‌واز به‌ڵکو به‌نووسین و به ئامـاده کردنی کۆنگـره‌یـه‌کی فراوان به‌و مه‌به‌سته‌ی که هه‌موو لایه‌ك به‌شداری تێدا بکه‌ن و بریاری کۆتایی بدرێ‌و له دواییدا ئه‌و بریارانه ببنه ده‌ستوورێکی بنه‌ره‌تی بۆ رێنووسی کوردی و هه‌مـوو چاپـه‌مـه‌نی و ده‌ستگـا رۆشنبیری‌یه‌کان و به‌رنامه‌و کتێبی قوتابخانه‌کان په‌یره‌وی بکه‌ن

۲ ـ باشتـر وایـه که رێزمان تێکه‌ڵ به رێنووس نه‌کرێ پێش ئه‌وه‌ی کۆتایی به‌م نووسینه بهێنم ده‌مه‌وێ ئه‌و راستی‌یه بخه‌مه به‌ر چاو که ئه‌م سه‌رنجانه‌ی له‌م نووسینه‌دا هاتووه ته‌نیا باری سه‌رنجی تایبـه‌تی خۆمـه‌و پێـویستـه له لایه‌ن شاره‌زایان و پسپۆرانه‌وه ئاوری لێ بدرێته‌وه‌و باری سه‌رنج و پیاچوونه‌وه‌ی تری به‌باڵا ببرێ و به‌مه‌یش خزمه‌تێکی بچووکی زمانه‌که‌مان ده‌که‌ین و شادومانیشم به‌هه‌موو ره‌خنه‌و سه‌رنجێکی خزمه‌ت گوزارانه.

# خواندنەك د «دیرۆكا چیرۆكا كوردی یا هۆنەری» دا و چەند تێدیتنەك




★ اسماعیل ابراهیم بادی ★

**بەرهەمێ دوماهیێ ژنڤیسینێت هێژا (شعبان مزبری)، [دیروكا چیروكا كوردی یا هونەری]یە. ئەڤ بەرهەمە ل سەر چیرۆكا فوئادێ تەمویە كو ئێكەمین چیرۆكا كوردی‌یە، هەروەسا دگەل دەقێ چیرۆكا (كندو)ی‌و چیرۆكا (كریم سعید زانستی). پشتی خواندنا وێ، من گەلەك بفەری زانی ڤان چەند تێدیتنا بەرچاڤ كەم.**

هێژاییـ.. لسەر سەروبەرێ روشنبیری‌یا كوردی ‌‌‌‌‌ خڤتی‌یە بێرە ژ رۆژ ناما (كوردستان) هەتا دهێتە سەر باسێ كوڤار (هەتاوی كورد). دبەرپەرێ (٤)ێ دا دبێژیت: «.... كومەلەك چێكر بناڤێ «هیڤی» شاسوارێ ئەڤێ مەیدانێ (خلیل موطكی) بو...». ب هزرامن ئەڤە ژكوڤارا (كاروان /٧) گوتارا سەیدا (عبدالكریم فندی) وەرگرتی‌یە بێی دەست نیشان كەت، چنكی؛ ناڤێ (خلیل موطكی) د چ ژێدەرادا نەهاتیە كو ئەڤێن لبەر دەست ژبلی گوتارا سەیدای[1]. لێ، پشتی ل دوڤ گەریاین خویا بو كو ناڤێ وی (خەلیل خەیالی موطەكی‌یە)[2].

دبەرپەرێ ل دوڤ دا ناڤێ (خەلیل خەیالی) هاتیە دگەل چەند ناڤەكێت دی كو خەم خورێت كومەلا هیڤی بون و پاشی

خویا دکەت کومەلا هیڤی ژ کارێت خو راوەستیایە ژبەر بشکداریا وان دجەنگا ئێکێ یا جیهانیدا ـ ئەز دشێم بێژم ئەڤ بەرپەرە ئانکو ئەڤ بابەتە ژگوتارا سەیدا (عبدالكريم فندى) هاتیە وەرگرتن و بێ ی ئاشکرا کرن، هەروەسا هندەك ژ ژێدەرەکێ دی[٣].

دبەرپەرێ (٦)ێدا ل ژێر ناڤێ (دیروکا چیروکا کوردی)، گەلەك و گەلەك ب کورتی ل سەر ئاخفتییەو دبێژیت: «هەروەسا یا هەژیێ گوتنێیە کو ئەڤێ کوڤارێ ئێکەمین چیروکا کوردی بەلاڤە کرییە، ئەو ژی چیروکا (شەڤیش) یا فۆاد تەموی..».

پاشی ل سەر کوڤارێ دبێژیت: «هەروەسا پیتەکرییە ب فولکلورێ کوردیو گوتنێت پێشییا دناڤ وان گوتارادا هاتیە بەلاڤەکرن.. ئەڤە و یا هەژیێ گوتنێیە دیسا ل هژمارا سێیێ دا چیروکەکا دی ژی یا کوردییا هاتییە بەلاڤکرن، بناڤێ (کندو) کندو کییە.. ئەڤە ناس ناڤەکە..».

دوان رێزکێت چوییدا سەیدا ب شانازیڤە دبێژیت [یا هەژییێ گوتنێیە] کو تو دبێژی ئەڤە جارا ئێکێیە ئو وی ئەڤ چیروکە دەست نیشان کری[٤]. دیسان ناڤەك بو چیروکا ئێکێ ـ دانایە و کریە (شەڤیش)، لێ چیروکا بێ ناڤە و ناڤێ پالەوانێ چیروکێ ژی (شویش)ە، نابت هو ب ساناهی ناڤی لێ دانین و بکەیفاخو بکەینە شەڤیش..!!.

ل سەر فولکلوری.. بابەت ل سەر دیروکا چیروکا کوردییەو حەق نەبو باسێ فولکلوری هاتبا کرن دوی بەرپەریدا، هەروەسا گوتنەك بتنێ نەنیشانا هندێیە کو فولکلورێ بکار ئینای، دڤێت جودا و ب درێژی ل سەر فولکلوری دروژی کورد دا هاتبا نڤیسین.

چیروکا دییا (کندو)ی کریە ناس ناڤ، نە مەرجە ناس ناڤ بیت؛ بریار هو نە ب ساناهینە بێنەدان بێ ی بەلگە و گروڤ، دبەرپەرێ (٧)ێدا دبێژیت: «یا هاتییە بەلاڤەکرن ل بن ناڤێ (چیروکا کرمانجان) ژناڤێ وێ یا دیارە کو ئەڤە چیروکەکا فولکلورییە، بەلێ وەختێ مروڤ ئەڤێ چیروکێ دخوینیت دێ هەست کەت کو نە چیروکەکا فولکلورییە بەلکو چیروکەکا ژمێژکێ کندو هاتییە نڤیسین ئو ڤیایە وەکو سەرهاتییەکێ لێ بکەت..» دکوڤارێ دا یا هاتییە بەلاڤ کرن لبن ناڤێ (چیروکی کرمانجا) نزا بوچی لنك سەیدا ی بو (چیروکا کرمانجان) خویا دکەت کو چیروکەکا فولکلورییە، لێ (کندو) نڤیسەڤانێ وێ ب رەنگەکێ گەلەك جوان نڤیسییە و وەك سەرهاتیەکێ بەلاڤ کریەو کو ژ زیرەکییا وی بویە.

دبەر پەرێ (٨) ێدا ناڤێ وان نڤیسەرێت لسەر چیروکا (فوئادێ تەممو)ی نڤیسین و بەلاڤکرین دبێژیت: «سەیدا (محمود زامدار) ئێکەمین کەس بوول سەر ئەڤێ چیروکێ نڤیسی ل روژنامـا (العراق)دا. بەلێ ئەوی چیروك ساخ نەکر پشتی هینگی [انـور محمد طاهر] ئەڤ چیروکە بەلاڤەکر ل روژناما هاوکاری دا...». راستە ل عیراقێ (محمود زامدار) ئێکەمین کەس بو، لێ دڤێت ژبیرنەکەین و بزانین کو د. جەلیلێ جەلیل بەری وی ئەڤ چیروکە یا خویا کری ل سالا ١٩٧٥ێ هەر وەك دبێژیت: «دهەر دو هەژمارێن یەکەم دە ، ب قەلەما فوئاد تەمو چیروکەك جوان و ب زمانەکێ رەوان هاتیيە بەلاڤکرن ئەوێ چیروکێ گەلەك بال کشاندییە و دبابەتێ خودە یەکەمین میناکێ نڤیساندنا نەشر بوویە کو دکوڤارێ دە هاتییە بەلاڤکرن...»[٥].

**دبێژین فوئادێ تەممو ئێکەمین چیروك نڤیسە، لێ ب تێ دیتنا سەیدا (عبدالرقيب يوسف) هوزانڤانێ ب ناڤ و دەنگ (فەقێی تەیران) ئێکەمین کەس بو چیروك نڤیسی.... «تـەیران یەکەم کەس بووە چیرۆکی کوردی نووسیبێ ەو ئەتوانین بە یەکەم چیرۆك نووسی کورد لەقەلەم بدەین..»[٦]. لێ نیازا وی ژێ چیروکێت ئاینیو نەتەوایەتی نە و ب شێوەیێ هەلبەستا ڤەهاندییە، نەکو چیروکا هونەری.**

هێژا (حەسەن جاف) دپەرتوکا خودا (چیرۆکی نوێی کوردی)دا ل سەر ڤان رایا دبێژیت: «وەها، بۆمان دەرکەوت چیرۆکی نوسراومان زۆرەو نووسەرانیش هەر یەکە سالێك یان چیرۆکێك دەکەنە سەرەتا. دوا رۆژیش تا زیاتر بتوانین لاپەرەکانی مێژووی نەتەوایەتی و ئەدەبیمان هەڵدەینەوە راستی زیاترمان دەست دەکەوێ و لەقوولایی بێ بنی دەریای مێژوومـاندا دەتوانین ئەوەندە مرواری دەر بهێنین کە ملی

راستی‌و گەردنی ئەدەبەکەمانی پێ برازێنینەوە..»(٧).

برڤرینە نڤیسینا کاک (شعبان)ی کو دناڤدا ماڤێ چەند نڤیسەرەکا بەرزەبویەو گەلەك خو ب وێ چیرۆکێڤە وەستاندی‌نە، دەڤێ وێ بەلاڤکریە ڤە مینا سەیدایێ هێژا (د. بدرخان سندی) دروژناما (العراق)دا گوتارەکا گەلەك جوان ل سەر چیرۆکێ نڤیسی بو ب زمانێ عەرەبی‌و چیرۆك دگەلدا بەلاڤکر بو ل ژێر ناڤێ [ قصة أول قصة كردية ]، هەروەسا سەیدا (رشید فندی) ژی ئەڤ چیرۆکە گوهارتی‌یە عەرەبی‌و هەر دروژناما (العراق)دا بەلاڤکریەو بەری د. بدرخانی. لێ مخابن نوکە ئەڤ هژمارێت روژناما (العراق) لنك من نەماینە، بەلێ یێ ژ هەمیا پتر خو ب ڤێ کوڤارێ ڤە وەستاندی و ب تایبەتی چیرۆکا (ڤوئادێ تەممو) گەلەك گوتار ل سەر نڤیسین و بەلاڤکرن و ماڤێ وی بەرزە بویە و نە هاتیە دەست نیشان کرن کو سەیدایێ (حجی جعفر)ە دکوڤارا (روشنبیری نوێ) هژمارا (١٠٢) گوتارەك بەلاڤکر ل سەر هەر سێ گوتارێت هاتینە بەلاڤکرن ژلایێ (انور محمد طاهر، رشیدی فندی‌و عبدالكريم فندی)(٨). دەڤێ چیرۆکێت وان هەڤبەر کرینە دگەل یا کوڤارا (روژی کورد) ئەو ژی پشتی کریە کورەکێ ناڤخویی خاندی ل ئێکەتی‌یا نڤیسەرێت کورد تایێ دهوکێ ل روژا ٢١/٧/١٩٨٣(٩)

پاشی چیرۆك تبنێ دکوڤارا (بەیان) دا هژمارا (٩٦) ب زاراڤێ کرمانجی‌یا خوارێ بەلاڤکر.(١٠)

دبەرپەرێ (٩)ێدا دبێژیت: «بەلێ نهۆ بو هەمی‌یا دیار بۆ کو چیرۆکا (لە خەوما) بۆ چارەمین چیرۆکا کوردی ئەو ژی پشتی کو هاتی‌یە دیار کرن کو «کندو» دوەمین چیرۆك نڤیسە.. ئو «کریم زانستی، سێیەمین چیرۆك نڤیسە پشتی کو هاتی‌یە دیتن کو ئەوی چیرۆکەکا بەلاڤکری ل بەرپەرێت روژناما (ژین) دا یاسالا (١٩٢٤)...». لڤێرە دێ بێژین: هەڤالێ هێژا هێدی‌و هۆسا بلەز چ بریارا نەدە ـ چنکی لەزکرن مروڤی دئێختە گەلەك نەخوشی و ئاستەنگا، دیسان گەلەك خەلەتی ژی خو دهاڤێنە مەیدانێ‌و مروڤی ئاگەهـ ژێ نینە.

لەورا دڤێت بێژم ئەم نەشێین بێژین چیرۆکا (لەخەوما) چارەمین چیرۆکە، یان چیرۆکا (کندو) یا دوێ‌یە، یان یا (کریم سعید زانستی) یا سیێ‌یە. ل سەر چیرۆکا دوێ چەند هزر و بیر توکە بێت پەیدا بوین هێشتا ب درستی نەهاتیە زانین.

چیرۆك نڤیسێ بەرکەفتی (حسين عارف) دپەرتوکا خودا (چیرۆکی هونەری کوردی)ی دا ل سەر دەست پێکرنا چیرۆکا هونەری ناڤێ چەند روژناما خویا دکەت بەری روژناما (ژیانەوە) دەرکەڤتی‌نە، دبێژیت: «بەڵام لە هیچ کامێکیاندا چیرۆکی هونەری (بابە مانا سەرەتایی‌یە کەشی‌بێ) بەدی ناکەین، تەنها هێندە نەبێ کە تاك و تەرا گفت و گۆیەکی سەرپێی نێوان دوو یا سێ کەسمان بەرچاو دەکەوێ کە بەنیازی ئامۆژگاری کرن و بۆ مەبەستێکی سیاسی‌ی روژانە نوسراوون .. وەك (محاوەرەیەکی ئیقتیسادی) لەژمارە دە ـ روژی ٤/ ئەیلوول / ١٩٢٢) ی بانگی کوردستاندا کە احمد حمدی نووسیویتی ..». پاشی دبێژیت.. «بێگومان ئەمانە ئەگەر وەك کارێکی ئەدەبی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، دەبێ بخرێتە خانەی شانۆگەری‌یەوە نەك چیرۆك»(١١).

هەروەسا (د. بدرخان سندی) ئەڤێ (محاوەرەیەکی ئیقتیسادی) دهژمێرێت چیرۆکا دوێ یا هونەری یا کوردی و ب درێژی ل سەر چیرۆکێ ئاخڤتی‌یە و دەڤێ وێ بەلاڤکری‌یە ب زمانێ عەرەبی.(١٢)

بێ‌ی کو ئاڤرێ‌یەکێ بدەمە نڤیسینا مامۆستا (حسين عارف)ی. ئەو نڤیسینا (احمد حمدی) پێدڤی‌یە پتر ل دوڤ بچن چنکی ب رایا (حسين عارف)ی دبیتە شانۆگەری.. لێ ل دوڤ چون و شروڤەکرنا هێژا (د. بدرخان سندی) چیرۆکەکا درستە و چ کێماسی تێدا نینن.

هەر دبەرپەرێ (٩)ێدا دبێژیت.. «ل ڤێرێ پێدڤی‌یە بێژم کو چیرۆکا (شەڤیش) یا بدویماهی هاتی .. هەر چەندە ئەوێ ل دویماهیکا پشکا دوێ نڤیسی‌یە دوماهی‌هەیە.. بەلێ ئەز دبێژم هندە». نزا چەوا ماف دایە خو وبێژیت (ئەز دبێژم هندە)، باشە وە دیارە ڤوئادێ تەممو یێ خەلەت بویە و نڤیسی‌یە (داوی هەیە)!! ئانکو هێشتا یامای، هەر چەندە نڤیسەری چەند بەلگە ژبو ئاخڤتنا خو ئینانە لێ نەجهێ باوەری‌یە چنکی دەمێ (روژی کورد) هاتیە گرتن ژبەر چەند ئەگەرەکان بویە و نەڤیایە هەر وی بابەتی دوبارە کەتەڤە د (هەتا وی کورد)دا ئانکو هەر ل سەر چیرۆکی بەردەوام بیت. لەورا رابویە هوزانەك

بەلاڤکـری‌یە مینا چەند شیرەتانە کو گوهدارییا وی بکەت و چاخێ ئەو تێـدا ژیـاین گەلەك پێـدڤی شیرەتا بویە و رێکێت درست نیشا ملەتی بدەت ـ.

دبـەرپەرێ (١٠)ێدا ل سەر بابەتێ بنیاتێت چیرۆکێ ئاخڤتی‌یە و چەند خالەك دەست نیشان کرینە و دچیرۆکێ دا چویە خارێ .. بەلێ ب هزرامن نابیت ئەم مەرجێت نوکە بێت چیرۆکا هونەری هەمیا ل سەر چیرۆکا وی (تطبیق) بکەین.[١٣] چنکی چیرۆکا وی بەری(٧٦) سالا یا هاتیە بەلاڤ.کرن ، دڤان سالادا گەلەك مەسەبێت تورەیی پەیدا بویتە و هەتا نوکە ژی هەرێ پەیدا دبن.

ل سەر چیرۆکێ کو دەقێ وێ بەلاڤکـریـە دبـەرپەرێ (١٢)ێ دا ئەم چ ل سەر نانڤیسین چنکی نڤیسیێەکا بەرفرەهتر پێ دڤێت و ئەوێت بەلاڤکرین هەمیا جارەکا دی هەڤبەر بکەینەڤە.

دبەرپەرێ (١٩)ێدا ل سەر چیرۆکا (کندۆ)ی دبێژیت: «ئـەڤ چیرۆکـە بۆمن بۆ مەرەق ـ پشتی کو من ئەڤ چیرۆکە ساخکری»، ب هزرا سەیدای ئەوی ئەڤ چیرۆکە یادیتی‌و ساخ کری.. لێ بەری ئەو بەلاڤ کەت ب چەند رۆژەکا هێژا (نوزاد علي أحمد) ڤێ چیرۆکێ دەست نیشان دکەت دوێ گوتارا خودا ئەوا دکـوڤـارا (رۆشنبـیری نوێ)دا هژمارا (١١٥) هەر وەك دیەرتوکا خودا دەست نیشان کری. جارەکا دی دێ بێژین ماڤێ هێژا (حجی جعفر) هاتیە خارێ چنکی ئەوی بەری هەر دووان (شعبان و نوزاد)ی ئەو چیرۆك دەست نیشان کری‌یەو دکوڤارا (بەیان)دا بەلاڤکری‌یە.[١٤]

نڤیسەرێمە ژگوتارا (نوزاد علی احمد) ئەڤ چەند رێزکە هەلبژارتینە.. «ئەگەر نووسینەکی«فوئادتەمۆ» بە چیرۆك دابنێن پێـویستـە ئەم نووسینـەش بەچیرۆك دابنێن»، ل ڤێرە سەیدا نڤیسینـا کاك نوزادی ڤەبـری‌یـە و رستـەکـا دی ژگـوتاری هەلبـژارتی‌یـە و دبێـژیت: «ژمارە (سێ) تەواوکەرو دوا بەشی چیرۆکـەکـەی (فـۆاد تەمۆ)یە چونکو ئەوەی جێی راستی‌یە هەردوو نووسینەکەی واتە دوو نووسینەکەی ژمارە یەك و دوو ژمارە سێ لەیەکتر نزیکن و...».
ل سەر ڤی پەرەگرافی کاك شعبان دبێژیت «نەخیر ئەڤە چیرۆکەکا سەربەخویە.. ئەڤ چیرۆکە نە پشکا سێێیە..».
ما کەنگی کاك (نوزاد)ی وەگوتی‌یە ، کو تاوانبار دبیت ل دوڤ گوتنـا نڤیسـەرێمە، دەمێ ئەم زڤری‌نە سەرگوتارا هێژا کاك (نـوزاد)ی.ب ڤی رەنگی بومـە خویا بو کو ب پسیار دبێژیت (ئایا!!) لێ یافەر ئەم نڤیسینا وی هەمیێ لبەر چاڤ رێزکەین.. «ئەگەر نووسینەکەی (فۆاد تەمۆ) بەچیرۆك دابنێن پێویستە ئەم نووسینـەش بە چیرۆك دابنـێن! جا بۆ ئەوەی نووسینـەکـەی «فـۆاد تەمۆ»، یان نوسینەکەی ژمارە سێ بە چیرۆك و یەکەم چیرۆکی کوردی لەقـەڵەم بدەین پێـویستە زیاتر بچینە بنج و بنـاوانی نووسینـەکان و بەشەکانی تری نووسینەکەی (فۆاد تەمـۆ) بدۆزینـەوەو بزانین ناوی نووسینەکەی چی‌یە؟ چونکە بەبێ ناو بلاوکـراوەتـەوە، یان بزانین ئایا نووسینەکەی ژمارە (سێ) تەواوکەرو دوا بەشی چیرۆکەکەی (فۆاد تەمۆ)یە.[١٥]

ئەڤ چیرۆکە، یا (کندو)ی؛ نەچیرۆکەکا هونەری‌یە، وەلێ فولکلوری‌یـەو دبیت دەست کاری تێـدا کربیت ئانکـو بیروکا (فکرە) وێ وەرگرت بیت و سەر و ژنوی نڤیسی بیتەڤە و لدوڤ وێ گوتنا ل دوماهی‌یێ بەرهەڤکربیت دەمێ دبێژیت [کلم الناس علی قدر عقـولهم].[١٦] هەروەسا هەتا نوکە کەسێ نەگوتیە ئەو چیرۆکـەکـا هونـەری‌یە و دبیتە چیرۆکا دوێ مینا سەیدا (د. بدرخان سندی، حجی جعفر، یاسین قادر بەرزنجی) کو ئەون یێ ل سەر چیرۆکا دوێ نڤیسین. ئانکۆ لسەر ڤێ چیرۆکێ نڤیسین.

دبەرپەرێ (٢٢)ێدا ل سەر چیرۆکا (بۆچی جل خوارم) یا (کـریم سعیـد زانستی) نڤیسی‌یـە و دکەتە چیرۆکا سێیێ، کوبـەری هینگی کاك (یاسین)ی بەلاڤ کری و کربو چیرۆکا دوێ.[١٧] وەلێ دبەرپەرێ (٩)ێدا دبێژیت «ئو کەریم زانستی سێیەمین چیرۆك نڤیسە پشتی کو هاتی‌یە دیتن کو ئەوێ چیرۆکا بەلاڤکری ل سەر بەرپەرێت رۆژناما (ژین)دا یاسالا (١٩٢٤) ...». لڤێرە نزا ناڤێ رۆژناما (ژین) ژکیڤە ئینا و چەوا (ژیانەوە) بو ژین !! دیسان سالا ١٩٢٥ێ بو سالا ١٩٢٤ێ. هەر چەندە دبەرپەرێ (٢٢)ێ دا ب درستی نڤیسی‌یە کو رۆژناما [ژیانەوە] هژمارا (١٥) ل رۆژا ١٦ شوباتا سالا ١٩٢٥ێیە.
دڤێ گوتـارێدا مە نەڤیـا ل سەر دەقێت چیرۆکـا چ

بنڤیسم، چنکی؛ من بابەتەکی بەرفرەهتر یێ یێ ل هزرێ ئەو ژی نوک هندە ژێدەرێت من دکێمن و ئەگەر چەند سەیداییێت بەرێز دەستێ هاریکاریێ بو من درێژکر دێ ب بەرێکڤە هێت و ئەزێ ل چاڤەرێیا وان سەیدایان.

**بڤێ چەندێ بومە خویا بو، کو، نوکە؛ فوئادێ تەممو یەکەمین چیروك نڤیسە و ئەم ب درستی نەشێین بێژین بێڤان چیروك نڤیس یێ دوێیە سیێو... یە.**

دوماهی‌یێ داخازا بورینێ و نڤیسینێت جوانتر و کویرتر ژ کاك شعبان مزیری دخوازین و هەر سەرفەراز بیت.

<u>ژێدەر و دەهەمەن:</u>


١ـ عبدالکریم فندي: فوآدێ تەمو کی‌یە و چی‌یە؟/ کوڤارا (کاروان) هژمار / ٧ نیسان ١٩٨٣ / بپ ٥١.

٢ـ ا / الدکتور کمال مظهر أحمد: کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی / ترجمة: محمد الملا عبدالکریم / ط٢ ـ بغداد ـ ١٩٨٤ / ص ١٠١، ١٠٢، ١٠٣.

ب / د. جەلیلێ جەلیل: کۆمەلا هیڤا ـ ... ڤەگوهاستن ژ تیپێن لاتینی: عبدالسلام علی میرزا / کوڤارا (رۆشنبیری نوێ) هژمار / ١١٦ کانوونی یەکەم ١٩٨٨ بپ ٤٨.

ج / جەمال خەزنەدار: رۆژی کورد ـ ١٩١٣ / بغداد ـ ١٩٨١ / بپ ٨

د / الدکتور بلەج شیرکوه القضیة الکردیة / مصر ـ ١٩٣٠ / ص ٥٢.

٣ـ ژێدەرێ دوێ (ا).

٤ـ دەقێ چیرۆکا (کندو)ی هێژا (حجی جعفر)ی دکوڤارا (بەیان) هژمار / ١٠٠ تشرینا دوێ ١٩٨٤ دا بەلاڤکریە ل بەرپەرێ ٢٥ـ٢٦ و فەرۆزەك بو ڤەکریە و دبێژیت: «دەقێ ڤێ چیرۆکێ من ژکوڤارا (بەیان) را شاندی‌یە سالا ١٥/٥/١٩٨٣ .. کو ئەڤە شانازی بوو، بۆ هێژا (حجی) بو جارا ئێکی ئەوی چیرۆك ساخ کری.

٥ـ ژێدەرێ دوێ (ب).

٦ـ عبدالرقیب یوسف: دەستنووسی «بەر صیصی عابید» لەبەرهەمی «فەقیێ تەیران» کوڤارا (نووسەری کورد) هژمار / ٢ ئابی ١٩٧٩ / بپ ٧٨.

٧ـ حەسەن جاف : چیرۆکی نوییێ کوردی بغداد ـ ١٩٨٥ / بپ ٢٤ـ٢٥.

٨ـ ا / انور محمد طاهر / فوئادێ تەمو ئێکەمین چیروك نڤیسی کوردە / رۆژناما (هاوکاری) هژمار / ٥٨٨ رۆژا ٢١/٥/١٩٨١.

ب / رشید فندي ئێکەمین چیرۆکا کوردی کوڤارا (بەیان) هژمار / ٨٦ سالا ١٩٨٣.

ج / عبدالکریم فندي : فوآدێ تەمو کی‌یە و چی‌یە؟ / ژێدەرێ ئێکێ.

٩ـ ا / مەتین : فوئادێ تەمو و ئێکەمین چیروکا کوردی / کوڤارا (کاروان) هژمار / ١٢ ئەیلولی ١٩٨٣ / بپ ١٣٥.

ب / حجي جعفر / چیرۆکەك وسێ نڤیسەڤان / کوڤارا (رۆشنبیری نوێ) هژمار / ١٠٢ تەمووزی ١٩٨٤ / بپ ١٨٠.

١٠ـ حجی جعفر: شەویش / کوڤارا (بەیان) هژمار/ ٩٦ مایسی ١٩٨٤ / بپ ٤٢ ـ ٤٣ / ژمارەی تایبەتی بە چیرۆك.

١١ـ حسین عارف: چیرۆکی هونەری کوردی / بغداد ـ ١٩٧٧ / بپ ١٣

١٢ـ د. بدرخان السندي : شمعة مجهولة في تاریخ القصه الکریة / جریدة (العراق) العدد / ٣٨٨١ لیوم ٢٢/١٠/١٩٨٨ ص٤

١٣ـ بنیاتێت چیرۆکا هونەری نەبەس ئەڤەنە (پێش گۆتن، گرێ ئارمانج و رامان، زمان) هەروەك دپەرتوکا ناڤبری‌دا هاتی، وەلێ بێت گرنگتر بێت ماین و نەمازە نوکە چیرۆکا هونەری لسەر چ بنیاتا ناهێتە ئاڤاکرن.

١٤ـ ژێدەرێ چارێ.

١٥ـ نوزاد علی احمد ، لایەنێك بۆ گەشە پێدانی ئەدەبی مندالان / کوڤارا (رۆشنبیری نوێ) هژمار / ١١٥ ئەیلولی ١٩٨٧ / بپ ١٠٩.

١٦ـ جەمال خەزنەدار رۆژی کورد ـ ١٩١٣ / بغداد ـ ١٩٨١ / بپ ١١٩

١٧ـ یاسین قادر بەرزنجی / بۆچی جل خوارم ـ دووەم چیرۆکی کوردی‌یە / کوڤارا (بەیان) هژمار / ١٣٧ تشرینی دووەم ١٩٨٧ / بپ ٨٥.




# نووسین بۆ منداڵان و کۆمەڵە چیرۆکی گوندەکەمان

○ محمد رشید فتاح ○

سەرەتا دەتوانم بڵێم ، تا ئیمڕۆ لە سەد جار زێتر ئەم پرسیارە دووپات کراوەتەوە، پرسیارەکەش ئەوەیە،

- ئەرێ نووسین بۆ منداڵان هێندە سووك و ئاسانە، تا هەموو نووسەرو خاوەن قەڵەمێك ، لەتوانایدا بێت کە بۆ منداڵان بنووسێت ؟! لام وایە وەرامی پڕاوپڕی ئەم پرسیارەش نەك تەنها لەلای هێندێك روون و ئاشکرایە، بەڵکو لەلای ئەوانەش هەیە ، کەوا بۆ منداڵان دەنووسن و پەیتا پەیتاش شیعرو، چیرۆکی منداڵان دەخەنە بەرچاو ، وەرامەکەش ئەوەیە :- نەخێر .. نووسین بۆ منداڵان، هێندەی نووسین بۆ گەورەکان، قورسو گرانەو ، هەموو نووسەرێك ناتوانێت سەرکەوتوانە لەو مەیدانەدا ئەسپی خۆی تاو بدات . باشە بۆچی نووسین بۆ منداڵان قورس و گرانە ؟ دیسان ئەمەش پرسیارێکەو، لەبەر دەمماندا قوت دەبێتەوە .. وەرامەکەشی گەر لای هێندێك هەبێت ئەوەیە ، کە منداڵانیش وەکو گەورەکان، خاوەنی دنیای تایبەتی خۆیانن ، کەواتە خاوەنی حەزو ویست و ، خواستی منداڵانەی خۆیانن و ، هەرگیز بەو بەرهەمە ئەدەبیانە ناڵێن، بەرهەمی ئێمەیە، تا بە دڵیان نەبێت و ، شتێکیشی لێوە فێر نەبن و، چێژێکیشی لێ نەبینن .. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە وەرامی ئەم پرسیارە لای منداڵان خۆیانە .. خۆ گەر بێت و نووسەرانی ئەدەبی منداڵ ، ئەو بابەتانەی کەوا دەیخەنە بەر دەمی منداڵ ، لە پێشدا لە منداڵانی تاقی بکەنەوە ، ئەوا گرەو دەبەنەوەو، سەرکەوتنیش لەکارە ئەدەبی یەکانیاندا وەدەست دەهێنن کە دەپرسین :- نووسین بۆ منداڵان هێندە سووك و ئاسانە، تا هەموو نووسەرێك لەو مەیدانەدا خۆی تاقی بکاتەوە ؟ ئەوا پرسیارەکە لەجێی خۆیدایەتیو ،کەس نکوولی لێ ناکات، چونکە ئیمڕۆ خوا نەیبڕێ ، لە رووی پەخش و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی بۆ منداڵان، چ بەکتێب بێ و، چ لەسەر لاپەرەی گۆڤارو رۆژنامەکان بێ ، ئەوا بەشی خۆمان هەیەو، بگرە زێتریش ، گەر بڵێم لەچاو گەلانی دیدا زێترمان بۆ منداڵانمان

نووسیوه، ئەوا کە متریشمان نەنووسیوە .
هەن دەڵێن باساڵی سەد کتێب بۆ منداڵان ، چاپ بکرێت و، بڵاوبکرێتەوە، هەشن دەڵێن زۆرو بۆری وا بۆ ؟! باساڵی چوار کتێبی چاك و باش بخرێتە بەردەستی منداڵان .
پێم وایە هەموو کەسێك لە ئێمە حەز بەوە دەکات ، کەوا رۆژی کتێبێك بخرێتە بەر دەستی منداڵان ، وەلێ ناواخنی ئەو کتێبە دەبێ چۆن بێ ؟! بەرهەمێکی وابێ ، کە بە زۆری زۆردارەکی سەپێنرابێ بەسەر منداڵانداو ، بەختوخۆرایش بەنێوی منداڵەوە چاپ کرابێ‌و ، نووسەرەکەشی لاف ئەوە لێ بدات ، کەوا چاکی خزمەت گوزاری لێ کردووە بەلاداو ، لە پێناوی پەروەردە کردن و، فێرکردن و، پێگەیاندنی منداڵانی نەتەوەکەیدا ئارەقەی رشتووە . یالە پێناوی دەسکەوتی تایبەتی خویدا ، بێتە پێشەوەو، لە پەنا ئەدەبی منداڵانەوە ، بڵێت .. منیش نووسەرم .
لەوانەیە کەسانێك هەبن ، کە بڵێن ئەم قسانەی تۆ نەخزمەتەو ، نەهیچ بەڵکو سەر کوتانەوەو، رێگە پێگرتنە، بەو کەسانەی کەوا دڵسۆزانە بۆ منداڵان دەنووسن .
ئەوی راستی بێ منیش ئەوە دەزانم ، کە هەموو نووسەرێك ، نووسەر نی‌یە، کەس ناتوانێ رێگە بە خاوەن قەڵەمی خزمەتگوزار بگرێت و ، کەسیش ناتوانێت ، بەبەرهەمی چاك و ، پوخت و بە پێز بڵێ ، خراپ، چونکە بەرهەمی چاك ، گەر بۆ گەورە بێ‌و، یاخود منداڵ خۆی شاهیدی سەرکەوتن و ، یاشی خۆیەتی .
وادەزانم کەس بەو نووسینانە نالێ ، سەرکەوتوو کەوا بە مەبەستی بازرگانێتی بۆ منداڵ دەنووسرێ و ، خاوەنەکانیشیان لە پێناوی دەسکەوتی تایبەتی خۆیاندا (قەڵەمەکانیان) بۆ خستۆتەکار .
لەم چەند ساڵەی دواییدا نووسین بۆ منداڵان ، بەمەبەستی (بازرگانێتی) یەوە زۆر ئاشکراو دیارە، گەر خوێندەوار چاوێك بگێرێت ، بە هێندێك لەو کتێبە بەناهەق چاپکراوانەی کەوا بۆ منداڵان نوسراون و ، بەسەریاندا دەسەپێنرێ ، هەروەها ئەو بەرهەمانەی کەوا رۆژانە لەسەر لاپەرەی گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یەکان پەخش دەکرێن، ئەوا دەگەنە ئەو ئەنجامەی کەوا ئێمە لە خۆمانەوە تفەنگ بە تاریکی‌یەوە نانێین .

بەڵێ خوێندەواری زیرەك دوای خوێندنەوەی ئەو بەرهەمانە، بەتایبەتی ئەوبەرهەمە (شیعر) ی یانەی کەوا بەنێوی هەڵبەستی منداڵانەوە ، نووسراون .. هەست دەکات کەوا زۆربەیان، جگە لە شوێن پێ هەلگرتن و ، لاسایی کردنەوەو، لەبەر گرتنەوەی شاعیرانی وەکو (گۆران ، پیرەمێرد، زێوەر ، قانع بێکەس ، کاکەی فەللاح عەلی شەونم، عمر عبدالرحیم بێخەو فەرمیدون عەلی ئەمین، لەتیف هەڵمەت و ، هێندێکی دی ، نەبێ ، ئیدی هیچ داهێنانێکی نوێیان تێدا نیە .
بێگومان بەرهەمی ئەو مامۆستایانە ، واتە ئەو نووسینانەی کەوا بۆ منداڵانیان نووسیوە ، دەوری خۆیان هەبووەو ، تا ئێستەش هەر هەیانە، لە پێگەیاندن و ، پەوەردەکردنی منداڵانی کورددا، تا ئیمرۆش زۆربەی هەڵبەستەکانیان بەسەردەمی مامۆستاو، قوتابیانی قوتابخانە سەرەتایی‌یەکانەوەن . لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا .
بۆ نموونە کاتی خۆی مامۆستا گۆران ، هەڵبەستی (بەرخەکەم) ی بۆ منداڵان داناوە دە بڕوانە بەدووی ئەو هەڵبەستەی ئەودا ، بەهەمان کێش و سەرواو، بگرە بابەتیشەوە چەند هەڵبەستی دیمان بەرچاو دەکەوێ .
هەروەها شوێن پێ هەڵگرتنی، ئەوان بەتایبەتی لەو هەڵبەستانەدا کەوا دەربارەی (قوتابخانەو، مامۆستاو ، باخچەی قوتابخانەو، یاری‌و درۆنە کردن و پاك و خاوێنی و ، ئامۆژگاری‌و ، گوێ رایەڵی‌و، یارمەتی و ، هاورێیەتی و هتد، وتوویانە ،
بەراست تۆبڵێی منداڵانی ئیمرۆ، منداڵانی دوێنێی چلەکان و ، پەنجاکان و شەستەکان و ، حەفتاکانیش بن و ؟ خەون و خەیاڵیشیان هەر
لەلای مام پشیلەو، مام ورچ بێ؟ خۆ منداڵانی ئیمرۆ لە دنیایەکدا دەژین، لە گەورەکان زێتر بەرانبەر بە شەری ئەستێرەکان و، شۆرشی تەکنەلۆژیاو، ئاڵۆزیی ئەم دنیایە سەرسورماوو ، حەپەساون خۆ ئەوە تەلەفزیون و ، فلیمی کارتۆنی .. لەبەردەمی منداڵان هەمووی باسی عاجبایەتی ئەم دنیاو چاخە سەرسەختەیە پیاوی ئاسمانی، مرۆڤی ئەستێرەکانی دی، زانست و زانیاری، فڕین، ئەتۆم، ئوتومۆبیل،

ـەرو شۆر، تاقیگـەو کیمیاگـەری و فیـزیـك، هەمـوویـان ـەشێـوەیـەکی تێگـەیشتنی قۆنـاغی گەورە بوونی منـدالّ ـەخرێتەروو .

خۆ منـدالان لە گەورەکان جودا نابنەوە، وەلّی مندالّیش پیاوو ژنێکی گەورە نین .. دنیـای منـدالّ بە ناهـوشیـاری‌و ، کەم ئەجـروبـەیی، نێوی دەرکردووە، وەلێ مندالانی ئیمرۆ پیاوی ســبەینـێن، بۆیە دەبێ لەئێستەوە ئامادە بکرێن، بۆ ئەو دوا ـۆژەی کە لە ئێستە ناچێ .

کەواتـە بۆچی نووســەرانی ئیمـرۆ، ئەوانەی کەوا بۆ مندالان ئەمـەکەیان لە کاردایە، رێرەوی نوێ ناگرنە بەر ؟! با هیچ ـەبێ وەکو (نۆسۆف) (خێزا نۆچکەیەکی بەختیار) بنووسن .

ـەشێ کەســانێـك هەبن، کە بلّێن جا نۆسۆف زێتر لە چارەکە ـەدەیـەکـە، بەمندالّەوە خەریکەو، مامۆستاو، پەروەردەکارو، ـەوزێی مندالّیشـەو، واقیعەکەشی زۆر لە ئێمە جیاوازترە .

ـەمە راستە ، وەلێ (نۆسۆف) نەهاتووە زانستی (ئەتۆم) بکاتە ـوەروکی چیرۆکێکی مندالانەو، بەسەریاندا ساغ کاتەوە . نا .. ـەخێر .. ئەو هاتووە زۆر بە سانایی و رەوانی باسی ئەوەمان بۆ ـەکات، چۆن چۆنی مندالّ شارەزایی لە ئامێری جووجك هەلّ هێنـانـدا پەیـدا دەکـات و، چۆن چۆنیش هێلکـەبـەو ئامێرە هەلّدێت؟! نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت نۆسۆف ـ بۆمندالّ قسە ـەکـات واتـە زمـانـەکەی هێندە سادەو، سووك و رەوانە، کە منـدالان لێی لا لووت نابن و حەز بەخـوێنـدنەوەی دەکەن، هەروەها ئەو دەیەوێ روو بە روو لەواقیعدا مندالان بدوێنێ‌و، ـەدنیای خەون و ، خەیالّدا، نەیان هێلّێتەوە .. چونکە سبەینێی ئەوان رۆژێکی دی‌یەو ، هەرگیز لە ئێستە ناچێت .

ـیســانەوە لێرەدا دەشێ کەسانێك هەبن کە بپرسن :ـ کەواتە ـەبێ لەمـەو دوا نووســەرانی منـدالّ لای ئێمەش ئاورێك لە ـانست و زانیاری بدەنەوەو، لەبری ئەوەی کە گوێی مندالان ـر بکەن لە پەندو ئامۆژگاری‌و ، بەزەیی هاتنەوە بە گیاندارداو، ـشتی دی، ئەوا بەرهەمی‌ی سەردەمانەیان بخەنە بەردەست بەلێ .. بەر لەمنیش دەیـان کەسی دی ئەم رایــەی هەبـووە، (صمدی بهرنگی) لە مێژە وتوویەتی .. [نووسەرانی مندالّ .. بابەس بێ ئیتر کە بە مندالّ بلّێین :ـ گوێ رایەلّ بەو، قسە لە قســەی گەورەدا مەکەو، پاك و خاوێن بەو، شەو زوو بنوو و، بەیانی زووش هەستە .. باهیچ نەبێ مندالّ لەوە بەئاگا بێنینەوە کە ئاگـای لەدەوروبـەرەکـەی بێت] خۆ کە ئێمە ئەم رایەش دەردەبرین، تەواو مەبەستمان لەوەنیە ، کەوا نووسەرانی مندالّ پشت بکەنە فولکۆرو کە لەپووری نەتەوایەتیمان و، حەکایەت و بەسەرهاتی گیانبازی‌و، فیداکاری‌و، نیشتمان پەروەری‌یان و بۆ نەخەنە نێو چیرۆك وهەلّبەستەوە .

نەخـێر، چونکـە هیچ نەتەوەیەك نی‌یە کە حەزبەوە نەکات، کە رابوردووی پڕ شکۆمەندی خۆی نەخاتە مێشکی نەوەکانیانەوە، وەلێ ئەوەی لە نووسەران داوا دەکرێت ، ئەوەیە کە چۆن مامەلّە لەتەك کەلەپووردا دەکەن و ، چۆن چۆنیش دەیخەنە قالّبێکی سەردەمـانـەوە .. نەك وەکـو گێرانەوەی ئەو حەکایەتانەی کە شەوانی درێژی زستان داپیرەمان لە گوێ ئاگرداندا دەیدا بە گوێماندا .

بەکورتی پێویستە دوای چارەکە سەدەیەك زێتر .. لە تەمەنی نووســین بۆ منـدالانماندا، ئەو ئەدەبەش گۆرانێك بەخۆیەوە ببینێ‌و ، چەشنی ئەدەبی گەورەکـان ئەویش تا زەنگـەری‌و، نوێبوونەوە لە رێگەیدا بگرێتەبەر .

هەرچەندە ئیمرۆ لەلای ئێمەش چەند نووسەرێك هەن کە لەم چەنـد سالّەی دواییـدا لە ئەنجـامی بەرچاو کەوتنی ئەدەبی منـدالانی گەلانی بیـانی‌و دەرو دراوسێـدا، هەستیـان بەوە کردووە کە نووسین بۆ مندالان لە ئاستێکی دیدایەو، قۆناغێکی تازەشی وەبەر ناوە، بۆیە ئەوانیش دلّسۆزانە تازەتر هاتوونەتە پێشەوەو، سەردەمانەتر دەنووسن وەلێ ئەو نووسەرانە هێشتا کەمن و، لەبەر چەند هۆیەك ماویانە لە کارەکانیاندا قالّ بن .

ئەو هۆیانەش :ـ

١ـ خۆ تەرخان نەکردنی تەواو بۆ نووسین بۆ مندالّو، ئەدەبی مندالان .

٢ـ پشتگیری نەکردنیان لە چاپ کردن و، بلاّوبوونەوەی بەرهەمەکانیان.

٣ـ کەم دەسکەوتنی ئەو بەرهەمە نەوازانەی کەوا بەدەست و خامـەی کە لە نووســەرانی هەنـدەران بۆ مندالان هاتوونەتە بەرهەم .

مەبەستم لەوبەر هەمانەیە کەوا نووسەرانی شارەزاو پسپۆری ئەدەبی منـدالْ دەنـووسن، لەوانـە کرالْچیف ـ ی بولگاری، نۆسۆف ـ ی رووسی ، بینوبلۆدرای جەرمەنیو صمدی بهرنگی ی ـ ئادەرییو .. هتد .

نەك ئەو بەرهـەمە بازرگانیانەی کەوا بە زۆرو بۆری بەلێشاو دەکەونە کتێبخانەی مندالەوە .

بێگـومـان تەمەنی شیعر بۆ مندالان، لەچاو تەمەنی چیرۆکدا درێژترە ، ئەمەش هەروەکو ئەدەبی گەورەکان شیعر تەمەنێکی دوورو درێـژی خۆی هەیـەو ، کەچی چیرۆك لە دایك بووی سەردەمی شارستانیەتە.

گەر لە چلەکـان و، پەنجـاکـانـەوە شیعر بۆ مندالان سەری هەلْدابێ .. ئەوا چیرۆکی هونەری بۆ مندالْ زۆر لە دوای ئەوەوە سەری هەلْداوە ، ئەو چیرۆك و حەکـایـەتـە فولکلۆریانەی لێ دەرچن ، کە جاروبـار مامـۆستـایان و، هێندێ لە نووسەران هەروەکو خۆی بێ دەست کاری کردن خستوویانەتەروو.

دەتـوانم بلێم لە سەرەتـای حەفتاکانەوە چیرۆکی هونەری بۆ مندالان، داهێنانی بەخۆیەوە دیتووە، وەکو لقێکی تایبەت بە ئەدەبی مندالْ سەری هەلْداوە..

یەکـەم پالْ پێوە نەریش کەوا پالێ ناوە بەنووسەرانەوە، خۆش ویستنی مندالْ بووە ، ئاشکرایە هەموو کەسێك مندالی خۆش دەوێت ، بەتـایبـەتی منـدالەکانی خۆی زێتر .. وەلێ هەموو کەسێك دەتوانێت بۆ مندالْ بنووسێت ؟ نەخێر ناتوانێت بەختی خۆی لەو مەیدانە داتاقی بکاتەوە .. لەبەر ئەوەی

**١ـ دەبێ نووسەری مندالْ بە هرمدار بێت .**

**٢ـ دەبێ شارەزاییـیـەکی چاکی لەزانستی دەروونـنـاسی منـدالْدا هەبێو، ئاگـای لە قۆنـاغـەکـانی گەورە بوونی مندالْدا هەبێت .**

**٣ـ دەبێ لە نزیکەوە مندالْ بناسێو ، حەزبە هاوڕێیەتیان بکات .**

**٤ـ دەبێ ئاگاداریی لە زمانی مندالْدا هەبێو، ئەو وشانە بەکـار بهێنێ کە منـدالْ لەدنیـاکـەی خۆیـدا بەسـەر دەمیەومیەتی .**

**٥ـ دەبێ ئاگـای لەوەبێ کە چۆن مامـەلە لەگـەلْ رەمزدا دەکات .. چونکە بەکارهێنانی (رەمز) لە ئەدەبی مندالاندا شارەزایی گەرەکە**

**٦ـ پێویستە نووسەرانی ئەدەبی مندالْ ئەرکی پەروەردەو، فێرکردن و، پێگەیاندنی مندالْ فەرامۆش نەکات .**

**٧ـ پێویستە شێوە و شێوازی ساناو ناسك و رەوانی هەبێ و، دووربکەوێتەوە لە درێژدادریو، ئالۆزیو، تەم و مژ لە نووسینەکانیدا .**

جگـە لەمـانـە مەرجی دیش هەن کەوا پێـویستە نووسەرانی ئەدەبی مندالْ رەچاویان بکەن . پێم وایە نووسەرانێك هەن، بۆ مندالْ دەنووسن . کەچی گوێ نادەنە زۆربەی ئەو مەرجانەو ، تەنها پشت بە بەهرەی خۆیان و، خۆشویستێ مندالْ دەبەستن بێگـومـان بەمـەش نابنـە نووسـەرێکی سەرکەوتوو لەبواری نووسـین بۆ منـدالانـدا .لەمـەشـەوە بازرگانیەکە بە ئەدەبی مندالەوە دێتە گۆڕێ .

وتمـان نووسـەرانێـك هەن، کە سەردەمـانە چیرۆك بۆ مندالْ دەنووسن و، سوود لە ئەو بەرهەمانە وەردەگرن کەوا نووسەرانی بیانی بۆ مندالانی خۆیانی دەنووسن ، هەروەها کە لْکیش لە سامـانی کەلەپـووری نەتـەوایەتیمان وەردەگرن و ، چیرۆکی فولکلۆری بۆ مندالان زیندوو دەکەنەوە . لەو نووسەرانەش [ جەزا عەلی ئەمـین ، تایـەر سالْح سەعید، رۆستەم باجەلان، لەتیف هەلْمەت، ئازاد محمود، عمر ابراهیم عزیز، نوری سەعید قادر] و چەنـد نووسـەرێکی دیش ، ئەمانیش هەموو ژیانی ئەدەبی خۆیانیان بۆ نووسینی مندالان تەرخان نەکردووە . بۆ گەورەش دەنووسن، جاروباریش بۆ مندالان . بۆیە لە زۆربەی ئەوبەر هەمانەیاندا کەوا بۆ مندالی دەنووسن، وەکو پێویست قالْ نەبوون و، رەخنەیان دێتە سەر، هەر لەبەر ئەمەشە داوای ئەوەیان لێ دەکرێت کە زێتر خۆیان ماندوو بکەن و، زێتریش بایەخ بدەن بەو کارە پیرۆزەی کەوا لە ئەستۆیان گرتووە .

یەکێ لەو نووسـەرانەی کەوا تا ئیمرۆ دلْسۆزانە دوو کۆمەلە چیرۆکی بۆ منـدالان بەچـاپ گەیـانـدووە، کاك (تایەر سالْح سەعیـد)ە شایـانی باسـە نووسـەر هونـەرمـەنـدانـە ئەو دووبـەرهـەمەی خستۆتە بەردەستی مندالْ و، لەرازاندنەوەی بەرگ و، وێنـەکـانی نێو کتێبەکانیدا بایەخێکی تەواوی داوە،

...ەی کە ئەم کتێبانە بۆ منداڵن و ، پێویستە کتێب بەم شێوەیە ... چاپ بکرێت بێگومان ئەمەش مەرجێکە لەو مەرجانەی ... نووسەران لە کاتی چاپ کردنی بەرهەمی منداڵاندا ...ی بکەن .

... ساڵی (١٩٧٩) کۆمەڵە چیرۆکی یەکەمی بەنێوی ... و ئەستێرە) وە خستۆتە نێو کتێبخانەی منداڵەوە . ساڵی ... یش دووەم کۆمەڵە چیرۆکی بەنێوی (گوندەکەمان) ەوە ...یە لە (٨) کورتە چیرۆك بەچاپ گەیاندووە . کاروان و ...ە - کاتی خۆی لەسەری نوسرا ، وەلێ ئەم کۆمەڵە ...کەی ئەم دواییەی نووسەر (گوندەکەمان) هیچی وای ... نەنوسرا ، بۆیە بەپێویستم زانی لەم ژمارە تایبەتی‌یەی ...ی خۆشەویستی (کاروان) دا ، لایەکی لێ بکەمەوەو ، ...یکی رەخنەگرانەوە تاوو تویەکی چیرۆکەکان بکەم .

... چەندە دەڵێن ئێمە تا ئێستە رەخنە گری ئەدەبی منداڵمان ... . وەلێ منیش دەڵێم هەموو خاوەن قەڵەمێکیش ناتوانێت ... ئەدەبی منداڵان بگرێت و، بەو نێوەوە ببێتە رەخنەگر، ... ئەو نووسەرەش کە بەنێوی رەخنە گرتنەوە دێتە ...ەوە، چەندمەرجێکی تێدابێ، گرنگترین ئەو مەرجانەش، ... پێویستە شارەزایی‌یەکی لە دنیای منداڵ و ، ئەدەبی ...ڵاندا هەبێ و، خوا وەکیلی رەڵ لێ نەدات .

## چیرۆکەکان

### ...یە بچکۆلەکە .

...ی ئەم چیرۆکە، بەکورتی و بە کوردی ئەوە دەخاتە بەر ... منداڵ، کە ماسی گەورە چونکە، زەبەلاحەو، چاوبرسی‌یەو، ... دەستەلاتە، ئەوا ماسی‌ی بچکۆلە دەکاتە پارووەکی ...و، قووتی دەدات نووسەر دەیەوێ لە نێوان گفتوگۆی ...یەکی بچکۆلەو ، ماسی‌یەکی گەورەوە، کۆتایی بەمەسەلەی ... خواردن و ماف قووت دانەو، زۆر لێکردنە بێنێ و، بەر ...تی خواردنی ماسی بچکۆلە لەلایەن ماسی گەورەوە بێنێ ، ...ش بەم رێگەیە مەحاڵەو ، هەرگیز وانا چێتە سەر نە ماسی ...ە بەو رێککەوتنە دەڵێ باشەو ، نە سکی خۆشی دەگوشێ و ، ...ەی تەماعیشی کڵۆم دەدا ، نەماسی بچکۆلەش لەوەو دوا ...بەست و، ئازاد دەتوانێ خۆی لەبەر زەبرو زەنگی ماسی‌یە

گەورەکاندا بگرێت ، لەوەتەی دنیا دنیایە ماسی گەورە ماسی‌ی بچووکی هەر خواردووە، ئەمە یاسای ژیانە ، وەلێ چۆن چۆنی ماسی‌یە بچوکەکان لە دەستی زاڵمان و، چەوسێنەران قورتاریان دەبێت ؟! بێگومان بەیاخی بوون و، سەربەرزکردنەوە ، ئەویش لەرێگەی یەکگرتنەوە،

منیش دەڵێم .. وەکو نووسەر دەڵێ [ سەیرە ماسی بۆ لە ماسی بترسێ ، کەهەر دوولایان هەر ماسی‌ی بن ؟.] ئەی سەیر نیە .. ئادەمیزاد لە ئادەمیزاد

دەترسێ، کەچی هەمووشیان هەر ئادەمیزادن ئەی مرۆڤ گورگ نیە بۆ هاورەگەزەکەی خۆی ؟

بەرای من دەبوو نووسەر بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە پشتی ببەستایە، بە فەلسەفەیەکی پێشکەوتوو، چونکە ئەمە خۆی لە خۆیدا مەسەلەیەکی فەلسەفیە .

**چیرۆکی [ مانگ و منداڵەکان ]** بەلای منەوە ئەم چیرۆکە سەرکەوتنی لەوەدایە ، کە ناوەرۆکێکی زانستیانەی گرتۆتە خۆی هەر لەرێگەی گفتوگۆی نێوانی چەند منداڵێك و (مانگ) ەوە، منداڵ فێری ئەوە دەبێت کە (مانگ گیران) دیاردەیەکی سروشتی‌یەو، کاتێك کە زەوی دەکەوێتە نێوانی خۆرو مانگەوە، ئەوا مانگ گیران روو دەدات .. گەرمانگیش کەوتە نێوانی زەوی و خۆرەوە، ئەوا «خۆرگیران» روو دەدات .

**چیرۆکی [کانیاو]**کانیاوێك کە سەرچاوەی خێروبێرە لە پر وشك دەکات .. نازانین بۆ ئەو کانی‌یە لە خۆیە وەکوێر دەبێتەوە ، بێگومان ساڵی بێ بارانی قات و قری بەدەمەوەیەو، کانیاوەکانیش وەکو پێویست ناتەقنەوە بەوشك بوونی کانیاوێکیش نەك تەنیا منداڵان، بەڵکو گەورەکانیش دڵتەنگ و سەغڵەت دەبن، بەلای نووسەرەوە، هەر تەنها منداڵان دڵتەنگ و خەفەتبار دەبن، بۆیە دەکەونە خۆیان و، بریار دەدەن نەسرەون ، تا گیان دەکەنەوە بەبەری کانیاوەکەدا .. بۆ ئەم مەبەستەش کۆدەبنەوەو، راوێژ بەیەکدی دەکەن، سەیرە پرسیارێکیش لە گەورەکان ناکەن ، واتە بە خاوەن ئەزموونێك و دنیا دیتەیەك ، چونکە بۆ چارەسەرو رێگە گرتنی وا ، پێویست بەشارەزاو، مامۆستاو رێنمایی کەردەکات .

منداڵەکان بریار دەدەن ، زەوی هەڵدرن تا دەگەنە سەرچاوەی

کانیاوەکە .. کەچی کە (خاڵە مەحموو)ی ریش سپیو دنیا دیتە پێیان دەڵێ پەلە مەکەن .. ئەوان بەقسەی (نەریمان) دەکەن و ، داوای یارمەتی لە (هەور) دەکەن. ناچار خاڵە مەحمووش، ئاخۆ چەند بەتەمەن لە نەریمان ـ گەورە ترە ، دەڵێ :ـ ئافەرین ـ نەریمان ـ قسەی راست ئەمەیە، لەوە دەچێ خاڵە مەحموو ـ تا ئەو تەمەنە بەوەی نەزانیبێ، کەوا لە ئەنجامی تەرووتووشیو، بەفرو بارانێکی زۆرەوە..کانیاوەکان دەتەقنەوە سەرەنجام پەڵە هەورەکـان بەقسـەی منـداڵەکـان یەك دەگـرن و ، دەدەنـە نەعرەتەو، بەوەش کانیاوە کە دەتەقێتەوە.

**چیرۆکی گونـدەکـەمـان** :ـ کۆمـەڵە چیرۆکـەکە بەنێوی ئەم چیرۆکەوە نێو نراوە، لەوە دەچێت ئەم چیرۆکە بەلای نووسەرەوە، لە هەموو چیرۆکەکانی دی سەرکەوتووتر بێ، وەڵێ ئەم ناوەرۆکە زۆر وتراوەو ، زۆریش بیستراوە .

هەموو کەسێك لەکاتی تەنگانەدا بەرگری لەخاك و، سەرو ماڵی خۆی دەکـات و ، شوێنەوارو نیشتمانی خۆشی دەپارێزێت .. باپـیرەیـەك کە رەمزە بۆ مێژوو .. شەوانە حەکایەتی بەرگری کردن و، فیداکاری بۆ خاك و نیشتمان ، بۆ منداڵان دەگێرێتەوە ، یەکێ لەو حەکایەتانە ئەوەیە کە چۆن سەردەمێك ئەوان چاو نەترسانەو، لە خۆ بوردوانە، بەرگری یان لەسەرو ماڵی خۆیان کردووەو ، بەرانبەر بە دوژمنی داگیرکەر وەستاون .

.باپـیرە دەڵێ :ـ شەوێك سەگ بەگوندەکەمان فێر دەبن و، دێنە سەرمان، ئێمەش بە گەورەو ، بچووکەوە لێیان راپەرین ، هەر بەوشـەوە بە شاخـەکـەدا سەرمان خستن و، کردمانن بەنێو ئەشکەوتێکدا ، ئیدی لەو رۆژەوە ببرای ببر سەگ بیری لە داگیر کردن نەکـردەوە، ئەوەی بیر لە داگـیر کردن بکـاتـەوە دەبێ ئەشکەوتەکان لە بیر نەکات.

ئەی بۆ نووسـەر ناڵێت .. ئەوەی بیر لە داگیر کردن بکاتەوە ، پێـویستـە مەچـەك و بازوو دلێری رۆڵەکانی نیشتمان لە بیر نەکـات، دوای ئەوەش هەمـوو کەسێك لەو گوندەدا هاوبەشی دەکات لە بەرگری کردندا ؟ یا هەن خۆیان دەدزنەوەو، دەبنە رێ پیشاندەرو، کلکەلەقێ دەکەن

**چیرۆکی (فـاقە)** .ئەم چیرۆکە ئەوە فێری منداڵ دەکات ، کە خۆراگر بێت و ، گەر مردووشە لە برسا لە ئاستی تەماع ـ دا مل کەچ نەکا ، بەتایبەتی ئەو جۆرە تەماعەی کە لەنێو چوون و ، سەرنانەوەی لە دوایە .

ئەمەش بیرێکی چاکە ، مەبەستێکی پیرۆزیشە، ریشۆڵەیەکی برسی، لەزستـانێکدا بە دەوری فاقەیەکدا هێندێ گەنم بەدی دەکات ، وەڵێ لێی ناچێتە پێشەوەو، دەستی تەماع درێژ ناکات و ، سکی خۆشی دەگوشێت .. هەر خۆی دەگرێت، نازانین چۆن دەتوانێ هەروا بەبرسێتی بمێنێتەوە، خۆگەر هەموو ریشۆڵەیەك بەو جۆرە وا بمێنێتەوە ، ئەوا چ راوچی یان و ، چ منداڵانیش هەرگیز ریشۆڵەیان بۆ ناگیرێت و، تا دنیا دنیاشە ریشۆڵە بە دەستی ئادەمیزاد زەرەر ناهێنێت .

باران دەبارێ و، بەفر دەتوێتەوە، ئەوجا خاوەن فاقە نائومێدانە دەگەرێتەوەو ، بەوەش ریشۆڵەکە بە کەماڵی ئیسراحەت گەنمەکە دەخوات .

تۆ بڵێی دوای خوێنـدنـەوەی ئەم چیرۆکە منداڵیش نەپرسێ ، ئیدی لەمەو دوا (فاقە) بەکەڵك نایەت ، چونکە ریشۆڵە زیرەك و خۆراگرەو، نابێت بەداوەوە، تۆ بڵێی وابێت ؟.

**چیرۆکی شەرە کەڵەشێر** :ـکەڵەشێرێکی رەش و ، کەڵەشێرێکی سپی ، بەهـۆی خاوەنـەکانیانەوە بەشەر دێن ، بەردەوامیش بەشـەر دێن، بێگومان کەڵەشێر جگە لە دەوری باوکایەتی و، گۆشت خواردنـەکـەی زۆر جار بۆ شەریش رادەگـیرێ، ئەوە بەدەست کەس نیە، هەن پارەیەکی زۆر دەدەن بە کەڵەشێری دەست بازو، شەرانیو ئازا رۆژێکیش لە رۆژان کەلەشێرێك هەر رەنگێکی هەبێ ، ئەوا نابێتـە کەڵەشـێری ئاشتی کەلەشـێرە سپـیـیەکـە، ئاشـتـی خوازەو، دژی شەرو شۆرە لە تەك هاورەگـەزی خۆیدا .. بۆیە دەیەوێ لەتەك هاوەڵەکەیدا واتە کەڵەشێرە رەشەکەدا (سوڵح) بکات .. بێگومان ئەمەش بەدزی خاوەنەکانیانەوە، ئەگینا چەقۆیان لەمل دەنێن.

سەرەنجام هەردوو لایان لەسەر ئەوە رێك دەکەون، کە ئیدی شەر نەکەن و، ئازاری یەکدی نەدەن وەڵێ گەر خاوەنەکانیان بۆ شەر کردن رایان گرتبن ، نەك بۆ ئەوەی کە بەیانیان زوو بخوێنن و، جوتیارەکان بێدارکەنەوە ئەوسا دەڵێن چی؟ بێگومان دەڵێن :ـ کەڵەشێریش نەبێ ئەوا رۆژ هەر دەبێتەوە .. باتا ئەم کەڵەشێرە چقەی دەرنەکردووە سەری ببرم .. خۆ ئەو بەزیوەو شەر ناکات .

ـ ـ ی من گەر ئەو (سـولح)ە لە نێـوانـی هەر دوو خاوەنی ـەـتـرەکاندا بوایە چاتر بوو ، چونکە بەو پێیە کەڵەشێرەکان ـ ـست ئازار قورتاریان دەبوو .

**چیرۆکی** [دارسێـو]دارسێـوێـك هەمـوو رۆژێـك سێـوە ـسـوورەیـەك بۆ خاوەنەکەی دەگرێت .. چونکە خاوەنەکەی ـرمەتی دەکاو، بەدەوریـا دێت ، کەواتـە شایـانی ئەوەیـە ـسـوی بۆ بگـرێت کەچی بۆهەر رێبوارێکش کە بەوێیوەدا ـیەڕێت، دارسێوەکە سێوێکیش بۆ ئەو دەگرێت .

ـوسـەر لەرێی ئەم چیرۆکەوە دەیەوێ بەمندال بڵێ ـ پیاوی ـیـکو دەست نوقاو، گەر وازلەو

ـ ـە بووچەی نەهێنێ ، ئەوا ئەنجام زەرەردەکات، بەر تۆڵەش ـکـەوێت ، بەتایبەتی کە دارسێوەکە رۆژێك سێوێك بۆ پیرە ـمـێکی پەککەوتە دەگرێت، خاوەن دارەکە لێی دەشارێتەوە، ـەجـامی کردەوە ناشـیرینـەکـەی خۆی وەردەگرێت و، لەوە ـەو وە دارەکە سێوی بۆناگرێت ، تا پەشیمان دەبێتەوە.

گەر نووسەر لە سەرەتاوە بیوتایە ، رۆژانە سێوی دارسێوەکە ، ـۆ هەژارو لێ قەوماوان بوو، خاوەن دارەکـەش دزی لەبەشی ـەو ـن دەکـات .. ئەوا چیرۆکەکە سەرکەوتووتر دەبوو بێگومان ـەوەن دارەکە بۆی هەیە لەتەسێوێك نەدا بەهیچ کەسی ، چونکە خۆی خاوەنی دارەکەیەو ، لەکەس داگیر نەکردووە ، خۆ دارەکە یەخەی ناگرێت .

**چیرۆکی** [تـۆڕو ماسی]لەم چیرۆکـەشدا نووسەر دەیەوێ لە ئەنجـامی بەزەیی هاتنـەوە بەمـاسیـدا (تـۆڕێـك) ماسی بۆ خـوەنەکەی نەگرێت . بێگومان (تۆڕ) ئامرازی نان پەیدا کردنی ـسی گرانە رۆژێك لە رۆژان ئادەمیزاد بیری لەوەکردۆتەوە کە بەهۆی تۆڕەوە ماسی بەکۆمەڵ دەگرێ و، بەخەڵکیشی دەفرۆشێ بۆیە تۆڕی دروست کردووە.

تۆڕێکی بێگیان ، نەنان دەخواو نە ئاو ، هەزار جاریش بیدەی بەزەویدا ، ناڵێ ئاخ ، ئیدی چۆن بەقسەی ماسی یەك واز لەکاری خۆی دێنێ ؟ دەبوو ماسی یەکە رووی لەخاوەن تۆڕەکە بکردایەو، بیـوتایە، واز لەئێمەی ساواو وردیلە بێنن ، تا گەورە دەبین ، چونکە ئەوکاتە گۆشتمان زۆر دەبێ و دڕکیشمان کەمتر دەبێت .. با ئەو تۆڕەش لەو کۆمەدا ماسی نەگرێت، چونکە تۆڕی دی هەن

هەرکاری خۆیان ئەنجام دەدەن .

**سەرەنجام**

تایـەر ساڵح سەعـیـد ـ دەیـەوێ بۆ منـداڵ بنـووسێ و، خواستیشێتی خزمـەتی مندالانی نەتەوەکەی بکات، لەرووی نووسینـەوە، هەرچـەنـدە نووسـەر مامـۆستـای قوتابخانەی سەرەتـایی نەبـووە، وەکـو هێنـدێـك لەو مامـۆستـا قەڵەم بەدەستـانـەی کەوا تەمـەنێکی زۆریـان لەبواری پەروەردەو فێرکـردندا بەسەربردووەو-، لە نزیکەوە ئاشنایەتیان لە دنیای مندالا پەیدا کردووە.

وەلێ ئەم هەر لەرێگەی خۆش ویستنی مندالەوە، دەستی داوەتە خامـەکـەی و، دەیـەوێ مندالانیش بێ بەش نەکات ئەمەش ئەرکێکی پیرۆزەو ، مایەی شانازی یە، گەر تاسەر بەردەوام بێ و، زێتریش لەولایەنەوە خۆی ماندوو بکات .

چەنـد ساڵێـك لەمـەوبـەر چەند نووسەرێك دڵسۆزانە هاتنە پێشـەوەو، بڕیاری ئەوەیاندا کە تاسەر بۆ مندالان بنووسن ، کەچی دوا بە دوای ئەوەی بەرهەمێکیان بەچاپ گەیاند ، ئیتر لێ بوونەوەو، بەڵێنەکەیان لەبیرکرد .

وەلێ تایـەر ـ هەر خەریکـەو ، بەردەوامیشـە لەو بەڵێنەی کە لەسەرەتاوە بڕیاری بۆ داوە دوا بەدوای خوێندنەوەی هەردوو کۆمەڵە چیرۆکی (کاروان و ئەستێرە) و (گوندەکەمان) دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بڵێین

**١ـ نووسـەر سەرجەمی چیرۆکەکانی بۆ قۆناغی یەکەمی مندالێ داناوە.**

**٢ـ زۆربەی چیرۆکەکان رەمزین .**

**٣ـ زۆربـەیـان بەزەیی منـداڵ دەجـووڵێنێ بەرانبـەر بەگیاندارو بێ گیان .**

بێگـومـان قۆنـاغی سەرەتـای منـدالی، قونـاغێکی ناسکەو . خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیەو ، پێویستە نووسەران لەکاتی نووسین بۆ ئەم قۆناغەدا بەتەواوی ئاگاداری خواست و ویست و ، زمان و هەڵس و کەوتی مندالانی ئەم قۆناغە بن .

نووسـەر هەوڵی داوە ئەو وشانە بەکاربێنی کە بەسەر دەمی مندالانی ئەم قوناغە وەن . .

دوای ئەوەش هەوڵی داوە رستـەو دەستـەواژە، گفتوگۆی نێو

چیرۆکەکان سادەو ساکارو ، بێ گرێ و گۆڵ بن و، لەکاتی خوێندنەوە یاندا منداڵ لێیان بێ تاقەت نەبێ .

وەلێ نووسەر هێشتا ماویەتی لەم هەوڵدانەیدا سەرکەوتنی تەواو بەدەست بێنێت .. راستە، دەبێ ئێمە فەرهەنگی زمان لەلای منداڵ دەوڵەمەند کەین و ، وشەی نوێی بخەینە بەرچاو، وەلێ ناشبێ پشت بکەینە ئەوەش کە چۆن چۆنی بۆ گەورە دەنووسین هەرواش بۆ منداڵ بنووسین .

منداڵ حەزدەکات بڵێ :ـ (عاجز)(بەعز) چونکە ئەم وشانە بەزمانی خۆی دەزانێت ، وەلێ :ـ کەپێی بڵێی (زویر) ئەوا دەپرسێو ، دەیەوێ بزانێ مەبەست لەبەکارهێنانی ئەم ووشەیە چی‌یە ؟

منداڵی ئەم قۆناغە حەز دەکەن ئەم رستەیەیان بەمجۆرە بخرێتە بەردەم .

[ـ ئایی‌لەوە .. ئەی ئەوان وەکو ئێمەنین] لەبری ئەوەی کە پێیان بڵێین :ـ [ئایا ئەوان لە ئێمەنین ؟] (چیرۆکی ماسی‌یە بچکۆلەکە ـ گوندەکەمان ـ ل ـ ٨) چونکە ئەم رستەیە بەمجۆرەی کەوا نووسەر نووسیویێتی، زێتر بۆ گەورەکان دەنووسرێ .

یا لەبری ئەم رستەیە ..[ئەی بۆ ناڵێن .. دڵم هەر لاتان بوو] نووسەر بیوتایە ، ئەی بۆ ناڵێن بیرم دەکردن] (چیرۆکی ـ مانگ و منداڵەکان) . (ل ـ ١٥) گەر بگەرێین بەنێو چیرۆکەکاندا ئەوا زێتر رستەو، دەستە واژەی وامان دەست دەکەون، کە نووسەر لەکاتی نووسیندا ئەوەی لەبیر کردووە کەوا بۆ منداڵ دەنووسێ .

گەر نووسەر ئاگای لەوەبێت لەکاتی نووسیندا، چۆن مامەڵە لەتەك بەکارهێنانی (رەمز) دا دەکات ، لام وایە وەکو هێندێك دەڵێن :ـ ئەدەبی رەمزی ـ بۆ منداڵ هەر ناشێ باشە گەر نووسەر ناچار بوو؟ پەنای بۆ بەرێت، ئەوسا چی‌ی بکات؟ ئەوسا دەبێت ئەو رەمزانە بەکاربێنێ کە لەئاستی تێگەیشتنی منداڵا بێت بۆ نموونە قەت (دارکون کەرەو) و (کەڵەشێری سپی) و (تۆڕ) نابنە رەمزی خێر ، چونکە دژی خۆیان ناوەستنەوە .

بریا نووسەر لەمەولا رەچاوی ئەوەی بکردایە، لەکاتی نووسیندا (واقعیانە) تر مامەڵە لەتەك شتەکاندا بکردایە ، بۆ نموونە ریشۆڵە کە برسی‌ی بوو ، گوێ ناداتە فاقەو ، داو ، هەروەها ماسی‌ی گەورە هەرماسی‌ی بچووك دەخوات ، دیسان بانگ هێشتنی هەورو، داوای یارمەتی لێکردنی مەحاڵەو، لەلایەکی ترەوە دارسێوێك رۆژی سێوێك بۆ رێبوارێك بگرێت ئەمە حەکایەتێکی ئەفسانەیی‌یەو، هیچی تر با نووسەر بێتە نێو (واقیعەوەو) هەوڵی ئەوە بداکە پاڵەوانی چیرۆکەکانی منداڵان خۆیان بن و ، هەر بەزمانی خۆشیانەوە بیاندوێنێ .. ئەوە چاترە لەو خەون و خەیاڵەی کەوا زۆربەی چیرۆکەکانی تەنیوە. راستە دنیای منداڵ، دنیای خەون و خەیاڵە، وەلێ ئەرکی نووسەری منداڵ هەوڵدانیشە بۆ پەردە داماڵینی ئەو خەون و خەیاڵە.

منداڵ خاوەن بەزەیی‌یە، ئەمە راستە.. بۆیە نووسەر لە ئەنجامی زۆربەی چیرۆکەکانیدا ئەوەی گرتۆتە بەر، کە بەزەیمان بەگیاندارو بێ گیاندا بێتەوەو، دژی ستەمکارو، زاڵم بوەستینەوەو، هەوڵی پێکەوە ژیانی ئاشتی و برایەتی بدەین و.. هتد.. ئەم جۆرە ئامۆژگاریانە بۆ منداڵ راست و دروستە، وەلی لەچ رێگەیەکەوەو، بە چ شێوەیەك منداڵان لە سەر ئەوە رابێنین؟... بەلای گەورە نووسەرانی وەکو (کراڵچیف و، نۆسوّف و؛ بهرنگی)یەوە راستەو خۆو، دوور لە خەون و خەیاڵ و، واقعیانە روو لە منداڵ دەکەن.. ئەی بۆ ئێمەش وانەکەین؟.. ئەوی راستی بێ ئەودوو کۆمەڵە چیرۆکەی کاك (تایەر ساڵح سەعید) هەڵدەگرن زۆر لەمە زێتریان لەسەر بنووسرێ.. وەلی بواری بڵاو کردنەوە لەمە زێتر رێگەم نادات بۆیە لە کۆتایی‌دا حەز دەکەم نووسەر هەر بەردەوام بێت و، لەم رێگەیەدا هەنگاوی سەرکەوتوانەتر بنێت .


سەرچاوەکان:

١ ـ ئەدەبی منداڵان و نموونەو لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی منداڵانی کورد ـ محمد رشید فتاح.

٢ ـ کاروان و ئەستێرە ـ تایەر ساڵح سەعید.

٣ ـ گوندەکەمان ـ تایەر ساڵح سەعید.

٤ ـ خێزانۆچکەیەکی بەختیار ـ نۆسوّف ـ گۆڕینی دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف.

٥ ـ ادب الاطفال ـ هادی نعمان الهیتی.



# ئەدەبی چیرۆکی خەیاڵی زانستیو جیهانی منالآن

o

نووسینی: د. نوری جەعفەر

وەرگێرانی: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

o

**بۆ پەروەردەکردنی خەیاڵی زانستیو نازانستیی منالّ عەر لەتەمەنێکی زووەوە، گرنگییەکی پەروەردەیی فرەی عەیە ئەمەیش لەماڵ و لەباخچەی منالآن بەگەڵی شێواز ـیێ دەبێ، گرنگترینیان: ئەو چیرۆکە خورافیانەی کەوران دەیگێرنەوە، یاخود بۆ منالآنی دەگێرنەوە، ـەرجێك ئەو چیرۆکە خورافییانە ناوەرۆکێکی ئەخلاقیی ـجێی لەخۆبگرن و، سەبارەت بەمنالّ شێوازێکی ئاسان ـ مەنالیەکی روونی هەبێت کەئەمەیش ئارەزووەکانیان ـەروژێنیو ختووکەی هەستە ناسکەکانیان دەدات.**

لەنێو ئەوانەی ناومان بردن، ئەو چیرۆکە خورافییانەیشی ـەچێتە ناو کە منالآن (هەر بەخەیاڵی خۆیان) بۆ گەورانی ـەگێرنەوە دەربارەی رووداوی گەورەو گرنگ کە لەگۆشەنیگای خۆیانەوە گرنگە. لەم حاڵەتەدا لەسەر گەوران پێویستە ـەواوی لەوە دوور بکەونەوە کە منالآن بە ـ درۆکردن ـ تاوانبار ـکەن لەبەرئەوەی ئەو چیرۆکە «درۆیانە» لەرووی ئەخلاقییەوە ـەوەی لای گەوران زانراوە) هەمیشە لەگەڵ واقیعدا پێچەوانە ـیەتەوە.

ـەواتە دەبێ هان بدرێو راست بکرێتەوەو پەرەی پێبدرێ چونکە ئەمە جگە لەوە کە گەشە بەخەیاڵی منالّ دەدا، هەروەها ـامانێکی گەورەی زمانەوانییان پێدەبەخشێو لەسەر ئەوەیش رایاندەهێنێ کەبەبێ ترس و شەرم قسەبکەن و توانای ئەدەبییان لەلا پەیدا بکات.

شایانی باسە لێرەدا ئەوەش بڵێین کە کورتە چیرۆکی خورافیی هەست بزوێن، لەحاڵی حازردا، جێگایەکی باشی لەئەدەبی منالآندا گرتووە، لێرەدا گرنگیی ئەو تەرزە چیرۆکانەی کەگەوران بۆ منالآنی دەگێرنەوەو ئەوانەیشی کە منالآن بۆ گەورانی دەگێرنەوە، دەردەکەوێ. بەمەرجێك ناوەرۆکی ئەو چیرۆکانە ـ وەك وتمان ـ ئەخلاقی بێو شێوازی ئاسان و مانای روون بێت بەجۆرێك ئارەزووەکانیان ببزوێنێو مەیلە هەڵچووەکانیان تێر بکات.

هەروەها شایانی باسە لێرەدا ئەوەش بڵێین کەهۆی رووداوەکان و پێوەندیی نێوان شتەکان لەلای منالّ ، بەتایبەت پێوەندی هۆیەکان بە ئەنجامەکانەوە، کەلەلای گەورە شتێکی نامۆیە یاخود هەندێجار شتی پووچ و پێکەنین هێنەرە، ئەگەر رێگرێکی کۆمەڵایەتی نەبێت کەپێویست بکات، دەنا دەبێ وازی لێبهێنرێو وەکو خۆی بمێنێتەوە. هەروەها پێویستیی بەدەسکاری کردن هەیە بەگوێرەی ئاستی پێگەیشتنی رۆشنبیریی منالّ، لێرەدا دەبێ گەوران لەتووندو تیژی دووربکەونەوە. پێم وایە لەم حاڵەتانەدا دەبێ گەوران هەمیشە ئەوەیان لەبیربێت کەئەوانیش پێشتر بەم قۆناغەدا تێپەریون و

جێیان هێشتووه..

بەڵام هۆکاری سەرەکیی سایکۆلۆژی، لەنامۆیی لێکدانەوەی هۆیەکانی دیاردە کۆمەڵایەتی‌و سرووشتی‌یەکان، لەلای مناڵ، ئەوە، بەنەزەری ئێکە ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بۆشاییە فروان و دوورو درێژەی وا لەنێوان زانینی سرووشتی شتەکان و پەیوەندیی هۆیەکان لەلای گەوران و نێوان زانینی سەرەتاییانەی منال، ئەمەش وادەکات کەمنالان ـ بەبێ ئەنقەست ـ زۆرجار هۆی سەیرو سەمەرە بۆ رووداوەکان بخوولقێنێت، بۆ پڕ کردنەوەی ئەو بۆشاییە گەورەیەی نێوانیان، واتە ئەوان ، لەبریی کەمیی زانیارییان ،لێکدانەوەی خەیاڵی‌و خورافییانەی ـ نامۆ بەجیهانی گەوران و زانیاریی باو ـ دەخووڵقێنن . ئەمەش بەشێوەیەکی تر وا دەگەیەنێ کەخەیاڵی منال لەم قۆناغە زووەیدا ئامرازێکی سایکۆلۆژیی ئیجابی‌و چالاکە کە منال بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی نێوان زانیاریی خۆی‌و، زانیاریی گەوران، بەکاری دێنێ. جگەلەوەش منالان خۆشییەکی سایکۆلۆژی لەو زانیارییە ساکارانە دەبینن و شارەزاییەکی باشیشیان لەوکارە زیهنی‌یە دەسگیر دەبێ . کەواتە دەبێ هەموو پەنجەرەیەکی کۆمەڵایەتیی رەخساو لەبەرانبەر منالاندا بکرێتەوەو هەموو توانایەك ئامادە بکرێ تا بەشێوەیەکی سەربەستانەو خۆڕسکانەو بەبێ قەیدو شەرت گوزارشت لەخۆیان بکەن.

پاشان لەسەر ئەم بنچینەیەو، ووردە ووردە ، لەمیانی گەشەکردنی رۆشنبیرییاندا، بەیارمەتیی گەوران، دەگەنە لێکدانەوەی ماقووڵ و بەجێ، ئەم لایەنەی خەیاڵی منالان ناوەرۆکێکی پەروەردەیی گەورەو فرەی هەیە ، لەکتێبی «چەند رایەکی نوێ سەبارەت بە شیکردنەوەی سرووشتی منال و پەروەردەکردنی» دا کە دەزگای رۆشنبیریی منالان چاپ و بڵاوی کردۆتەوە، ئاماژەمان بۆ هەندێکی کردووە، ئێستاش پێویست بەدووبارە نووسینەوەی ناکات و تەنها بەئاماژەکردن بۆی وازدەهێنین.

لەم گۆشەیەوە، توێژگەلێکی زۆر لە دیارترین پسپۆرانی ئەدەبی منالان دەبینین ، لەوانەیش ، بێگومان، ئەدەبی چیرۆکی خەیاڵی زانستی بەتایبەتی لەووڵاتە پێشکەوتووەکاندا، بەپلەی



یەکەم بایەخێکی زۆر بەرۆڵی ئیجابی‌و چالاکانەی کورتە چیرۆکی خوراف دەدەن، هەروەها بۆ گەشەدانی رەووشت و روانینی ئیستاتیکییانەیان و بۆ دەمەتیژکردنی هەستە ناسکەکانیان و فراوان کردنەوەی زانیارییان زیادکردنی سامانی زمانەوانییان و، بۆ خووڵقاندنی هاندەری سایکۆلۆژی لەلایان تاوەکو ئەو «نادیارە» ببڕن..

لەژێر تیشکی ئەو لێکۆڵینەوە مەیدانی‌و ئەزموونە لابوورییانەدا، کەبایەخ پێدەرانی پەروەردەکردنی منالان ، لەمیانی ژیانی رۆژانەی خۆیاندا، ئەنجامیان داوە، بەبێ‌شك ئەوە چەسپ بووە کە منالان هەر لەتەمەنێکی زووەوە ـ بەحوکمی پێکهاتی فەسلەجی‌و سایکۆلۆژییان و بەپێی ئاستی پێگەیشتنی رۆشنبیرییان ـ بەئارەزوویەکی توندەوە گوێ بۆ ئەو چیرۆکانە رادەدێرن کە گەوران بۆیانی دەگێڕنەوە یاخود دەیخوێننەوە یائەوانەی کە منالان خۆیان دەیخوێننەوە. لەدوایشدا ئەو تەرزە چیرۆکانەی کە لە کتێبی منالان و گۆڤارەکانیاندا بڵاودەبنەوەو ئەو فلیمانەی کە لەتەلڤزیۆندا دەیبینن سەبارەت بەرووداوی سەیرو سەمەرەو پڕ لە سەرکێشیی کە لەزمانی باڵندەو ئاژەڵەکانەوە بۆیان دەنووسرێ یاخود زادەی بیری خەیاڵیانەی منالانی دیکەیە.

کەواتە هیچ سەیرنی‌یە ئەگەر هەزاران کتێب و گۆڤارو فلیمی سینەماو تەلڤزیۆن ـ لەهەموو سووچێکی جیهانداو بەتایبەتی



وڵاتە پێشکەوتووەکاندا - بەبەردەوامیو بەبێ پچڕان سەیرت بەم تەرزە چیرۆکە خورافییە هەست بزوێنانە ببینین. هەروەها ژمارەیەکی زۆر دەبینین لە ناودارترین ئەدیبان و سایکۆلۆژیست و سۆسیۆلۆژیست و ماتماتیکیو فیزیکیو زانستی بۆشایی - علم الفضاء - کەلەبواری ئەدەبی منالاندا سەرکەوتوون و تیایدا لێهاتووبوونە، بەتایبەتی ئەوەی پێوەندیی چیرۆکی خەیاڵی زانستییەوە هەیە.

یاری کردن - بەهەموو چەشنەکانیەوە بەتایبەت خەیاڵییەکەی رۆڵێکی دیاری لەپەروەردەکردنی خەیاڵی - زانستیو نازانستی - لەلای منال هەر لەتەمەنێکی زووەوە هەیە. ئەمەو .. بێگومان .. جگە لەرۆڵی بینراوی یاریکردن لەپەرەپێدانی کەسێتی منال و گەشەدانی توانای ئەقڵییو تیژکردنی هەستەکانیان و زیادکردنی سامانی زمانەوانییان و راهێنانیان لەسەر یارمەتیدان و ناسینی جیهانی کۆمەڵایەتی و سروشتیی دەوروبەریان ، لەم گۆشەیەوە یاریکاریی منال هەر لەتەمەنێکی زووەوە لە باخچەی منالان و لەماڵەوە بەروونی دەردەکەوێ هەروەها سۆزیان پێدەدرێو بەبەردەوامی پێشنیاریان بۆ بکرێو، توانای مەددیو رۆشنبیریی پێویست و گونجاویان بۆ ئامادە بکرێ.

پێمان وایە ئەمە پتەوترین بنچینەیە کەوای لەزانایانی سایکۆلۆژیی منال بەتایبەتیو بایەخ پێدەرانی پەروەردەکردنی منالان کردووە کە هەمیشە بایەخی گەورەی شەترەنج لەلای منال دووپات بکەنەوە تا بوارێکی فراوانی بۆ برەخسێ بۆ برەو و گەشەپێدانی خەیاڵی.
هەروەها دەبێ منالان لەسەر ئەوە رابهێنرێن کەهەمیشە وریابن و توانای زیهنییان کۆبکەنەوەوبتوانن بەڵگە بهێننەوەو ئالتەرناتیڤی جیاجیا بۆ حاڵەتی گریمانی جیا جیا بدۆزنەوە.

لێکۆڵینەوەی مەیدانیو تێبینی رۆژانەی ئەنجامدراو ئەوەیان سەلماندووە کە منال لەکاتی یاریی خەیاڵیدا یاخود - بەشێوەیەکی تایبەتی - یاریی فیکریدا، زۆرتر جیددیو وریاتریش دەبێ کرنگی بە یارییەکە دەدا. هەروەها ئەوەیشیان روون کردۆتەوە کە زیادە رۆیی نییە ئەگەر بووترێ یاریکردن تاقە چالاکییەکی جیددییانەیە کەمنال لەمیانی ژیانی رۆژانەی ئاسایدا، هەر لەتەمەنێکی زووەوە، پرۆسەی دەکات . لەلایەکی دیکەوە یاریکردن تاقە چالاکییەکی کۆمەلایەتییە کە بوارێکی زیاتر بەمنال دەدا تا شارەزایی لەژینگە کۆمەلایەتیو سرووشتییەکەی هەبێت هەروەها زیادکردنی سامانی زمانەوانییو راهێنانی لەسەر یارمەتیدان و هاوکاریکردن و خۆبەستنەوە بەپێویستییەکانی ئەو یاریکردنە، هەروەك یاریکردن بوارێکی سایکۆلۆژیی ئیجابییە کە هەلێکی لەباری بۆ گەشەسەندنی توانای ئەفراندن لەلای منال دەرەخسێنێ بەرلە هەموویشیان خەیاڵ. ئەمە - بێگومان - جگە لەوەی کە یاریکردن هۆیەکە لەهۆیەکانی خۆخەریك کردن و تیژ کردنی هەستەکان و هەڵچوونی ناخ و چاندنی سیفاتی ئازاییو وریاییو بڕوا بەخۆبوون و هاندانی

هاریکاری یەکدیو خۆبەستنەوە بەو یاسا گشتییانەی کە لەیارییەکاندا پێڕەوی دەکرێن.

لەم گۆشەیەوە، یاری کردن، لەتێڕوانینی سایکۆلۆژیای نوێو پەروەردەکردنی هاوچەرخدا، لەناوەڕۆکدا، شتێکی دژی جددیات نییە یاخود چالاکییەکی زیهنیو ماسولکەیی بێهوودە نییە وەك هەندێ کەس وای تێگەیشتوون بەتایبەتی بەرانبەر بەمناڵ هەر لەتەمەنێکی زووەوە.

ئەوەی لەچیرۆکە خورافییەکاندا هاتووەو ئەوەی لە یارییەکانیاندا هەیە، لەلایەنی پەرەپێدانی خەیاڵی مناڵ، هەروەها لەهەموو بوارێکداو، لەپرسیارە زۆرو زەبەندەکانیشیاندا هەیە، بەتایبەتی ئەوەی سەبارەت بەکەسەکان و شتەکان و ڕووداوەکان و دیاردە کۆمەڵایەتیو سرووشتییەکان لە مێشکیاندا دەخولێتەوە. لەم حاڵەتەدا دەبێ تێبینی قۆناغی زووی پێگەیشتنی ڕۆشنبیرییان بکەین، هەروەها لەسەر ئەوە ڕایانبهێنین کەهەر لەسەرەتای فام کردنیانەوە بتوانن بگەنە وەڵامی ماقووڵ و بەجێی واقیعیو خەیاڵی لەتەك دانانی ئالتەرناتیڤی جۆراو جۆر بۆ شیکردنەوەی ئەو مەسەلانەی ڕووبەڕوویان دەبنەوە یاخود ئەوەی گەوران پێشنیاریان بۆ دەکەن، وەئەمەش دەبێ هەمیشە پەیوەست بێ بەئاستی پێگەیشتنی ڕۆشنبیریو زمانەوانییان لەلایەنی شێوازو ناوەڕۆك و موفرەداتی بەکارهێنراوو، دەبێ مەقسەدێکی بەرزی تێدا بێ کە هەوڵ دەدرێ بەدیبهێنرێ ، ئەمەو جگەلەوەڵام پێدانەوەیەکی دروستی پەرەپێدانی خەیاڵ و بەرزکردنەوەی بۆ ئاستێکی باڵاتر.

لەبواری هونەرە بەرزەکاندا، بەتایبەتی وێنەکێشان، لەلایەن پسپۆرانی پەروەردەکردنی مناڵاندا، هەر لەسەدەی ڕابووردووەوە، گوزارشتی توانای داهێنان لەلای مناڵدا بایەخی پێدراوە، گەلێ هەوڵی ڕاستەقینەو جۆراوجۆر دراوە بۆ دیراسەکردنێکی زانستیو سایکۆلۆژیی تیۆریو مەیدانی بۆ بەدیهێنانی مەبەستی زۆروزەوەندی پەروەردەیی. لەم گۆشەیەوە، دیراسەکردنی وێنەکێشان لەلای مناڵان، بەقووڵی ، خەیاڵ و بیرکردنەوەی ئەوان دەرك پێدەکا کەلەو وێنەیەدا گوزارشتی لێکراوە.

**تێبینیی ئەوەش کراوە کەئەو لێکۆڵینەوانە، سەبارەت بەوێنەی مناڵان، بەمەبەستی پەروەردەییو سایکۆلۆژیی، بەتەواوی باڵی بەسەر چالاکییەکانی دیکەیاندا کێشاوە، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ئەو وێنانەی مناڵان دروستی دەکەن بەڵگەن بۆ تایبەتمەندییەکانی قۆناغەکانی گەشەی ئەقڵیی مناڵ بەتایبەتی خەیاڵیان، جگە لەوەی کەئەمە فاکتەری چالاکیو خۆ خەریك کردن و ووردبینیو ووریایییە:**

لەم چوارچێوە گشتییەی ئاماژەی بۆکرا، ئەشێ هەوڵی (ڕکسی) لەئیتالیاو (هێربێرت ڕید) لەئینگلستان و (فریز) لەفەرەنسەو (لافبلر) لە ئەمەریکاو (ڤیکۆتسکی) لەیەکێتی سۆڤێت و (جان پیاوجیە) لەسویسرەو زۆری دیکەش کە ناکرێ لێرەدا ناوی هەموویان بەرین، شیبکرێتەوە. ئەوانە بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ یا ناڕاستەوخۆ لێکۆڵینەوەیان لەسەر ڕۆڵی وێنەکێشان لەلای مناڵان کردووە لەپەرەپێدانی خەیاڵیان و گوزارشت لێکردنیدا.

لەتەك گرنگی پێدانێکی تایبەتی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەکۆتایی سەدەی ڕابووردودا سەبارەت بەوێنەی مناڵان دەستی پێکراوە، بەڵام ئەم لێکۆڵینەوانە، بەشێوەیەکی گشتی، وەبەتایبەت شێوە کۆنەکانی، بەبێ پاڵپشتێکی زانستیی ـ بەگوێرەی پێودانگی ئێستا ـ شێوازەکانی بەکارهێنانی گەورانیان لەوێنەکێشە لێهاتووەکان ، بەشێوەیەکی میکانیکییانەو، بەبێ گوێدانە قۆناغی گەشەکردنی هۆش و هەڵچوون و جەستەو لایەنی کۆمەڵایەتییانەی مناڵ، گواستۆتەوە بۆ جیهانی مناڵان . لەتەك فەرامۆش کردنی خاسییەتە سایکۆلۆژییەکان لەلایەك و ، بەبێ دۆزینەوەی لایەنی خەیاڵ تیایدا بۆ پەرەپێدانیو بەرزکردنەوەی بۆ ئاستێکی باڵاتر لەلایەکی دیکەوە.

هەر لەسەرەتای ئەم سەدەیەی تێیدا دەژین، لێکۆڵینەوە سایکۆلۆژییەکان، بەتایبەتی لە ئەڵەمانیادا، بەهەوڵ و کۆششی ژمارەیەکی زۆر لەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر مناڵان نووسیوە ، لەپێش هەموویانەوە کارل بوهلرو گرینیە شارلون بوهلر،

[illegible] لێکۆڵینەوەکانی ماری منتسوری لە ئیتالیاو سوزان [illegible] ئینگلسان و توێژینەوەکانی کیزل لەئەمریکا، دەڵێن ئەم [illegible] (لەگەڵ جیاوازییاندا) بوونە هۆی کاردانەوەیەکی [illegible] بابەتەکانی وێنەی منالان ، ئەمەش ـ لەگەڵ زۆر [illegible] دیکەدا ـ بوونە هۆی ئەوەی کە ئەو لێکۆڵینەوانە [illegible] پێچەوانە بگرێت، هەروەك ئەمە لەبیستەکانی ئەم [illegible] ئەمسە لەلای سیزاك دا روویدا ، وازی لەمنالان [illegible] بەئارەزوو و میزاجی خۆیان و بەدەسپێشکەریی [illegible] نەیان وێنە بکێشن بەبێ بەشداربوون و پێشنیاری [illegible] ئەوانەی بەرپرسی پەروەردەکردنیانن.

[illegible] سپێشکەرییە خۆ بەخۆو تاکەکەسییە ـ بەنەزەری سیزاك [illegible] توانا خەیاڵییەکانی منالان ، بەبێ شێواندن و [illegible] لەلایەن گەورانەوە، پشتی پێدەبەستێ. ئەم [illegible] ـ بەشێوە پەرگریو زیادەڕەوییەکەی ـ بووە هۆی [illegible] ئاسەواری سەلبیو خراپ لەوێنەی خەیاڵییانەی [illegible] گوزارشت کردنەوە.

[illegible] هەموو وێك هاتنەوەیەی نێوان گوزارشت کردنی [illegible] ستانەو خۆرسکانەی منالان لەوێنەکانیانداو پێشنیاری [illegible] ـ بەبێ شێواندن ولەوتاندن ـ مەسەلەیەکی زۆر گرنگە [illegible] یەتی ئەگەر خاسیەتی قۆناغەکانی پێگەیشتنی [illegible] کۆلۆژییان لەبەرچاو بگیرێ ئەوەی کە ـ لەحاڵی حازردا ـ ئەم [illegible] بەشداریی پەرەپێدانیان کردووە: پیاجیە لەسویسرەو [illegible] لەیەکێتی سۆڤێیت و برونەر لەوولاتە یەکگرتووەکان، [illegible] سەرپەرشتی کارانی پەروەردەکردنی منال هەمیشە پێ [illegible] لایەنی خەیاڵیان دابگرن.

[illegible] سەبارەت بەوەی کە پێوەندیی بەخەیاڵی منالان هەر [illegible] مەنێکی زووەوە هەیە کاتێك کەلەچیرۆك و پرسیارو [illegible] یەکانیاندا گوزارشت لەخۆیان دەکەن. هەرچی ئەوەی [illegible] پێوەندیی بەگوزارشت کردنی خەیاڵیان هەیە ـ لەبواری ئەدەبدا [illegible] ئەتێ بڵێین بواری گوزارشتی ئەدەبی لەلای منال هەر [illegible] مەنێکی زووەوە لەگەڵ فێربوونی زماندا دەست پێدەکات [illegible] ئەمەش لەمیانی ئەو وشانەی بەکاریان دێنێو هەروەها ئەو [illegible] بووکەشووشانەی لەکاتی گوێگرتن لەمۆسیقاکەیدا چێژی لێدەبینێ.

**پاشان ـ** دوای ئەوەو لەسەر هەر ئەو بنچینەیە ـ لەرێگەی ئەو ووشە کورت و سادانەی کەمنال (بەدیالێکتی خۆی) فێری دەبێو گوزارشت لەهەست یاخود حاڵەتە دەروونییەکان و ئاوازی گۆرانییە شیعر ئامێزە خۆرسکانەکەی دەکات.

شایانی باسە لێرەدا ئەوەش بڵێین کە خەیاڵی منال لەکاتی چالاکیی رۆژانەیدا گوزارشت لەخۆی دەکات بەجۆرێك لەکاتی وێنەکێشان و گۆرانی ووتندا ئەو گوزارشت کردنە تێکەڵ دەبێت، بۆ نموونە ئەو کاتەی منال گۆرانیو دەڵێو ووشە ناسکەکانی دەڵێتەوەو کاتێك رووداوەکان یاخود رووداوە خەیاڵییەکان دەگێڕێتەوە ئەوەی پێوەندیی بەوێنەکانیانەوە هەیە، لەهەمان کاتدا منال وێنە دەکێشێ. لەلایەکی دیکەوە خەیاڵی منال لەبواری مۆسیقاو گۆرانیدا گرنگییەکی تایبەتیی هەیە ، بۆیە دەبێ بەشێوەیەکی تایبەتیو پەیدەرپەی چاودێری بکرێ.

هەر ئەمەش بوو ـ بەنەزەری ئێمە ـ بوو بەهۆی ئەوەی کە مەسەلەی خەیاڵی منال لەبواری مۆسیقادا (هەروەها لەگۆرانیو شیعری پەیوەست بەخۆی) ببێ بەبابەتی لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەلای زۆرێك لەپسپۆرانی وولاتە پێشکەوتووەکان، بۆ دابین کردنی ئەم مەبەستەش ـ بەباشترین شێوە ـ گەلێ دەزگای پەروەردەیی تایبەتی دروست کرا.

لە سۆنگەی گرنگیی مۆسیقا لەپەروەردەکردنی خەیاڵی منالدا هەر لەتەمەنێکی زووەوە (بێگومان لەتەك شوێنی دیاری مۆسیقادا بۆ تیژ کردنی هەست و ئارەزووەکانیان) وامان پێ چاك بوو، وەك بەراییەك ، کەمێك زیاتر لەسەر ئەم بابەتە بدوێین، بۆ روون کردنەوەی پەیوەستی بەتینیدا لەگەڵ بابەت و چیرۆکی خەیاڵی زانستیدا ، ئەوەی پەیوەندیی بەمنالەوە هەیە.

توێژینەوە نوێکان لەبواری سایکۆلۆژیاو پەروەردەکردندا ئەوەیان سەلماندووە کە ئەو مۆسیقایەی منال هەر لەتەمەنێکی زووەوە یەکەمجار لەرێگەی بیستنەوە وەری دەگرێو پاشدان لەرێگەی بەکارهێنان و پرۆسەدا، کاریگەرییەکی سایکۆلۆژیی قووڵی هەیە لە دروست کردنی کەسێتیی منال و تیژکردنی هەستەکانیو پەرەپێدانی ئارەزووەکانیو ووروژاندنی هەستە ناسکەکانیو گەشەپێدانی توانای داهێنان (بەتایبەتی لایەنە

خەیاڵییەکەی ئەگەر لەگەڵ گۆرانیی گونجاوو هەست بزوێندا بەراورد بکرێ).

**مۆسیقاش** ـ لەجەوهەردا ـ کۆمەڵە دەنگێکی هەڵبژێردراوەو بەشێوەیەکی دیاریکراو ڕێکخراوە، لەم گۆشەیەوە، هەموو منداڵێك دەتوانێ لەسەرەتادا خۆرسکانە ئەو دەنگانە هەڵبژێریو بەرێگەی تایبەتیی خۆی ڕێکیان بخات، مادامەکی مۆسیقاش ـ بەتەبیعەتی خۆی ـ هونەرێکە بەپلەی یەکەم لەسەر هاوتەبایی سێ پرۆسەی بەیەکداچوو کارلەیەك کەر وەستاوە، ئەو پرۆسانەش بریتین لە ـ ئاوازو مۆسیقالێدان و گوێگرتن ـ لەتوانای هەر منداڵێکدا هەیە کە بەرێگەی تایبەتیی خۆی ئاواز دابنێو مۆسیقا لێبداو گوێبگرێ لە چوارچێوەی ڕۆشنبیریی مۆسیقیی کۆمەڵەیداو ئەو ئامێرە مۆسیقییانەی دەخرێتە بەردەستی، ئەمەش مانای وایە کەهەر منداڵێك دەتوانێ ـ بەم یا بەو شێوە تا ئەم پلەو ئەو پلە ـ پرۆسیسی ئاوازدانان و مۆسیقالێدان و گوێگرتن ـ بەرێگەی تایبەتیی خۆی ـ بکات. کەواتە لێرەدا چەند شێوازێك هەن پێوەندییان بەئاوازو مۆسیقالێدان و گوێگرتنەوە نییە بۆئەو ئاوازانەی کە لەئامێرە مۆسیقییە ـ سادەو ئاڵۆزەکاندا ـ و ئەو دەنگە ئیقاعیانەی لەژێیەکانەوە دەردەچن کەهەندێجار دەبنە ئالتەرناتیڤی ئامێرە مۆسیقییەکان. هەروەك مۆسیقا ـ لەلایەکی دیکەوەو بەحوکمی سروشتی قەشەنگییەکەی ـ وا لەمناڵ دەکات، لەنێو ئەو کۆمەڵەی گوێ بۆ ئاوازێکی مۆسیقیی بەجۆش رادەێرن، بتوێتەوە. لەهەمان کاتدا لەنێو ئەو کۆمەڵەیشدا کە مۆسیقا لێدەدەن، لەتەك پارێزگاری کردنی بنەما کەسێتییەکانی خۆی، هەروەها مۆسیقا بەحوکمی سروشتی بەجۆشیو لایەنی هونەریی ئیستاتیکیی، مناڵ دووچاری بەختەوەریو وورەو خۆشنوودی دەکات بەتایبەتی ئەگەر ـ وەك ووتمان ـ گۆرانیی ناسکی لەگەڵدا بێت.

لەحاڵی حازردا ، گرنگیی پەروەردەی مۆسیقایی لەلای مناڵ هەر لەتەمەنێکی زووەوە، لەهەردوو ئاستی ناوخۆییو دەرەکیدا ، زۆر بووەو، بۆ ئەم مەبەستەش گەلێ کۆنگرەی نێونەتەوەیی بەستراوە، رێکخراوی یونسکۆو کۆمەڵەی نێونەتەوەیی بۆ پەروەردەی مۆسیقیی و ئەنجوومەنی مۆسیقیی جیهانی بەشدارییەکی ئیجابیو چالاکیان تێدا کردووە.

زۆرێك لەپسپۆرانی پەروەردەو سایکۆلۆژیاو مۆسیقا پێیان وایە کە ناکرێ هەموو مناڵێك فێری مۆسیقا ببێ چونکە ئەمە ـ بەنەزەری ئەوان هەر لەکاتی لەدایك بوونەوە پێویستیی بە «توانایەکی» سایکۆلۆژیی تایبەت هەیە: «توانای مۆسیقی» یاخود «گوێی مۆسیقی» بەپێی قسەی پسپۆرانی مۆسیقا.

ئەم راو سەرنجە ـ بەنەزەری ئێمە ـ بەم شێوە رەهاییەی، شتێکی ڕاست نییە، وەدەبێ ئەم سەرنجە دیاری بکرێ ئەویش بەڕوونکرد نەوەی جەوهەری یاخود سروشتی ئەو توانا مۆسیقییە.

پێم وایە ئێمە بۆ فێربوون و فێرکردنی مۆسیقا (هەروەها لەفێربوون و فێرکردنی وێنەکێشان ـ ـ پەیکەرتاشیو شیعرو ئەدەب و ماتماتیك) سێ ئاستی گەورەو دیارمان هەیە (لەتەك هەندێ جیاوازیی لەهەر یەکێکیاندا کەزەحمەتە بەسانایی دەست نیشان بکرێو بۆ ئێرەش گرنگ نییە) ئەم سێ ئاستە، لەبەر ڕۆشنایی زانستی هاوچەرخی مێشکدا ـ وەك پێمان وایە ـ بریتین لە : یەکەم ئاستی گشتیو هاوبەش کە لەهەموو مناڵێکدا هەیە (ئەوانەی کە بەهۆی تێکچوونی فەسلەجی لەمێشکدا دووچاری دواکەوتوویی ئەقڵی نەبوونە) ئەمەش بەشێوەیەکیتر وادەگەیەنێ کەهەموو مناڵێك دەتوانێ فێری مۆسیقا ببێ ئەگەر لەقووتابخانەو دەرەوەی قووتابخانەیشدا هەلومەرجێکی گونجاوو لەباری بۆ دابین بکرێو ئەگەر مۆسیقا بەتەواوی ببێ بەبەشێکی رەسمی لەپرۆگرامەکانی خوێندندا هەروەك چۆن وانەی مێژوو وجوگرافیاو هەموو ئەو بابەتانەی لەپرۆگرامی قووتابخانەدا دەخوێنرێن و ئەگەر مامۆستای چالاك و لایەنگر ئەو کەش و هەوایە خۆش بکات.

هەروەها ئەمە ئەوەش دەگرێتەوە کەهەموو قووتابییەك دەتوانێ چێژ لە مۆسیقا وەرگرێو گوێی لێبگرێو ، لەسەرەتادا بەئاسانترین شێوە بەکاری بێنێ، هەموو ئەمانە زۆر بەسانایی روودەدەن لەبەرئەوەی مێشکی مناڵ لەوپەری ئاستی نەرمیی فەسلەجیدایەو توانای وەڵام دانەوەی هەیە، هەروەها هەست یاخود هەڵچوون و ئەندێشەکانی لەوپەری پلەی نەرمیدایەو،

...ی مەسەلەکانی ژیانی ڕۆژانەو گیروگرفتە زۆرو ئاڵۆزەکانی ...

...ەمە، لەڕووی نەرمیی مێشکەوە، قۆناغێکی ناسکی ...ی ئەقڵیی منداڵە کەئەگەر ئەوپەڕی ئەو توانا ئەقڵییەی ...ترین شێوەو چاکترین شێواز بەکارنەهێنرێ، ئەوا پاشان ...ی مێشکی ڕەق دەبێ و ئەوسا چارەسەرکردنیشی ئەستەم ...رو بنیاتنانی بنچینەی پەروەردەی مۆسیقایی بەسەر ...جی

...م گۆشەیەوە دەتوانین بڵێین ئەوانەی کە مۆسیقا ...ی دەکەن (لەگوێگرتن و پرۆسەدا) لەلای گەوران لەکاتی ...دا فێری نەبوونەو بۆ ئێستاکەش تازە بەسەرچووە، نەك ...ی «توانای مۆسیقی» یانەوە. بەڵام ئاستی دووەمی ...ن و فێرکردنی مۆسیقا ئەوا تارادەیەك بەرزترو تەسکترە ...ستی یەکەم بەڵام لەسەر پایەی بنچینەی ئاستی یەکەم ...و لەخاسیەتە فەسلەجیو سایکۆلۆژییەکان ـ ئەوانەی ...ستی یەکەمدا باسکران ـ بەشداری دەکات.

...ستی دووەمەیش بریتییە لەئاستی فێرکردنی مۆسیقا ...ستی پیشەیی، واتە پاش ئەوەو لەسەر هەر هەمان ...ە فێربکرێن (هەر بۆ نموونە وەك فێربوونی مێژوو ...فیا) وەك پیشەیەك بۆ وانە ووتنەوە. ئاشکرایە کەمەرج ...ە مامۆستای مێژوو، مێژوونووس بێت (بەمانایەکی ووردتر: ...نییە شارەزای فەلسەفەی مێژوو بێ و بتوانێ ڕووداوە ...ییەکان شیبکاتەوەو هەڵیبهێنجێ و .... تاد) مامۆستای ...ش هەر بەو چەشنە، ئەگەرچی مەسەلەکە لەم حاڵەتەدا ...حی مامۆستای مۆسیقایە بۆ پرۆسیس و هەوڵدانێکی زیاتر ...ش ـ بەشێوەیەکی تر ـ مانای وایە کە فاکتەرە ...کەییەکانی قووتابخانەو دەرەوەی قووتابخانە کاریگەرییەکی ...ن لەم بوارەدا هەیە، زگماکی فەسلەجیش بەشێوەیەکی ...نەبێ، پەیوەندیی بەمەوە نییە.

بەڵام ئاستی سێیەم، بێگومان، لەلایەکەوە پێویستیی بە ...یەکی مێشکیی تایبەت هەیە (پەرەسەندنی بەرزی بەشی ...ەوەی دواوەی مێشك لەگۆشە نیگای پسپۆرانی زانستی ...کەوە) هەروەك لەلایەکی دیکەوە پێویستیی بەدەوروبەرێکی ڕۆشنبیریی مۆسیقیو ئارەزوویەکی ڕاستگۆیانە هەیە لەبواری مۆسیقادا، ئەوەی کە دەبێتە هۆی ئەفراندنی تیۆرییە مۆسیقییەکان و بەرهەمهێنانی کاری مۆسیقیی ڕەسەن.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی باسمان کرد ، دەتوانین بڵێین لێرەدا پەیوەندییەکی بەتین و ئاڵوگۆڕ هەیە لەنێوان شێوە جیاجیاکانی گوزارشتی خەیاڵی منداڵ لەبواری ئەدەب و هونەردا، خەیاڵی ئەدەبی.

بەمانایەکی تر: منداڵ بیری بۆ هەموو جۆرە خەیاڵێکی هونەریی ئیستاتیکی دەچێ، بۆیە دەبێ هەموو بارێکی ژینگەیی گونجاوی بۆ دابین بکرێ بۆ پەرەپێدانی خەیاڵی ئەدەبیی و هەروەها لەناو خێزان و قووتابخانەو ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و تەلفزیۆن و ڕۆژنامەو ئێستگەو سینەماو شانۆدا گەشەی پێبدرێ ، چاکتر وایە لەماڵ و لەقووتابخانەو دەرەوەیشدا ، ئەگەر بکرێ ، هەندێ پیشانگای سادەیان بۆ بکرێتەوە بۆ کارە هونەرییە جۆراو جۆرەکانیان، هەمیشە ڕێنوێنی بکرێن و هان بدرێن بۆ کۆششێکی هەرچی زیاترو گوزارشت کردن لەشتە شاراوەکانی ناوەوەیان و هەست و هیواو زاڵ بوون بەسەر هەلومەرجی سەخت و ڕاستکردنەوەی هەڵە، هەروەها چاکتروایە پێشبرکێی ئەدەبی و هونەری لەنێوان منداڵاندا سازبکرێ و هان بدرێن بۆ بەرهەمەکانیی سوودبەخشانەو کاری بەکۆمەڵ و، لەبەر ڕۆشنایی پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتیدا سەیری کارەکانیان بکرێت.

ئەمە پەیوەندیی بەگوزارشتی خەیاڵی ئەدەبیی منداڵەوە هەیە، ئەوەیشی کەباسمان کرد لایەنێکی ئەدەبی چیرۆکی خەیاڵی زانستیو جیهانی منداڵانە، بەڵام لایەنەکەی دیکەی بریتییە لەخەیاڵی زانستی تێکنۆلۆژیی بەپلەی یەکەم، لەتەمەنێکی زووی ژیانی منداڵدا خەیاڵی منداڵ لەبواری تێکنۆلۆژیادا.

کە لەگەڵ قۆناغی گەشەکردنی ڕۆشنبیریی منداڵدا ڕێك بێتەوە) جێگایەکی باش لە ژیانی ئێستای منداڵدا دەگرێ، هەروەها بۆ دوارۆژی ژیانیو، لەدوایشدا و لەسەر هەر ئەو بنچینەیە بۆ ژیانی کۆمەڵگە، ئەم خەیاڵی تێکنۆلۆژییەش، هەر لەتەمەنێکی زووی منداڵەوە، لەیارییەکانیان (لەقۆناغی باخچەی منداڵان)و

لەماڵەوەیشدا گوزارشت لەخۆی دەکات لەشیکردنەوەی ئامرازە تێکنۆلۆژییە سادەکان ، بۆیە دەبێ هەردەم ڕێنوێنی بکرێن بۆ چاککردنەوەی ئەو ئامێرانەی لەکاتی بەکارهێنانیاندا تێکدەچن. لەم گۆشەیەوە بایەخێکی پەروەردەیی گەورە لەسەرپەرشتیکردنی گەوران بۆ چالاکییە تێکنۆلۆژییەکانی منال و ئامرازە تێکنۆلۆژییە ئاڵۆزەکان (بەپێو دانگی ئاستی پێگەیشتنی ڕۆشنبیری یان) دەردەکەوێ، بێگومکان ئەمەو جگە لە بەردەوامی پێدانی ئامرازە تێکنۆلۆژییەکان و پارێزگاری کردنیان و فێربوونی هونەری بەکارهێنانیان.

بەنەزەری ئێمە ئەو یارییە تێکنۆلۆژییانە لە پێشترە کەمنالان بە کۆمەڵ هاوبەشی تێدا بکەن و لەسەر ئەوە ڕایانبهێنێ کە بە گوێرەی توانا کاری بەسوود ئەنجام بدەن و ئارەزووە تێکنۆلۆژییەکانیان هان بداو پەیدەرپەی خەیاڵی تێکنۆلۆژییان پەرە پێبدات.

بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەمەش بەباشترین شێوە، دەبێ ئەوانەی لەناو خێزان و لە قووتابخانەدا سەرپەرشتیی پەروەردەکردنی منال دەکەن، لە ڕێگەی ڕاگەیاندن و دەزگا ڕۆشنبیرییەکانەوە پێکهاتووی ئەو ئامێرانە ڕوون بکەنەوەو (لەگۆشەنیگای منالەوە) هەڵوەشاندنەوەو سەرلەنوێ پێکهێنانەوەی بەتێروتەسەلی باس بکەن، ئەمەش دەبێ بەبەڵگەو پراکتیکەوە بێ نەك تەنها بەقسەو تیۆری.

هەموو ئەمانە پێویستییان بەوە هەیە ئەوانەی لە خێزان و قووتابخانەو لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا سەرپەرشتیی پەروەردەکردنی منال دەکەن، شارەزاییەکی تەواویان لەتایبەتمەندییە سایکۆلۆژیو فەسلەجییەکانی هەموو قۆناغەکانی گەشەکردنی منال هەبێت (دەربارەی ئەم بابەتە لە کتێبی- چەند ڕایەکی نوێ سەبارەت بەشیکردنەوەی سروشتی منال و پەروەردەکردنیدا- بەدرێژی دواوین) بەمەرجێك هەمیشە ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کەمنالان جیاوازییەکی زۆریان لەنێواندا هەیە تەنانەت لەیەك قۆناغی گەشەکردنیشدا، هەروەها منال خۆیشی لەهەر قۆناغێکی گەشەکردنیدا دەگۆڕرێ ئەگەر چی چەند لایەنێکی هاوبەشی تێدایە کەنابێ چاوپۆشی لێبکرێ.

ئەو لێکۆڵینەوە سایکۆلۆژییە هاوچەرخانەی کەپشت بە زانستەکانی مێشك دەبەستن ئەوەیان سەلماندووە کە منالان لایەنە هەڵچوونەکانی تیادا زاڵترە، دەبێ تا ئەوپەڕیو بەباشترین شێوە سوود لەم لایەنە ببینرێ بۆ گەشەدانی خەیاڵی زانستیو ئەدەبییات لەتەك ئەدەبی چیرۆکی خەیاڵی زانستیدا. خەیاڵی منال هەر لەتەمەنێکی زووەوە، لەرێگەی توانایەوە، بۆ پێکهێنانی پێوەندیی زیهنی نوێ (کە لە گۆشەنیگای گەورانەوە نامۆو نەزانراوە) لەنێوان شتەکان و دیاردە زانراوەکاندا، خۆی دەردەخات. واتە منال دەتوانێ وێنەی زیهنی خەیاڵیی جیاجیا پێك بێنێ، هەروەها هەستی ئەو دەربارەی شتی ماددی پەرت و بڵاو، خەیاڵی منال بەسادەییو ساکاری دەست پێدەکات پاشان ووردە ووردە ئاڵۆز دەبێو لەئاست واقیعە هەست پێکراوەکەدا بەرز دەبێتەوەو پاشدان جیاوازویی لەگەڵدا دەبێ لەمیانی زنجیرەیەك تەکان و هەوڵدانیدا تا دەگاتە بالاترین قۆناغی گەشەکردنی.

**ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خەیاڵی منال سەر بۆ پرۆسەی گەشەکردن و پێشکەوتنی لەش و ئەقڵیدا دادەنوێنێ هەروەها لایەنی هەڵچوونی، زمانیش لەلای منال لەگەشەپێدانی خەیاڵ و پەرە ئەستاندنیدا هەر لەسەرەتای فێربوونیەوە بەکەمجار لەرێگەی قسەکردن و پاشان لەرێگەی نووسین و خوێندنەوەوە، ڕۆڵێکی بنچینەیی هەیە. پاشان و لەسەر ئەو بنچینەیە بەتایبەتی زمانی مەجازو خواستن و کینایەو ئەوانی تریش.**

لەم حاڵەتەدا دەبێ خەیاڵی ئەدەبیی منال بەتایبەت لەبواری تێکنۆلۆژیادا پەرەی پێبدرێ، ئەمەش بەزۆربوونی پێویستییە ڕۆشنبیریو ماددییەکانی وەك کتێب و گۆڤارو ئامێرە تێکنۆلۆژییەکان دەبێ هەروەها سەرپەرشتیکاران لەماڵ و لەقووتابخانەو دەزگاکانی ڕاگەیاندندا.

**سەرچاوە:-**

★ د. نوري جعفر- ادب قصص الخيال العلمي وعالم الاطفال- منشورات دار ثقافة الاطفال- الطبعة الثانية- بغداد - ١٩٨٧.

# بڕوام به دڵداری وایه!

ئەگەر بێتو بەفرو سەهۆڵ
لە ڕووی زەوی بتوێنەوە
کانیاوەکانی تەختی دۆڵ
وەکو گڕکان ....
بتەقنەوە بەرەو ئاسمان
فرمێسکی چاوی شادومان
لە خۆشیا بە ڕامووسان
بسڕێنەوە ....
گشت ناوەزێ بزێنەوە
هەورەکان خڕ ببنە باران
لافاو بەپڕتاو هەڵستێ
چەپەرەکان بکرێنەوە
ببنە جۆگە ، ببنە ڕووبار
ببن بە جۆشی ئەو حەزەم
ببنە تام و چێژی مەزەم
بکشێنە خوار ....
بۆ ڕۆخ چەمی دڵ هەویستی
بۆ ناو دەریای خۆشەویستی
بەو خودایە ....
خۆشەویستیم بۆ نیشتمان
ئاگری دە دڵ بەردایە
بڕوام وایە ....
لە حەزی من و ئەو لەیلایە
خاکی بنی ئەو دەریایە
تۆزی ووشکی لێ هەڵبستێ !!!

جەلال مەدحەت خۆشناو

٢٥ ـ ١٠ ـ ١٩٨١
هەولێر

# «ئەڵاوەیسی»

حەسیب قەرەداخی

دەگێڕنەوە دەروێشێ بوو خۆف عیشقی لە دڵا بوو
قەتار لە دەشتی گەرمیانا، وەکوو سمڵ لە گڵا بوو
ئەڵاوەیسی زادەی بەهرەی ئەو دەروێشە دڵپاکە بوو
وەکوو ئاوی رەوانی گیان تێکەڵاوی ئەم خاکە بوو

**پێشکەشە بە یادی دەروێش ئەڵاوەیس،**
**بە هونەرمەندی بە توانا ئەنوەر قەرەداخی.**

١) من دەروێشەکەی دنیای ئەڤینم
هەمووشت وەچاو دڵم ئەوینم
لە بوتەی عیشقام. پێش توانەوەم،
گەلی عاشقان بێنە سەرینم.

ئەمرۆ جەژنی عیشق و خەمە
وەلی شێخی کاکە مەمە
دەروێشەکان بێن ببەستن
کۆری زیکری ئەویندارِی
پایز وەرزی خەزانم بوو
لەگەڵ فرمێسکا داباری

٢) «دەروێش ئەڵاوەیس پڕ قەبرت نووربێ
قەبرت لە ئاگر جەهەننم دوور بێ»
گۆڕەکەت: مەزرای سۆزی عاشقان
پڕ لە گوڵاڵەو شەوبۆو چنوور بێ

ئەمرۆ رۆژی جام و مەیە
مەزەم سێوو نوقڵ و بەیە
لە مەیخانەی کووچەی ئێمە
لە فەیزی گیانی جوانانە
هەرچی هەبێو هەرچیش هەیە

٣) کە بورکانی دڵ دەتەقێتەوە
بەرەو کەشکەلان هەڵدەسێتەوە
باسێك نامێنێ لەناو مەجلیسا
هەر باسی عیشقە نابڕێتەوە

چاو جوانەکەم، کەی دێتە کۆر،
دڵی دەروێشان خۆشبکا،
لە کووپەی ئەم عیشق و خەمە،
قومێ لە جامێ نۆش بکا،

٤) دەروێش ئەڵاوەیس، پیرۆزە یادت
سۆزی ئێزەدیی دەرونی شادت
لە توێشووی خەمی دەروێش مەشرەبێ
هانێ، مەویژێ بۆتامی زادت

کوورەی ناخم تاو دەسێنێ
ئەندێشەی نوێم بۆ دەهێنێ
لەم گەردوونە بێ پەیەدا..
ئەنجام عیشقەو هەر دەمێنێ

٥) وێنەی یاری خۆم وەدڵ گرتووە
پەنام بۆ سیحری کوردی بردووە
بەستەم لە سۆزی دەروێش ئەولایە
ئالآی (مەسوور)م بۆ هەڵکردووە

خڕبنەوە هاو دەردەکان
ئازار کۆڵی گرانمانە
ئەوین چرای ڕێگەو بانە
مەسیح کاتێ پێغەمبەرە
کەخاچی خۆی لەسەرشانە

٦) هۆ دڵدارەکەی ئەم وەرزو دەمە
پەیامت زینەو قیبلەیشت شەمە
بچۆ لە خەڵوەی بادە نۆشانا
با بیکەن بەویرد سۆزی ئەم خەمە

خڕ بنەوەو کۆڕ ببەستن
دەست لە گەردنی یاری جوان
مەی دێرەکان بۆ دەنگ نییە؟،
چۆپیگران، لە کوێن و کوان؟
ساقی بە سینیو جامەوە
شاعیر بە شیعرو زامەوە
سروشت بە سوبح و شامەوە
حکایە تخوان لە بەرزایی
بە دەفتەرو کەلامەوە
چاو جوانەکان.. دەردەکەمە
دەسا وەرن بە لامەوە.

# گەو..

بەهزاد عبدالقادر

بارە کەرێکی کوێستان بووی
لە کولەکەی دڵەکەمدا: گۆشم کردی
بە خوێنی جەرگ، دەنووکی ئاڵم سوور کردی..
ڕۆژان هاتوو
ڕۆژان ڕۆیی
لە گەرمیانی هەناسەمدا..
لەنجە بووری، قاسپەی هێمن بووی
ڕۆژان هاتوو
ڕۆژان ڕۆیی
تەوقی کاڵی گەردنەکەت
هێشتا خاڵ بوو..
کەوتمە گریانی بێ تۆبی..
ئەو ڕۆژانە ساتم لێ دەبوو وەکو ساڵ
بەو هیوایەی..
بە جووت بدەین لەشەقەی باڵ
بۆ شاخێ سەوزەی لاپاڵ
بۆ گۆشەیەك، شەونم ئاسا..
بم شواتەوە بای شەماڵ..
کەچی لەپڕ هەر ئەو ڕۆژەی باڵە فڕ بووی
هیچ شتێکت لەبیر نەما
ئەو سۆزو نازەت بەجێ هێشت
تاڵاوی دونیات بەمن چێشت
کەوەی ئازیز..
پەروەردەی دڵ و جەرگ و سیم
لە دووریتا گەر بشسوتێم
هیچ دەربەست نیم
ڕەنج بێوەر نیم
تۆ ڕۆیشتیو سەفەرت خێر..
وەلێ وادە دوای کۆچی تۆ..
نەڵێم ئۆغر
ئەی خانمەکەی بەعیشق نامۆ.

# شێلکەکا بەرتفکان

اسماعیل طه شاهین

(١)

پارزوونێ وەغەرا من
دلێڤان رە نالە نالە
خیالا من،
پشتی بێنا ئاخێ تێ چوی
گەردەن زمران هێلا ڤالا
جهای گەردمنان بئالیست
زمرمەمکان پیرۆزکت
ل وارمکی تێربیستان
ل بەژنەکا..
تەنێ شینکاتی فیســـتان..
خوە ئالاند!!
کەربەکا..
ئەورێن کینێ پێدە شۆر
ب سەر مندە خوە بەردا
نە رمز هێلان
نە بیستان
شۆخا کۆپێن چیا کۆڤ
تازی کر
هێلا بێ فیستان

(٢)

سەرکێشێ ژمنگارا سالان
یەکێ تەکی تەنیایە
دوقشکێ وی،
قرێژا دمست و لەپایە
پێ چێ دبت
ئەسمانان ب ئەور بێخت
پێ چێ دبت
ب سەرێ تلێ
قر کرنێ ل دار بدمینت
مرنێ دبەردە رائێخت!!
ل بانێ بلند
ئەورە.. ئەورە
ئەسمانەکی چیلەق سایی

دسەر مەرە نەبوو کەپر
ئەڤە سەرێ چەند سالانە
پەشکەکا رەحمی نەباری
زکێ رۆژ و مەهـ و سالان
هندی دبینم ستەورە!!

(٣)

خوەشڤیا من!
من پێ خوەشە ببمە بەفر
دا ب سەر کۆفیکا تەدە
شەڤکێن کانوونێ ببارم
دەست گەردەنی تەببم
کۆپێن سەرئەڤراز هلکشیای
بکمە راژێر
بکمە باژێر
بهنگێڤم
دار و بەران لێك ئاشناکم
دا ب ناڤێ ڤەژینێ
مۆرکا خەوێ
ژ سەر سنگی تەیێ هلدای
قەپەچەکم[١]
بەرسنگێن رۆژ نەدیتی
رووباری رۆژەکا گەرم
ل بەر هەتاڤێ ڤەکم
ئەز وەناکم
دبن چەنگێ تارییێ ڤە
گول نخوون بن
کراسێ بووکینی یێ سەرکەل بینن
ئەز وەناکم
ئەز وەناکم
هەر بێنەکا (٤)
رکەها سنگێ م بەردت

کۆڤان پێڤە ریشەلۆکن
لەو ساوێرێن شەڤ نەچاڤە
هەلما بژوون و پاقژ..
ژ سنگێ من دەرکەڤت
وەناکن هیڤییەك ئاڤا،
ل سنگی وان ببتە چکلۆك[٢]
هەر بێنەکا بالەفربت،
بەر پێ رەڤت
وەناکن
لێڤێن هشك و چرمسی
ددەریا پەیڤان خوە بێخن
وەناکم پەیڤ..
کراسێ تارییێ بێخن
وەناکن....
وەناکن....
چاڤان نڤستن ل دەردا
هەلما بژوون و پاقژ..
بوو پشکەك ژ بایێ ڤەردا[٣]
ساوێر بهێلن نەهێلن
چاڤێ رۆژا هیڤییان
وەختە شەڤی هلچنت
وەختە کۆڤانان دارپیچ کت
وەختە ببتە دەنگ ل ڤەردا
: رۆژێ شاخ دانە بن شەڤێ
دێوان چلخانە بەردا!!

١٩ / ١٢ / ١٩٨٨

**پەیڤێن گران**

**قەپەچە کرن** : اختطاف

**چکلۆك** : هەر تشتەکێ ژ بۆ ئەگەرەکێ بێتە چکلاندن (شاخص)

**ڤەردا** : ڤارا؛ ڤان دەردا . ژ (ڤان) + (ئەردا) پێکهاتییە

# وەرزەکان چاویان ئەڕێژن

محمدأمین پێنجوێنی

**کلدان**

هەردوو چاوم هاتوونە ژان
کز ئەسووتێن وەك بزووتی
ژێر رەشماڵی خێڵە رەوەند
نەما (حەکیم) داووە دەرمان
من پەلی بۆ نە هاویژم ...
راخەرم درك و پەیکوڵە
سەرینیش وردە شووشەی تیژ!!
بۆپەشمینم چەرمی ژیشك بە ئاواژوو!!
وتیان : چاوت بڕێژە بە (کل)
شیفات بۆ دێ درەنگ.. یا زوو!
کلتوورێکیان لەبۆ هێنام
پرتەقاڵی !
سەرنجم دا ...
مەمکەکانی دەزگیرانم خۆشکراوە
وەکو پێستەی دەباخانە
بەو خاڵەی بە گاز بۆم کوتا!!
بە هەوەسی هەرزەکاری
ناسیمەوە
کلچووکێکی سەدەفینی باریك و لووس!
ئێسکی ئەنیشکی کچێ بوو
داتاشرا بوو
وەك چلوورە ... !!
دەرمانەکەش
خۆڵەمێشی سووتووی دایکم ... !!
وا هارابوو
ئەت وت باروتی تا پرە!!

★ ★ ★

بە یەك دوو ژەم
ژانیان شکا.. تەسکینم هات
کەچی چاوەکانم کوێربوون
چونکە بەم دەرمانە فێربوون!!

**« بۆران پێچ ...**

کریوەی خێو راوی ئەناین
هەراسان و هەناسە سوار..!
ئەشکەوتێ چارەنووسمان بوو!!
سەرما وەکو (هینی) هەلاج
هەڵ لەرزینی پێمان بەخشی..
دانە چۆقە وەك برێشکە!
دوو بەردم خێرا لێك خشان
گر گرپەی‌کرد
پەلم کوتا بۆ کۆتەرە بۆ چڵۆسکێ

ئەوە باسکی مندالێکە!
بە دەستمەوە بووە بە چیلکە!!

**« کەماڵ »**

دوو گەماڵ پێکرا هەڵپژان
بوو بە هەرا ڕۆمەڵ خەزا ...!
تەپوتۆزی گەردە لوولیان
وەك منارە ڕۆیی‌یە ئاسمان!
کە چوین ئاوبژییان بکەین
سەری منالێکی حەوت ساڵە
خڕ کاڵەکی زرکەتاڵە ..!
لە ژێر کەڵبەی زلەکەدا بوو
دیارە ئەریتی (هێز) وابوو.

**« چالە بەفر »**

گەرما وزەی لێ بری بووین
قورگ برینگ، زمان پەلاس
لە گۆ کەوتین
بە گاگۆڵکە پرمان دایە چاڵە بەفرێ
لە پێ کەوتین
بە چنگ بەفرمان هەڵ کۆڵی
کەنـواریمان

دایك و دوو منالی ساوا
لە ژێر باڵا ...
وەکو پەپکەی مریشکە بەکڕ!
بووبوون بە یەخ!!
ڕەچێنرابوون بۆ پاشەرۆژ
لە ناو فرێزەری سروشتا
بە هەرەسی تووشی زستان... !!

# ■ پەتا ■

**سەعدوللا پەرۆش**

**خولیا...**
**خولیا..؟**
**خولیا..!**
**خولیا..!**
**پێشینە گوتەیە**
**فەرمودەی پیرانە**
**خولیـا بیـابـانی ڕۆحـان بە پەتـای لم،**
**لی تاسە دادەپۆشێ‌و کێوی**
**سەرانیش بەتەمی خەونان بەسەر دەکاتەوە!**
**شکاریش خولیایە..**
**خولیایێ.. تا ئەژنۆ شنگیان لەبەربێ**
**پێدەشت و کۆساران ،**
**دەوەن .. دەوەن و بەرد بە بەرد بە خولیا زەدان تەی دەکا!**
**ئا، شکار خولیایە.. خولیانی قەدەری کەللەو ڕۆح**
**وەلێ ئاخ بەپیری ئەم خولیا دژوارە**
**دەچێتە توێکڵی خەونێك و**
**شەوانە دێتە بەرئاوێنەی ئەندێشەو سپێدە**
**وەختانیش ، ئاخێکی زۆر ساردتر لەبەفر ئەسپێرێ بەسینە**

★★★

**تۆیش جاران خولیای ڕاو**
**بەردەوام بەرەو ڕێی نادیار پەلکێشی دەکردی**
**ئەوێستاش کە پیریت ، غەریبیت بۆ ڕاوی نێچیری قەد کێوان**
**پەیمانەی عەزرەتی جارێتر شکارت ..**

لەتاسەی خەونێکا دەنێتە سەر لێوان
پەك كەوتەی وریابە
لەو کوێرە شەوانەی کە بەفر دادەکاو ڕەنو دێن !
شوێن ڕەوتی نێریان هەڵنەگری !
کەنەفتی، لەڕەنوان گیر دەخۆی
گێژەنی زریانت تێوەردێو وەرێیان ناکەوێو
دڕندەیش ، شەوبینن ،کێوەڕۆ..
لەبرسان سەرادوی تارمایی خۆدەنێن
بەزەین پێخوستی نێچیران بەلیکی خورێنی دەدێرن
دڕندەن ،

دڕندەیش لەم توشە شەوانە وشك و تەڕ نابوێرن پەتایە

پەتایە
پەتا..

خەونێکی نابەڵەد بەهانی سۆراخان
کەوتۆتە کەمەندی ئەفسونی کەم شەوقە چراخان!
مخابن ، شەوانی ئەم دەرەیش درێژن ، پەنجە چاو
هەڵایسێن .. هەیوەشەو.. بینایی ئەستێران
بۆخەونێ نامۆیەو نابەڵەد، هی پیران
خەونێکە چڵ بەچڵ بەرداری خەیاڵی ڕاوچیە پیرەکان هەڵدەچێ
شکارچیش، بەپیری هەر تەنیا لە شەودا..
هەوەسی شکاریان لەدڵدا دەبزوێ!
تۆ خەونە نابەڵەد !.
کە هێشتا دوو دڵی لەسێرەی پەیکانی ناگەهان
بەکوێری بەرەو کوێ؟؟!
ئێرە پەرەمۆدایە پەرەمۆدا
سوچێکی هەڵدێرەو ترسناك ، گۆڕا مێز
دووەم سووچ دەریایی بەبێ بن
ئەوەتا سێیەمیش چیایە،
چیایی تاکەللە گێژدەخوا بڵندەو بڵندتر
دیۆجین لێرانە چراکەی خامۆش بوو
★★★

کریڤنۆ.. لەمامی خۆو کەوی
تاشنگ و لەبەرە..

تا وەك من پیریەتی نەخزاوتە ئێسقانتان
خۆ بۆ ڕاو.. بۆ شەڕی نێچیران تەیارکەن
لەبۆرە مەیتەران ڕاخوڕن
هەنگامی شکارە..
مرازو دانەیی گەوهەرە لە گەدەی نێریی
نێریی سووکە ڕۆ .. لاتەریك .. گەڕیدە!
نێریی لەوەتەی کێو هەیەو شکارچی پیادا دەشاخێن
کەوڵی خۆی ئەم پەناو ئەو پەسێر پێدەکا
تا نەچاو دیمەنی مۆمیا کاو

نەسێرەیش تەوێڵی بنکێوێ
کریڤنۆ ..دەی ڕستی تانجیان بەر هەڵدەن
شوێن سمی گۆڕینە سواران هەڵگرن
نێرییە گەوهەر دز
وەك عیشقی کیژۆڵە قەرەجان .. کێویەو دەستەمۆ!!
کە دێتە بەرەمەودای سێرەتان لە مەیلی بێکانی پەشیمان دەبنەوە
کاتێکەلەمەرزی پێکانیش دەترازێ..

بێهوودەشوێن ڕەوتی هەڵدەگرن

★★★

هۆ نێریە گەوهەر دز
دەستانم دامێنت.. لەکەلی شەیتانی دابەزە
لەو عومرە زیاتر ڕۆحی خۆت پێ مەلاس نادرێ
هەنگامی شکارەو تەوێڵی نێچیران
بەگەڵی لەشەوقی چرایان روونترن!!

تێبینی:ـ دووای پاك نووس کردنەوەی ئەم شیعرە بۆم دەرکەوت کە هەندێ کارتێکردنی شیعری (زندە خەون)ی برای شاعیرم (نەوزاد رەفعەتی پێوە دیارە .. بەلام بڕیارم دا وەکو خۆی بلاوی بکەمەوە چونکە کارتێکردنی بەمەسەلەیێکی ئاسایی دەزانم لە ئەدەبدا . بەمەرجێ نیاز پاك بێ

ـ١٩٨٩ـ

○

# رازێکی بێ گەرد

بکر غریب فرج

ئەی نەتان ووت
سینگی ووشە
بەقەد قەندیل و سیپانە
هەرگیز چاوی نەترساوە
لەم ژیانە

ئەی نەتان ووت
شعر نانە
شعر ئاوە
تەنیا شعر بوو لە مێژوو
نە چەماوە

ئەی نەتان ووت
شعر ئاوێنەی بێ گەردە
دەنگ دانەوەی
دڵدارانی
چۆڵ و هەردە

ئەی نەتان ووت
تەنیا شعر ئاوێنەیەکی
زۆر پاکە
هەرگیز درۆ
لەگەڵ دەوروبەری ناکا

ئەی نەتان ووت
ئەی نەتان ووت

ئەی نەتان ووت
مێژوو پەڕێکی سپییە
هونەر پەڕێکی سپییە
رازی سەدان
(مەم) و (فەرهاد) و (دێوانە)ی
لە باوشی خۆی گرتییە

ئەی نەتان ووت
چوار چێوەی تابلۆ دادگایە
گۆرستانی هەزارەها
شاهنشایە

# بەڵێ ... بەڵێ

فاتح بێلان - کۆیە

راستە «جوانی» کاریگەرە...
دڵ بزوێنە
گەلێ جار مرۆڤ ئەخاتە
ناو باوەشی،
زیندە خەونی پڕ لە چێژو...
خەیاڵی قوڵ و بێ وێنە.

* * *

جوانی ئافرەت،
هی باخچە گوڵی رەنگاو رەنگ
هی هەر شتێ،
لەناو جەرگەی بوونەوەردا
لە کاتێکا...
کە بەرەو رووت ئەبێتەوە
زۆر جار بە ئەسپایی و بێ دەنگ
دڵ پڕ ئەکا،
لە هەنگوینی خۆشەویستی
وەك شانەی هەنگ

* * *

بەڵێ جوانی ...
جوانە ، جوانە
بە بێ جوانی،
دنیا وەك تاریکستانە
بەڵێ وایە ... بەڵێ ... بەڵێ...
بەڵام ئاخر،
لەگەڵ ئەوەش
وەك «هێمن»ی مەزن ئەڵێ:
(ژیان هەواو هەوەس نی یە
جوانی بەتەنێ بەس نی یە)

«هێمن» مەبەست «هێمن»ی شاعیرە

# ئاگری گریان

حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ

گریانی دڵ،
ئاهوو ناڵەی ڕۆژگارێکی تفتو تاڵە
هەرچەند نیگای چاوی ماندوو ..
بۆ نەشتەری نیگەرانیی سەری قاڵە ..!
«١»
ئێستە. نە وادەی گەڵاڕێزانە
نە گرمەی هەورەو نە قرچەی دووکەڵ
«ئەشق گینگڵ ئەخوا ، وەرزی بارانە»
ئێستە ، نەوادەی نەعرەتەی کۆچەو
ئەروح کێشانە ..!
قوڵپی سۆزی دڵ ،
هێشتا دەروێشی زامی برینە
وەرزی بارانەو
چیای «موحیبەت» تا ناوقەد شینە !
هێشتاکە هۆرەی شمشاڵی دەستم
زمانی لاڵەو
ئاهوو نزوولەی دەنگم دەرنایە
وەرزی ژووانەو ..
هێشتا ئاوازی چریەو گۆرانی
زۆر بێ مەودایە ...!

. پیرۆز بێ سەفەر !
ئەگەر دڵنیای ، برۆ کۆچ بکە ؛
با مەلی ئازار بۆ تاهەتایی
بەستەڵانی نێو دەروونی گەرمم
بێوەی تەی بکا !
با شەپۆلی سۆز ،
تەناری شەوی حەزی تەلبەندم
بەکەفو خوڕەم زیخو چەو ڕێژکا !
بە ئاسوودەیی ، برۆ کۆچ بکە ؛
بۆ ژانێکی تر ،
بڕژێتە دەریای ئەشکی تەنیایی
پڕ حەسرەتەوە !
با زەریای سەفەر
ڕووباری هۆشی من بخواتەوە
— برۆ کۆچ بکە
با لە گریانا .. سەری دەروێشم
«زیکر»ی شەوانی
ئومێدو هیوای تیا بژێتەوە ..!!

برۆ کۆچ بکە ، وەلێ پاش سەفەر
زۆر بە هێمنی .. بێ خوڕەو گریان
حاوی تەمەنی ،
یادگاریو ئەشقی من دەربهێنە
تەمامی درکو
چرۆی هەڵاڵەی شیعری جوودایی
لەبێ سرەوتیی خاکی دەروونی منا ، بروێنە ...!
«٢»
بەرەو کوێ ئەرۆی !؟

قەت باوەڕ ناکەم ، دایکی ئازیزت
هێندەی ئەم دڵە پڕ سۆزو میهرە
نازی کێشابێت ..
«دڵێ کە بۆ تۆو
بۆ دەردەسەری‌و بۆ ئازار خوڵقاو
دڵێ بۆ خۆرو ، بۆ بەهار سووتاو ..!»
بەرەو کوێ ئەڕۆی !؟
دەشتی دەروونم ، باخی کوێستانە
درەختی دڵم ، بۆ باڵندەی ناز
بۆتە هێلانە ...!
* * *
بۆ کوێ ئەچی !؟
تاشەبەردی چیا کەڵەکەی بەستووە
بەرد دۆزەخە ، ..
هەر بەردەو دەرگای بەهەشتی داخستووە
«٣»
بۆ کۆچی دڵ ، من زۆر گریام
وەلێ گریان ، سەردەمێکەو ئەبڕێتەوە
هەوری سەفەر ،
یادگاری‌و خۆشەویستی ناگێڕێتەوە ..!
– ئەی خەمی لە دڵا شیرین ؛
لە هەواڵی کۆچی تۆدا ، دڵ زۆر گریا
«بە فتوای دەروێش‌و سۆفی»
دڵ کە گریا ، ..
ئەسووتێنێ بەردو چیا !!
گەر سووتاشی ؛ ئاگر شوومە
تۆ بە ناخی مەرگا ئەبات ..
بۆ کوێ ئەچی !؟ هەنگاوی تۆ
پەی بە زەریای سەفەر نابات ..!!

**کۆتایی ١٩٨٧**

# دوو هۆزان

**بەیار باقی**

## ١

(شەفێت جەژنا)
ل شەفێت جەژنا
شەش خدام فیستانێ بەژنا
خاتوینەکێ
ددورین ..
وزارۆکێن هەژارا دخەودا
بۆ جۆت پێلافەکێ دگرین!

## «٢»

## راستی

ریڤینگەك
ل هەر حەفت کێشوەرا
لپەی پەیڤا (راستی) یێ
دگەرا ..
پشتی چەندین سالا
سەرشۆڕو
دەست ڤالا
ڤەگەرا،
وگوت : م نەدزانی
(راستی) پەیڤەك ژارە
ل سەر بەر پەرا ..
لناڤ دەفتەرا!!

# رویێ بەفرێ

هزرڤان عبداللە

ـ هەیهوت ....
سەرما تژی کوچك و کولینێدمە دبیت
زڤستانێد مە بونە جوت.

★ ★ ★

ـ بیرا من دهێت ئەزێ بچویك
دەیکا من سەر هاتێید بەفرێ
بومە دگێران و ڤە دگێران
هەر شەڤ و ناڤ و سەرهاتی د دانا سەر
ناڤێ وێ بومە راڤە دکر
چیروکا وێ بومە دگوت و دگوتەڤەو ..
سێبارە دکر
ل (بێدلخەیی) کورکەکێ کچکەك رەڤابو
ل ڤێ شەڤێ بەفر تلخەکەتە سەرێك
هەردو رەڤوکێد زیندانا
بەرف ناڤێ سەربەستیێ
ل نیڤارێکی. لبن کڤانەکێ بەفرێ
بو تەرم و کەفتن بەرێك.
ـ ل (شەڤبەلەکێ) ترس کوچکەکی چل روژییە
ل سەر دلێ کاروانیا
وێ شەڤێ بارا بارناکن ، ناچن رێیا
دبێژن شەق بەلە گەورە
هەفت جاران شاهییەو ئەڤرە

ـر کچکەکا ب بیتە بویك
ـف ژینا خویا ستەورە.
ـ (شەڤزەنگلێ)
ـ گوندەکی دور، ل زوزانا
ـرۆڤەکی پیرە کوچەر
ـیڤـر بو ژخانی چویە دەر
ـیت چوچك یێ بەرا دخون
ـەبردا گوندو جیرانا ڤێت نەنڤن
ـڤری گایێ خو سەر ژێکر
ـەوێ شەڤێ بەفرێ لێکر.. بەلێ لێکر
ـەفت کور هەبون بەفر دبری
ـسپیدێ رابون گوند بێ دەنگە
ـەڤدە ل بن بەفرێ یێ مری

★ ★ ★

ـەڤ سالە ژی یێ دبێژن بەفر کڤانەو چیایە
ـدە کچکەکا روی تەزییە
ـتێر ئێڤارا یالێڤ سورە
ـەرێ سپیدا پەریەکا سێزدە کەزییە
ـەفر لێڤێد من د مێژیت
ـسینگێ خو بو من دکەت مەخەل
ـەز ژی لێڤێد بەفرێ دکەمە ئاڤ و هەلم
ـکڤانێد وێ سوردکەم ب خونا کەل و گەرم
ـەنگا من دبینە شورەس
ـوسا بەفرب من شرینە
ـینا کچکەك رو تژی شەرم

★ ★ ★

سەقەم یابوی خونا رویێ ئەردو ئاڤا
بەفر یا بوی خاتونەکا کەزی درێژ
مروڤی د کێشیت و دبینیت ب سینگێ خوڤە.

★ ★ ★

سەربەستی... ناڤەك ئەنتیکە
چیڤانوکی دهێت ب هیستن
کەل سوپەیە، نیڤا خانێدمە د شارینیت
چیروکەکە، وەك خو سەربەست دهێتە گوتن
خەما کوم دکەت، درەڤینیت
د دەستێدمەدا گەرم دبیت، دتەزیت
ل سەر بانێدمە بەفریکە.

★ ★ ★

ل دورماندور نێزیك و نێزیك گوندێ مە
ل کولانێد تەنگ، بانێد نزم
بەفر هەر یا مای ڤە بەفر،
ئەسمان سلەو هەمی شەڤا دکەتە دوشەڤ

د سار و سرِ

روژ وەکی بارگیرەك لاواز ل ئەڤرازییا
دهێت وەستیایی، یابێن بستیایی
ئەڤر بەرێ چاڤا دبریت
مروڤ چەندیێ بەفرێ بکەربە
ژ بەر تەنکاتیا پیستێ خو
بەلێ دەما برینا وی‌و بەفر دبن ئێك
ماچا ل رویێ بەفرێ ددەت
ب چاڤا خونا خوژێ دگریت

۱۹۸۸ ـ دهوك

# ووشەکانم

رەحمان خانی

١٩٨٧

ووشەکانم ..
دەرزی یەخەی بەر باخەڵی
وەرزێریکی پێ شەقار بوون
گۆچان و گاڵۆکی دەستی
کۆمەڵە پیرێکی ماندوون
ووشەکانم ..
زەنگەڵەو پوولی بەرملی
بەرخە نێرو شەکی کاڵن
لەژێر پەنجەی گشت شوانێکا
کونی دووزەلەو شمشاڵن
ووشەکانم ..
چیلکەو سووتەمەنی کوانوی
دەست و پێ رچاوی سەرمان
شەماڵی سنگی تووکنی
هەژارێکی وەرزی گەرمان
ووشەکانم ..
زەنگیانەی ناو.. مێخەکبەنی

کچێکی دەوار نشینن
باخەوان و داهۆڵی ناو
بەراوێکی بێ پەرژینن
ووشەکانم ..
دوندی وورەو،
دروشمی سووری باوەرن
لەتە نانی باروتاوی
ناو هەگبەی رێبوارێکی برسی
لە سەفەرن .
باوەر بکەن
چاوی شیعرم
فەرهەنگی خەم و گریانە
گوێچکەی شیعرم
قەڵاخی دەنگی پر سۆزی
هۆرەی جوتیارو سەپانە
باوەر بکەن
من راهاتووم

چۆن بەگری پشکۆی شیعرم
بسووتێنم
رەگی رزیوی دوژمنان
راشهاتووم کە
هەر ووشەیەك
باسی برینی زۆر قووڵ و،
ئازار بکا
یا لە زەردەخەنەو جەژنی
هەژار بدوێ
من بیکەمە
هەوێنی سرودێکی نوێ
من سەدانی پێ بخەمە
قوڵپی گریان
بزەشی پێ.. بخەمە سەر
لێوی سەدان !
من راهاتووم

O

# بۆ وا ڕەنگ زەردو بێهێزی

نووسینی: شاعیری ئینگلیزی
سێرجۆن ساکلینگ
وەرگێڕانی: فریاد ابراهیم رسول

بۆ وارەنگ زەردو بێ هێزی؟
ئەی دڵدار وا دڵ پێکراوی؟
بێ هێزو لەش داهێزراوی؟
تکات لێ دەکەم پێم بڵێ:
بۆ وا ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاوی؟
ئایا بە ڕووی گەش و تەڕت،
یەك تەڵی سۆزت لێ هەژاند؟!
یەك چرکە ئۆقرەت لێ براند؟!
جاکە وایە ئێستاکە بەم حاڵەتەوە
بەم دەردو ڕەنگ زەردەتەوە،
دەتوانی یەك داوە مووی لێ بهەژێنی؟!
یەك تەزووی حەزوو ئارەزوو
لە لەشی دا بسوورێنی؟
بە ساغی دڵگیری نەکەی،
نەخۆش فریات دەکەوێ؟!
تکا دەکەم لێت پێم بڵێ:
بۆ وا ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاوی؟!

★ ★ ★ ★ ★

بۆ وا کزو کپ و کری؟
مات و بێ دەنگ، گێژو هوری؟
ئەی تاوانبار، ئەی تازە لاو:
وا دا ئەنێی لەم ڕێگەیە یەکەم هەنگاو
تکا دەکەم، بۆ وا کری؟
بۆ وامەلوول و مل کەچ و مچ و مری؟
باشە، تۆ بە قسەی تەڕت،
توانات نەبوو یەخسیری دڵ کەی دڵبەرت،
ئێستا بەدەم بەستیتەوە ...
دڵی ئەو دەبەستیتەوە ؟!
لێت دەپاڕێمەوە گیانە
تکا دەکەم بۆ وا کری؟
ماتی، بێ دەنگی مل هوری؟!

★ ★ ★ ★ ★

دەست هەڵگرە، دە وازبێنە[1]
خەوشە، نەنگە، شوورەییە
ڕەفتاری تۆ نای هەژێنی،
دڵی نابەی،
بەم جۆرە مل ملانێیە
نای بەزێنی
گەر هەر لەخۆوە حەز نەکا،
بە ئارەزوو دڵی بۆ تۆ نەرم نەکا،
هیچ شتێتر حەددی نیە... [توانای نیە]
ئەم کچە سەرگەرم بکا،
بۆ تۆ دڵی بکاتەوە
ئەم دڵرەقە
جا کە وایە دەست هەڵگرە
بە جەهەننەم
دەبا شەیتان ڕای ڕفێنێو
بۆ لای خۆی ببیاتەوە.[2]

١) ئەم چەند دێرە گۆرانی خوالێخۆشبووی نەمری کورد [شەمال صائب] دێنێتەوە یاد کە دەڵێ: هەی بەردە، بەردە بەردە/ دەبرۆ بەرۆکی بەردە/ سەدجاری ووت تۆی ناوێ/ ئیتر بەسیەو پێی ناوێ. [ببورن بەگۆڕینی ڕاناوی (م)ی (من) بۆ ڕاناوی [ی] ی [تۆ].
٢) لێرەدا لێبووردن و پۆزش دەخوازم لە خوێنەرە ئافرەتەکانی بەڕێز چونکە کارم وەرگێڕانە وبەس ومن وام نەووتوە بەخوا... من بەریم لەم [دوعا]یە.
گەر پیاو خۆی وا گێژو وێژکردبێ ئافرەت چیبکا؟!

سەرچاوە :-
Seventeenth – Century Poetry
Modern Essays in Criticism
Edited by:- William R. Keast
Pages: 300 - 310



# فرمێسك و یاد

● گەرمیان ●

پار لە گەرمەی بەهارێکی سروشتا، لەوکاتەدا کە چۆمە ئاوە لیخنەکان ئامێزیان بۆ بەفری تواوەی سەر لوتکەو لانزارەکان ئەگرتەوە، گوڵاڵەو نێرگزو درختە بەگەڵاکان ببونە زاواو بوکی بەیەك گەیشتووی ئەم قەڵەم رەوەی کوردوستان، رێواسی کوێستان وەك لاوێکی تازە هەڵچووی بە بارو بەرگ لەنواڵەو بژوێنەکانەوە سەری گەنجیان لەعەشق و خۆشەویستی بەهارەوە هەڵدەبڕیو چاوی مەستی ئەوینیان لە دەزگیران و دۆستەکانیان ئەبڕی، ئالەو کاتەدا گەردەلولێکی شووم، گەردە لوولی مەرگێکی ناوەخت و چارەرەش لەپڕ هات و گوڵێکی تازە بەهاری هەڵچووی لەرەگەوە هەڵکێشا، گوڵاڵە سوورەیەك کە بۆن و بەرامەی ئەم خاکەو لە سایەی لوتکەو تاوێرو رەوەزو کانیاوەکانیدا گەشەی کردبوو فراندی، ئایا تا ئێستا لە بەهاردا گوڵ هەڵوەریوە؟

کەس دیویەتی دەریا ئاگر بگرێو چیا پشکۆ لە سەر بنێت و بەهار وەرزێکی زرو ناپەسەند بێت؛ بەڵێ پار لە وەرزی نیساندا چرۆ دڵ پڕ لە ئاوات و ئارەزووەکەی کاکە حەمەم(*) لەلێدان کەوت، چاوە گەشەکانی لەدوا هەواری ئەم ژیانەدا لێك نان، ئەو تا سەو خولیایانەی خەوی رەنگاڵەیی پێوە ئەبینین و، بەکەف و کوڵەوە نەخشەی دوا رۆژی بۆ ئەکێشان بوونە تەم و لە ئاسۆوە بەرەو نەدیوی کشان و وون بوون. ئەو رۆڵە بەوەفایەی کە ئەڵقەی خۆشەویستی تازە لەپەنجەکانیا وەك ئەستێرە ئەدرەوشایەوە، ئەو دەم و چاوەی هێشتا رەونەقی منداڵیو تازەی لاویەتی تیا پشکوتو بوو خوێنێکی گەرم و ئالیان بەسەردا رژاو شارانەوە، خوێنی لەشێکی نەرم و ناسك. ئەوا ئێستایش لەدوای ساڵێکی تەمەنی مەرگ لەسەر گۆرەکەت کۆمان گرتووە، وەك ئەستێرە بەدەوری مانگێکی گیراودا ئەگرین و فرمێسك ئەرژێن، چەمەر ئەگرین نزوو لەمان بەرەو خواو گەردونی دڵ رەق ئەکەینەوە. کەی مانگەکەمان بەر ئەبێت؟ کەی دنیاکەمان روناك ئەبێتەوە؟ بەڵام نەدەنگێك.. نەرەنگێك نە ناڵەی بریندارێك دێت و نە کتێبێکی سوور وەك بەرگێکی شەهید لە گۆڕی ساردو سڕەوە سەر ئەکێشێت، منیش بەناچاری ئەڵێم: بنوو کاکەی خۆشەویستم.. چاوەکانت لەماڵەکەدا هێشتا پڕ لە نورو روناکی‌یە، لیوت بەبارنین و هەر زەردەخەنە ناسکەکەی لەسەرە ئێستایش لەناوماندا دێت و دەچێت بەعشق و خۆشەویستی تۆوە ماڵەکەمان هەر گەرم و گوڕە جێگای ئەوانەیە کە تۆیان خۆش دەوێت و تۆش ئەوانت لەبەر دڵن، چراکەمان هێشتا گری لەتۆوە خۆشەو ئێمەی لەبەردا دائەنیشن و لەگەڵماندا قسە شیرین و خۆشەکانت وەك پەپولەی رەنگاو رەنگ دێن و دەچن مەزاری لەشەکەیشت شەوانی تاریك و تەنگ و شەچاویش هەر رۆژێکی روناکی بە وورشەو پرشەیە.

ئێستایش چاوەکانت لێك بنێ چونکە نیوە شەوەو کاتی حەسانەوەی لەشە شەکەت و شەلاڵی خوێنەکەتە.

★ کاکە حەمە: ناوی محمد شێخ سەعیدی شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەمە وە لە رۆژی «٧» نیسانی «١٩٨٩» لەنزیك شاری هەولێر بەکارەساتێکی دڵ تەزێن کۆچی دوایی کرد کە قوتابی (دەورەی «٤١» ی متوسطە) بو لە کولیەی شرطە. وەبۆ «١٥» رۆژ بوو دەزگیرانی دیاری کردوو جوانترین زەماوەندی شیرینی خواردنەوەی بۆ سازدرا.

# چاوەڕوانی

جلیل محمد شریف

کات چێشتەنگاوێکی درەنگ بوو، لەبەربەرۆچکە، لەسەر یەکێ لەتەختە لاکێشەیی‌یەکانی دەرەوەی چاخانەکە بەتەنیا شانی دادابوەوە. هەتاوەکە گەرمایی‌یەکی بەهاریی خۆشی دابوە لەشی و خاوی کردبوەوە، ناوبەناو وەنەوز دەیبردەوە. تەختەکانی تری ، پیاوانی بێ کارەو بە ساڵاچووی هاوکوفی ئەم لەسەریان، دوودوو سێ سێ نیشتبوونەوە.

هۆی تەنیایی ئەو ڕۆژەی حاجی عەلی ئەوە بوو، هاوڕێ و هاودەمە هەمیشەیی‌یەکەی، دەرنەکەو تبوو، دا وەکوو هەموو ڕۆژێ چمکی چەند باسێك کەن بە پێ خوری ڕۆژە لەیەك جوومکانیان.

بەدەم جگەرەکێشانەوە خەون و زینـدە خەونـی تێکەڵاو دەکـردو هەتاوەکەیش بەرەو کەشکەلان دەکشاو چاوەڕوان کردنەکەی ئەمیش درێژەی کێشا. کاتژمێر گەیشتە قوناغی ئومێد برین. بۆ خۆ خافڵاندن ئەمرۆ لە هەموو ڕۆژێ زیاتر جگەرەی کێشا ، هەروەها بۆ سێیەم جاریش لەسەر داواکاری خۆی، شاگردەکە **چای** لەبەردەما دانا.

**هامووشۆکەران بەبەرچاویەوە هەریەك بەدوای مەبەستێکەوە تەکانیان دەداو لەهاتن چوون نەدەکەوتن ..(خۆزگەم بە خۆتان هەریەکە بەکارو فرمانێکەوە خەریکن ... کەچی منیش هەموو کارەکەم ئەوەیە لە ماڵەوە بۆ ئێرەو** لێرەیشەوە بۆماڵ ... هەر ئەحمەدم بەدەستەوە هەبوو ، بۆ ئەوەی بەتاوتوێ کردن و تەتەڵە کردنی ڕۆژانی کۆن و تازەمان، خەمی خۆمان بەبا دەداو ئەم چەند سەعاتەمان پێ پڕ دەکردەوە ...کەچی ئەویش ئەمرۆ گۆڕی گوم بووە...!

تەمەنی حاجی عەلی لە حەفتا ساڵ تێپەڕ بوو بوو، بەڵام هێشتا لە ئاست لایەنە جوانەکانی ژیان دا دڵی دەهاتە خورپەو نەیدەتوانی خۆی لێگێل بکا.

ئەو ڕۆژەی هەواڵی مردنی پیرێکي ببیستایە بەتەواوی خەم دایدەگرت و ترسێکی تۆقێنەر دەنیشتە سەر دڵی. گەلێ لە مردن دەترسا، پێی شەرمیش بوو ئەو ترسە بۆ هەموو کەسێ بدرکێنێ . زۆر جار لەگەڵ خۆیا ئەم دیوو ئەو دیووی دەکرد.. (دەڵێن مردن بڕا گەورەیە .. دەك خوا ئەم گەورەیەیە ببڕێ... تۆخوا ئەمە برا گەورەیی وا دەبێ ؟!).

لەتوێی سینگیا هێشتا دڵێکی تەڕو پاراو خوێنی دەدەڵاند .. بەهەر دوو دەس باوەشی بۆ ژیان کردبوەوە، دەسبەرداری نەدەبوو .

**زۆر جار لەگەڵ ئەحمەدی هاوڕێی‌دا. لەسەر ئەم لایەنە دەبوە مشت و مڕیان (کوڕە بابە ڕۆژێ زووتر بمرین لە کۆڵ مەینەتی ئەم دونیایە ببینەوە باشترە ... بەخوا من هەر کاتێ سەعاتم تەواو بوو بەمەمنوونیەوە بەرەو پیری مردن دەچم ...)**

بەم قسانەی هاوڕێکەی زۆر قەرس دەبوو، گاڵتەی پێ دەهات . زۆر جاریش بە توندی بەر پەرچی دەدایەوە ، لێی توڕە دەبوو. بەو توڕە بوونەی هەندێ تارمایی مردنی لە خۆی دوور دەخستەوە... (ئەرێ براکەم، با ئەو مردنە هەر پیرۆزی خۆت بێ .. بەخوا بابە من دەمەوێ عومری نووح ببینم ..)

**بۆ ڕەواندنەی] وەی بیزاری و**

**تەنـیـایـی پەنـای دەبـردە بەر ئەندیشەکانی بۆ پر کردنەوەی ئەو بێ ئەحمـەدیـەی ئەنـدیشـە بەچـری دەبـارینـە سەریـا . ئەویش بەریـزە دابـوونیـە دەم یەك و کردبوونیە پێ خۆر بۆ ئەو چەند سەعاتە.**

سرنجی بۆ شانی لای رۆژاوای (قەلا) چوو کە وەکوو پیرێکی پیاو چاك هەزاران ساڵە دەست نوێـژ بە رۆشنایی ئاگرەکەی باوە گورگور دەشواو، روەو (کانی دووەمەلان) و خوای پیت و بەرەکەت راوەستاوە، دەس بە دووعا نزاو تکای چاکە دەکا بۆ رۆڵەکانی دەورو پشـتـی دا دووربـن لە پەتـاو وەبیشوومەی زەمانە.

خانوەکانی بان قەلا ـ بۆ یەکێ لە خوارەوە سەیـریـان بکـا ـ لە ریزە شخاتەو قالبە سابوون دەچوون کە لەو لێوارە ریز کرابن لە پێ پلیکانەکەی قەلا وورد بووەوە ، وێنە جارانی لەگـەڵ ئەمرۆی دا لەبەر چاوی تێك هەڵکێش دەبوون بەبیری دێ ئەوسا ، بریتی بوو لە لیـژیـەکی بێ گرێ، هەتـا ناودەمی پردەکەی دامێنی شۆر دەبوەوە . ئەو پردە گەچینەی سی و پێنج ساڵ لەمەوە پێش لافـاوێکی گەورە عومـری بەبـاداو دارێکی لە رووحیـدا. بووە یادگـارێکی مێژوویی لە مێشکی ئەوانەی هاوچەرخی ئەو رووداوە بوون.

ئائـەو خانـوە پەنجـەرەدارەی نیزیك رێگا سەرەکیەکەی دەروازەی پیرە قەلا ، چاکەیەکی گەورەی بەسەرەوە هەیە.

لەکاتی تەنگانەدا بە هانام هات . ئا پاڵ ئەو خانوەدا تۆزی گوللە سەربازە گلاراوەکانی سەر بە ئینگلیزەکان پژایە سەرو چاوما. بۆ ماوەیەك گۆشەی دیوارەکەی بووە سوپێر بوم .... بەخوا برا لە پالیەوە هێڵەم پێ یان کرد .

هەر لەو ساوە ناوبـانـگـی و ئازایەتی یەکەی لە ئەندیشەی خەڵکی دا نەخشی کێشـا . چونکـە یەکێ بوو لەو کەڵەمـێردانـەی گیانی خۆیان لە پێناوی ئەوشارە خستە سەر لە پیان .

لە هەرەتی لاویدا بوو لە شکرێکی ئینگلیـز لەتەك شارەکە ئۆردووگایان هەڵ دا . سەربازەکان بۆ شت کرین کەوتنە ناو بازار . هەندێکیان گێچەڵیان بەخەڵکی کرد.

لە ئەنجـامی دەمـەقـالیـەك دا لەگـەڵ دوکـانـدارێکـا، زەلامێکیـان کوشت ... مەسـەلەکە چوە دەمەوە. خوێنی خەڵکی هەڵچوو .

بەتەواوی قلیشایەوە ئەو کەسەی چەکی شك دەبرد، دەری هێنایە مەیدان دوکان و قەیسریەکان داخران تەقەی تفەنگ لە زۆر قوڵەوە دەنگی دەدایـەوە . ئەمیش خۆی گەیاندە ماڵ تفەنگە پێنج تیرەکەی لە نێو پێخەفا دەرهێنا، لەچەقی رێگا تووشی بوو بەتـووشی چەنـد سەربـازێکـەوە . لێیان هاتەکار . دوو جوا مێری تر هاتنە شانی ... هەڵهـەڵێ ژنان لەسەر بانەکانەوە، دە ئەوەندەی تر دەماری ئازایەتی یانی بزواند

لەهەمان کاتا هەواڵێ وا بڵاوبووەوە، گوایە سەربازەکان دەیانەوێ بچنە ناو گەرماوی گشتی ی ئافرەتانەوە . ئەم هەواڵە وەکوو بروسکـە ئەم سەرو ئەوسەری شارەکەی کرد. پلەی بەرەنگار بوونەکەی هێندەی تر بەرزکردەوە .....!

هۆرنی ئۆتۆموبیلێك رای چەڵەکاند ... چاوێـکی هەڵبـری . وێنـەی قەلای بەزەقی هاتەوە بەرچاو غایلەیەکی بە دلا هات . موچورنەی ترسێك وەك کارەبا لەشی تەزان چاوی بریـەوە ئەو سووچەی لێوە، ئاگری قینی بۆ داگیرکەرەکان تێ دەگرت ... (داخـەکـەم بۆ زەینـەل دوو هەنگـاو لێمـەوە دووربـوو . لەگـەرمـەی تەقەدا هەستایە سەرچۆك .. پێکرا .. کور بوونەك گاڵتە ..)

ئەوەبوو پاش نیوەرۆیەکی درەنگ سەرکـردەی لەشکـرەکـە فەرمـانی بۆ سەربـازەکـانی دەرکـرد، دابکشێنـەوە ئۆردووگـاکـەیـان. رۆژی دوایی هەواڵی بارکـردنی ئەو لەشکـرە گەیشتـە شارو فەرامۆشی و دڵخۆشی گەورەو بچووکی گرتەوە.

**سەعاتەکەی بەرباخەڵی دەرهێنا چاوی لێ نیزیك کردەوە .. ئەوەندەی نەماوە بۆ نوێـژ .. خۆی خر کردەوە و پێڵاوەکەی بەچەکی کردە پێی. چوار هەنـگـاو لە چاخـانـەکـە دوور نەکەوتبووەوە. تووشی ناسیاوێکی بوو. بێ سەلام و بێ کەلام هەڵی دایێ: حاجی دەزانی ماڵی مام ئەحمەدیش باری کرد..؟!**

•

**هەواڵەکە شەپۆلی خەمێکی گەورە بوو تەوژوومی هێنایە سەرودڵی. یەکسەر لە شوێن خۆی سربـوو. تاوێـك رەق هەڵما. سەیرێکی ئەم لاو ئەولای خۆی کرد. چاوێـکـی بەرەوقەلا هەڵبـری. ئاوەری دواوەی دا. وێنەیەکی تەماوی ئەحمەدی هاتە بەرچاو. یەکسەر مردنی بەیـاد هاتـەوە. بەڵام ئەم جارەیـان بەترسناکی نەهاتە پێش چاوی. بەڵکو مردن لەوکاتەدا لەلای بووە حاڵەتێکی رەزا سووك و چاوەروان کراو.....!!**

●

# زڤرین بۆ جهێ دەستپێکێ

- ئەحمەد داود قادر -

پشتی فراڤینا خوە خارین، وقەدەرەکێ روینشتینە خار گۆتێ: ئازاد خالۆ، ئەم خۆ ل هویڤیا چا مال ناگرین، ب ڤی ـمگی دیـارە ئەڤە دێ مەگیروکەن، دا ئەم بچین و چا خوە ل ـچیخانێ ڤەخوین ، نوکە هەڤالێت مە هەمی ل وێرێ خرڤەبونە. ـزادی گۆتێ: بکـەیفـا تەیە خال کا هەما تو چەوا دبینی بلا ـصابیت . هەردوو رابون.. سوڤ... حەسەنی دەستێت خوە ـچکێت قاپیتێ خوە راکـرن و ودخـوە وەرپێچـا. ئازادی ب ـ نەڤە گۆتێ. تە خێرە خال تە هوسا ئەڤ قاپیتە کرە بەرخوە، ـیا بو بهار، گەرم بوو.

ـو بووە جحێلا گەرمە، هوین هەست ب سەرمایێ ناکن. بەلێ ـو پیرەمێریت وەکی مە هێش سارە.

- نەخال نەخوە پیر نەکە هێشتا تۆ یێ جحێلی.

هەردووا رێکـا خوە گرتن و بکـەنیڤـە دەرکەتن و ریکا ـچیخانا مەیدانکا پالا گرتن... رۆژێ بەرێت خوە خوەشنکربوون - پێنگـاڤـا ئێکێ بەرەو رۆژ ئاڤـا بونڤـە بچت و خاتـرا خوە ـخازت... هێش تێهنەکا گەرم دتیرۆژکێت وێدا هەبوو. ـیچەکا گەرماتیێ ددا لەشێ مرۆڤی، بەلێ ئەگەر دناڤرا هلمەکا ـی هاتبا گەر یاکێمژیبا، وێ پشتی نیڤرویێ مرۆڤی هەست ـ تەزیاتیێ دکر، دەمێ ب سەر لەشێ مرۆڤیدا دچو خار، چنکی ـو با ژ سەر وان چیـاییت دوری باژێـری دهـات و شوین ـەخشێت تلێت کەڤێت بەفـرا دنـاڤـرا دیار بوون. وەکی هەر ـرۆژەکـێ ژ رۆژێت ڤی دەمێ سالێ، ل سەرێ مەهـا ئاداری ـدەمێ زڤستان دەست پێ دکت کە لەپیرتێت خوە لێك ددت وخوە ـەرهەڤ دکت بۆ بارکرنێ، و دەمێ بهار دەست پێ دکت هێدی هێدی سنگێت کوینێ خوەیێ کەسك و نەخشاندی بکولیلکێت سورو زەر دقوتت داموکم ل ناڤ دەشت و چیاو نهالا ڤەدەت... گەهەشتنە مەیدانێ ، ل جادێ دەرباز دبوون ... بەلێ هێشتا ل نیڤـەکا جادێ چاڤێت سوڤ حەسەنی ب زەلامەکی کەتن یێ بتنێ روینشتی بەسـەر کورسیکـەکێ ل دیمـاهیـا رێزا وان تەختکێت چایخانێ ئەڤێت ل بەر دیواری رێزکرین... دەستێ خوە یێ دایـە بن گوهێ خوە، عەورەك ژ دویکێلا جگارایێ ل هنـداڤ سەرێ خوە چێکـری، رهێت وی دنـە تراشینـە... ونـیشـانێت پوسیـدەیی‌و چەمگـیری یێ ل سەر دێمێ وی گازیدکـر ... چاڤێت وی رك و رك یێ ل وێ قەرقەشا مرۆڤا وبەرێ خوە دانا وی هزار هزار ئاخفتن و پسیاریێ دناڤدا... سوڤ حەسـەن ل نیڤـا... جادێ ماگـوهشی هەروەکی باوەر ژچاڤێت خوە نەکەت، ئازاد ل جادێ دەربازبوو. بەرێخوەدا رەخ خوە خالێ خوە نەدیت، ل خوە زڤری دیت خالێ وی مەندە هوش یێ ل نیڤەکا جادێ راوەستیایە ، زفریڤە دەستێ خوە ل ملی دا گوتێ:

خال دەرباز ببەتە خێرە...

هاهـ ـــ چونە خالو چونە ... کاوەرە جارێ عەولی ئەم بەرێ خوە بدەینە زەلامێ هەوی خێرە...

- تە چ شولەپ زەلامی...

- بەلێ. هەروەکـی بۆ خوە گوتی... سوڤ حەسـەنی فەستـا زەلامیکـر ئازاد ژی نەچـار بو کەتەدویف... سوڤ حەسەن گەهەشتە دەف زەلامی.

ـ سەلامو عەلەیکم

ـ سەلامو عەلەیکوم .... ئێڤاریاتە باش.......

دەس تێ خوە دەینا سەر ملێ وی وهەژاند...

هاهـ هـ ... تەخێرە... سەرچاڤا مامێ حەسەن .... ب سەرخوە ڤـ هات .... کەرەمکە روینە...

تەخێرە سوڤ حەسەنی گوتێ»، دوو سێ جارا من سلاڤی تەکر، وتە بەرسڤا من نەددا.

ئاخفتنا سوڤ بری‌و گوتێ لن نەگرە، من ئاگەهـ ژتە نەبوو ئەز دهزردکا کویردا بوم.

چ نینە .. چ نینە... بەلێ تەخێرە تو هوسایێ بێ سەروبەر تو چ جارایێ هوسانەبوی... توبوچی بتنێ روینشتیە...

پشتی کویر بێهنا خوە هەلکێشای و بەردای، گوت. خودێ خێرا بددتە هەمیا... ما ئەز چ بوتە بێژم و چ نەبێژم... وژکیرێ دەست پێ‌بکم...

سوڤ حەسەنی دلە دل‌داو گوتێ مالاتە خودێ ئاڤاکەت... تە هوسا خوە بێ‌سەرو بەرکریە دنیا ڤبەر هنرێ ناکەڤت... زەلامی ببێ دەنگی سەرێ خوە هەژاند...

پشتی بێهنەکێ بێرەنگ بون سوڤ حەسەنی ئەو پەردە بری‌و گوت. ئەرێ بابێ رێبەری ئەو ئاخفتنا حەگولێ بوی راستە یان نە؟

هەروەکـی ڤێ ئاخـفـتـنـێ جارەکـادی دەردێ برینێت وی ڤەکـری‌ڤە... بێرەنگ ما... پاشی بەرێ خوە دا سوڤو سەرێ خوە هەژانــد... وچـاڤێت وی هەمی تشت بۆ وی دگـوتن... جارەکـادی سوڤ دەست ددلێوی داڤــەو گوتێ، هەمـــا تو بچویکێت خوە دساخ بن ئەڤادی هەمی ژ خومیە... دێ هێت و دێ چیت... پارەڤریێژا دنیایێ‌یە...

بابێ رێبەری بزارەکێ دامای و بژان گوت. مامێ حەسەن .. ئەڤە ... ئەڤە خوهرانا ژیانا من هەمی‌یێ بوو، و ئەو ژی هەمی وەکی فرشکەکێ سڤك با باڤێژتە ناڤ پێلێت ئاڤێ‌و دگەل خوە ببت وەسا چوو.. ئەڤ ئاخفتنا خوە دگۆت و هەست کرنا ب ژان و قەهرو دامایی یێ ل ناڤ ئاخفتنا ... وی ول سەر دێمێ وی بلند ببوو.. پاش ب لەز هەر وەکی ئێك تشتەکێ وندا ببینت... وریـك نەد سوڤ حەســەنی ئاخفتنـەکێ بێـژت گۆت: مامێ حەســەن، تو دزانی ئەز بۆچی هاتیمە ڤێرێ؟ بەلا جارەکادی نەهێلا سوڤ بێهنا خوە ژی بهلکێشیت و ئەوی ب خوە بەرسڤ داو گۆت: ئەزێ هاتیمە ڤێرێ چنکی من دزانی بێ گۆمان دێ مرۆڤـەکێ وەکی تەبینم دا دگـەلدا باخڤم... برا ستی پێتڤی مرۆڤـەکیمە دگەل باڤم... دگەل من باخڤت... دەمێ ئاخفتنە دگۆتن شورەشەك ل سەر دێمێ وێ بوو ... وهەر دوی دەمیدا نیشانێت بێ‌زاریێ‌و پرژانییێ ل ناڤ وی دێمی خۆیا دبوون، سوڤ حەســەنی دڤیا باخڤیت بەلێ جارەکا دی رێك نەدایێ‌و گۆت: ئەو گورگن.. بەلێ جیهانا گورگایە... رەڤدەکا گورگایە ب تنێ ل وێ جیهانێ دژین.. هەمی پێکڤە ل نێچیرێ دگەرن.. و دکەڤنە سەرکەلڤی... سوڤ حەسەنی جارەکا دی دڤیا باخڤت، وەلێ زانی یێ دچ دەلیڤەدا دژیت لەوما هێلا باخڤت وەکی دڤیا. بەلێ هەروەکی ئەوی ئاخڤتنـا سوڤ حەسەنی دچاڤارا دیتی ژبــەر هنــدێ گۆت: نەخێر ، من چ تشت ل سەر نینە ... ئەو نێـزیکی بیست سالا بوو من دگەل شول دکر ب باوەری‌و ب هەڤپشکی ل گەل یەك من ئەڤ هزرە نەدکر.. من هزر نەکر ئەو دێ رێکا خاپاندنێ بۆ من ڤەوژێرت هەتا من باش د سەر دابێت ومالا من ب ئێك جاری دەتە رەخەکی «چاڤێت وی تژی روندك بوون و ئێدی نەشیا باخڤت» دەستێت خوەدانە و بێدەنگ ما ...

سوڤ حەســەنێ گازی کرە چایچی گۆتێ خالۆ بۆ مەسێ چاو هنــدەك ئاڤێ بینــە ... پشتی چاخوە ڤەخارین بابێ رێبەری پەرداخــەکێ ئاڤێ ڤەخــار... بێهنــا خوە کویــر هەلکێشــاڤەو بەردا... پیچەکێ بێهناوی هات، هەروەکی وی پەرداغێ ئاڤێ ئاگرێ وی پیچەکێ ڤەمراندی... وجارەکا دی گوت: باوەر بکە مامێ حەسەن وەکی من گۆتی تە ئەز هاتمە ڤێرێ چنکی ئەز قایل بووم کو ل ڤێرێ مرۆڤایەتیا راست و دروست یاهەی... ئەز دێ ل ڤێرێ دلێت پاك و بێ... کەرب و کین بینم... بەرێ خۆ بدێ بەرێ خۆ بدێ کەینا هەمیا دگەل ئێك ژ دل دەرکەڤت... ب براینێ‌و بێ دلە رەشی... نەکیـا درەو و خاپاندنێ. «گرنژینەکا بژان ل سەر... دێمێ وی هاتــە نەخشــاندن، وبۆ جارا ئێکێ هوسا ب تەنایی ئاففت» وگۆت: بەرێ خۆ بدێ مامێ حەسەن هەر رێــزو تەرتیفێن بەرێنە... ئەڤێ ل بەرڤی دیواری دامانێ دکن، ئێکێ دبێژتە هەڤالێت خۆ ئەز دێ هەربم‌من‌دام یا هەی..

ئان هەڤالێت دی یێ دبێژنێ دوو ـ سێ بەرکا بدێو هەرە دامێ ـ «گرنژیڤە»و گۆت: ئان بەرێ خۆ بدە ژ رەخ وان ڤە، کەوگیرڤانا وئاخفتنێت وان کویەك یێ دبێژتە یەکی کەوێ تەبۆ چییە؟ ب کێر نێچیرێ ناهێت... ئان ژرەخ ویڤەیێ دی ب زارەکێ دژوار دبێژتە هەڤالێ خۆ سوزبت کەوێ تە، یێ من برەڤینت، ئێدی کەو گیریێ نەکم... بەلکو هندەك جارا ب ئاخفتن بجرەژی بچن، بەلێ ئەو گاڤە... وەمی پێکڤە دێ دەرکەڤن وەکی برا، یان بەرێ خۆ بدەمالێ دی وپالا ئێك یێ دبێژیتە هەڤالێت خۆسپێدێ زوی دێ دەرکەڤین دازوی ب دویماهی بهێین و بزڤرین، یان یێ دێ ل قلما دی دبێژت ژبیرنەکە بێژە فلانیو فلانیدا دگەل مە بێنە شولی... هەر ئێك دگەل هەڤالێ خۆ دل پاکەو کا چ بۆ خۆ دڤێت ئەو بۆ هەڤالێ خۆ وبرایێ خۆژی دڤێت... «ئەڤ ئاخفتنە دگۆتن و ژان و پێشەمانی یێ ل سەرو چاڤێت وی مالا خۆ دمینابوو.

سوفی حەسەنی گۆتێ، بابێ رێبەری تۆ گەلەکێ وەستیایی ویێ یوسیدەی... رابەدا ئەم بچین دەف مە، و ئەڤرۆکە تۆ بۆ... شیڤێ مێهڤانێ مەی... ئەو هەر برایێت ئێکین «دگەل پەیڤا وی ـ دیماهیێ تەزینگەك ب سەر لەشێ ویدا چوو و پشتی بێدەنگیەکێ بابێ رێبەری» گۆت: براستی ئەز گەلەك یێ ژخارزا ـمیکا سەربەستی خەریب بویم... بەلێ من دڤێت بێهنە کادیژی ـ ڤێرێ رونیم دا باش بیرهاتنێت خۆ بزڤرینم و بەرێ خۆ بدەمە ڤێ مروڤا. سوفی حەسەنی گۆت: دێ باشە پا ئەزو ئازاد دێ چین... ئووهـ ژخۆ من ئەو ژبیرکربوو... ئەڤە ئازادە خارزایێ مەیەو زاڤایێ مەژیکە... ب سەرەدان یێ دهاتینە دەڤ مە، بابێ رێبەری گۆت: سەرچاڤا... بەلێ بلا ل مەبیورت مەخۆ ژبیرکربوو... سوفی حەسەن زڤریو گۆت پا ئەم دێ چین، بەلکو ئەز هەڤالێت خۆ ببینم دا بێژمێ من سباهی مێهڤانێت هەین ئەز... دەرناکەڤم شولی، دال هیڤیا من نەمینن و مەحتل نەبن... بەلێ تۆ هەر وەری، مال ژی هەریال جهێ خۆیێ بەرێ «پاشی ب گرنژینڤە» گۆت: دەرگەهێ مەژی هەر ئەوە یێ من و تەب دەستێت خۆ ئێخستیێ... ب دەستوریاتە... ئازاد خالۆ کەرەمکە دا ئەم بچین.

پشتی سوفی حەسەنی هەڤالێت خۆ دیتین چووناڤ بازارێ هندە ناڤێ کریو رێکا مال گرت.

ـ خالێ چ ب سەرێ ڤی زەلامی هاتە؟

ـ چیرۆکەکا درێژە، وەلێ ب کورتی ئەز ژتەرا دبێژم.

«ئازادی ملێت خۆ هەژاندن»

ـ دێ ب کورتیژی هەر باشە.

ـ خالۆ ئەڤ زەلامێ تەنوکە دیتی .. هەڤالەکێ من یێ کەڤنە، ژبەری بیست سالەکا ئەو ل تاڤێ مەبی. ئەز و ئەو گەلەك هەڤال بوین، ئەم پێکڤە دچوینە پالەتیێ، پاشی پشتی دەمەکی ئەو بۆ ئاسنگەرو بۆخۆ شول کرو گەلەکی ب زەڤەربوو هندی بێژی یێ شول کەربوو.. بۆ خۆ قونتەراتێت ئاسنگەریێ گرتن و حۆدێژی دایێ بۆ خۆدان ترمبێل و... خانیو پارەو... هەڤالێت خوییێت بەرێ ژبیر کرن، دناڤ واندا نەدهات و نە دچوو، بەلکو سلاڤژی نەدکر وان، هندە هەڤالێت دی گرتن و خەلکەکێ دی ناسکرن... دەمەکێ باش مال گەل قونتەرچیەکی وگەلەك بون هەڤال... قونتەرات پێکڤە گرتن و ب هەڤپشکی، پرێت خۆ هەمی کرنە د قونتەراتەکێدا... هەڤالێ وی لێ... وەرگەها... قونتەرات ب ناڤێ هەڤالێ وی بوو... ئو وەکی ئەو دبێژت چ تشت ل سەرنینن... ڤێچا خۆدێ بۆ وی بەدەل ڤەکەت دیارە ئەو گۆتنا مەزنا راستە «هندی طەیر بفریت دێ هەر زڤرتە هێلینا خۆ»

ـ نە خال، نە مەسەلە ئەو نینە «بەرێ خۆ داخالێ خۆ دیت وەسا یێ بەرێ خۆ ددەتێ زانی دێ پرسیارەکێ ژێ کت. لەورال سەر ئاخفتنا خۆ ما بەردەوام» خال هەر کەسەکێ ب رێکێت راست بگەهەتە ئارمانجێت خۆ دەستێت وی د خۆش ین... وئەگەر تەیر ژ جهێ خۆ فری وشیا جهەکێ باشتر پەیدا بکت و بزانت پارێزیا وی جهی بکت، بلا، ما چ قەیدیە، ڤێجا، بلا مروڤ ـ ژی بزانیت کویا فەر نەئەوە ب تنێ بزانیت کادێ چەوان پێشکەڤیت، یا فەر ئەوە مروڤ بزانیت دێ چەوا ب پێشکەڤتن و کەیف خۆشیا خۆ بەردەوام کەت وب پارێزیت، چنکی ئەم بێی ڤی تشتی نەشێین چ بکین... وهندی ئەم بکین، هەروەکی مە چ نەکری «ئەوێ دڤان ئاخفتنادا گەهەشتنە بەردەروکیو دکولا دیرا بابێ رێبەریژی گەهەشتە وان وپێکڤە چونە دمال ڤە، رۆژبێژی داڤێت دیماهیێ ژ دەلنگێت خۆ ژ سەرێ وان چیا ل د یڤ خۆ دکێشان.

○

# ئاولە

کاروان ئەنوەر فەرەج

لە پەراوێــزی خەمێکــا گۆشــەگــیر بوویت، ئاســمــانی حەزەکــانت مزگێنی لێــزمــەی بارانێکی خەمــاوییــان دەدایتێ، بەرەو ئەستێلکــەکــە ملت دەنــاو جەستــەی لاوازی خۆت بە هەزار جەزرەبە بۆ کێش دەکرا ، بەدەم ئازارەوە دەتلایتەوە، جارجار چاوێکت بە دەورو پشتی خۆتدا دەگێراو دەستت بە رۆیشتن دەکردەوە.

گەیشتیتــە ئەوێو بەردەنــوێــژەکەت کرد بە پێخەف و لەســەر گازی پشــت راکــشــایــت، هەردوو پێــت لەکلاشەبۆرەکانتدا دەرهێناو رووت کردنە ناو ئاوەکەوە، لەش و لارێکی لاواز لە شەروال و کراسێکی رەشی چڵکن و پەڵە پەڵاویــدا شاردابووەوە، ریشێکی زبرو سمێڵێکی رەش تێکــەڵاو بووبــوو ســەروقژێکی تۆزاویو بژاویش روخســارێکی ئێجگــار ترسنکاکیان دەبەخشییە دەم و چاوێك دەتووت بەتەمایە نهێنییەکی زۆر ئاڵۆز بدرکێنێت بەڵام ناتوانێت. لەنێوان چرۆی ئەو سپی چنارانەوە کە لوتیان داژەندبووە سەر ئەستێلکەکە چاوت بریبووە کونج و کەلەبــەری ئاسمانی پان و بەرین، تیشکی خۆریش چەنــد کەلێنێکی بۆ خۆی دۆزیبــووەوەو لێیانەوە دەهاتە سەر ئاوی ئەستێلکەکە، وێنەی جوڵانەوەی ئاوەکەی لە دەم و چاوی تۆدا دەشکاندەوە.

بیرەکــانت هێنــدە چرو پر بوون لانــەوازیان کردیت بۆ دونیای خەیاڵو وردە وردە رۆژی روناکیان لەبەر چاوت کرد بەشەوی تاویك، بەدەم ئازارێکی تیژەوە راپەریت، زۆر پەشــۆکــایت کە دیت وا تارمــاییەك بەری هەردوو چاوی لێ تەنیــویت، سەرت دێشێت و هەمــوو لەشت ئاوێکی سارد دەردەدات، بریــارت دا بە پرتــاو خۆت بگەیەنیتەوە ماڵەوە بەڵام قاچەکانت لەدوات نەهاتن وە تا دەهــات تارمــاییەکە تاریکتر دەبوو ئازەرەکەیش زیاتر ختووکەی دەدایت.

کاتێــك هۆشت بە خۆتــدا هاتــەوە خۆت لەپــەنجــەرە بەندەکەی خۆتاندا بینییەوە، لەسەر دۆشەکێکی بەرزو نوێ راکشــاویت چی خزم دراوسێتــان هەبــوو بە لا سەرتەوە راوەستابوون ، باوکت ئێجگار مات و زەبوون کەوتە پێش چاوت کە تا ئێستا بەو شێوەیە نەتدیبوو، جلە شینــەکــانی لەبــەرکردبوو کە تەنها بۆ پرسەو رۆژانی جەژن لە بەری دەکردن.

ریشێکی ماش و برنجی لە دەم و چاوێکی پر لە چرچ و لۆچــەوە رواوە، دووبــرۆی ئەستــوور لە ژێــر لێــواری مشکییە ئەڵومنییەکەیەوە سێبەریان بۆ دوو چاوی پر لە چەرمەسەری دروست کردبوو ، هەردوو دەستی لەبەر پشتوێنەکەی گیرکردبوو، ئەو پشتێن کە پێش دوو ساڵ کراس بوو دایکت لەبــەری دەکــرد، بەجــۆرێك لووتی داژەندبوو بەسەر سەرتەوە دەتووت هەر ئێستا شتێکی زۆر سەیر روودەدات، دایکیشت هەردوو رومەتی خۆیی رنــیبــوو، چاوەکــانــی بوو بوون بە تەشتی خوێن و پێڵووەکانی ئاوسا بوون ، سەرپۆشێکی سپی لەگەردنی جەراندبوو کە چەند پەڵەیەك خوێنی کوڵەکانی لەسەر نەخش کرابــوو، جێگــای بەخــۆی نەدەگرت لە ژوورە گەورەکەدا دەهات و دەچوو وەك بڵێیت کێچ کەوتووەتە کەوڵی، تاوێــك دەپــاڕایەوەو تاوێکیش دەگریاو سنگ و بەرۆکی خۆیی دادەدڕی. ئەو دایکــەی کە تا ئێستــا گرژیو مۆنیت بەدەم وچــاویــەوە نەدیبــوو لەگــەڵ ئەو هەموو چەپۆکە دڕندانەی رۆژگارو ئەو گیروگرفتانەی کە رووی تێدەکــردن، بەڵام ئەمرۆ دەتووت وا تاوێکی تر پاپۆرەکەی نوقم دەبێت ، بەراستیش وابوو چونکە هەموو جارێك دەیووت «من چاوم بۆیە دەوێت هەتا وەیسی پێ ببینم» وەیسیش دوو رۆژە تەنها دڵی لێدەداو لە ئێستاو کەمێکی تردایــە ساردبێتــەوە، ئەم خەڵکــەیش هیــچ شتێکیان بۆ ناکرێت هەتا ئەم پاپۆرە نغرۆ نەبێت و ژێر ئاونەکەوێت تەنها ئەوە نەبێت کە دەڵێن «خوا گەورەیەو

خۆی یار بێت هەموو شتێك بەدڵی ئێوه دەبێت».
باوکت سەرگەرمی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە بوو کە لایەن خەڵکی ناو ژوورەکەوه ئاراستەی دەکران، بەبێ ئەوەی دەستی لەبەر پشتوێنەکەی دەربهێنێت و بیرو هۆشیشی لەسەر ئەو جێگایە بجوڵێت کە تۆی لەسەر راکشابوویت هەموو پرسیارێك وەڵامێکی دەقاودەق و کورتی بۆ ئامادە کردبوو. بەڵام ئەوەی تۆ لەم قەرەباڵغیو غەڵبە تێکەیشتبوویت تەنها ئەوەندە بووکە دوو رۆژە لەم پێخەفەدا بێهۆشیت و رۆژووت لە هیچ شتێك نەشکاوه.
خەڵکی ناو ژوورەکە گەیشتنە ئەو بڕیارەی بنێن بە دوای مامۆستای دێدا، بەڵکو تەشریفی بێت و بزانێت دەردەکەت چییە چونکە بەم زووانە دەستیان ناگاتە حەکیم. ئەم بڕیارەیش زۆر بەزوویی هێنرایەدی، خوا هەقە زۆری نەبرد مەلا عەلی هات، وە بەدەم سەرکەوتن بە پلیکانە بەردەکەدا لە زیکرو ناوی خوا هێنان نەدەکەوت. لەگەڵ دەرکەوتنی مامۆستا کۆمەڵێك لە پیاوان بەرەو رووی چوون ، هەموو دەستیان ماچ کرد، پاشان رێگای ئەو ژوورەیان نیشان دا کە تۆی لێ بوویت و هەرکەسێك لە جێگای خۆیەوە فەرمووی لە مامۆستا دەکرد هەتا گەیشتە ژووری پەنجەرەبەندو ئافرەتەکان هەموو سەرپۆشەکانیان بە سەریاندا داو ژوورەکەیان بەجێهێشت، بە تەنها دایکت نەبێت لەوێ مایەوه سڵاوی لە مامۆستا کردو لەنزیك دەرگاکەوه بەکزی لێی هەڵتووتاو و زۆربە وریایی خۆیی پێچایەوه بە شێوەیەك تەنها مەچەك و دەم و چاوی دیار بوون سەریشی بەسەر زەوییەکەدا شۆڕکردەوه، باوکیشت لە نزیك دەرگاکەوه راوەستا. لەو ژوورەدا دەرزیت هەڵدایە گوێت لە دەنگی کەوتنە سەرزەوی دەبوو هەتا مامۆستا دیواری بێ دەنگییەکەی بۆ لەقاندن.
ـ دوێنێ ئەم هەواڵەم بیست، لە مزگەوتەوه ویستم بۆ ئێره بێم بەڵام لە دێیەکەی دراوسێمانەوه ناردیان بە دوامدا بۆ مارەبڕین، ئیتر بۆم نەکرا لە گەڕانەوەشدا سەری لێ بدەم.
ـ هەموو خەڵکەکە «راست دەفەرموویت مامۆستا»
مامۆستا بە لاسەری تۆوه راوەستاو لەبەرخۆیەوه دەستی بەدووعا خوێندن کرد، پاشان دەستی گەیاندە ناوچەوانت و سەیری ژێر پێڵووی چاوەکانتی کرد تۆیش لەبەر گەرمی لەشتسپێنەیچاوت سوور هەڵگەڕابوو پێستت گوڵی سووری لێنەخشێنرا بوو، مامۆستا راپەڕیو هەستایە سەرپێ، چەند هەنگاوێك کشایەوەو دەمی بە وشەی (ئاوڵە) هەڵهێنایەوه ـ دایکت لە شوێنی خۆیەوه زریکەی لێهەستا، باوکیشت هەردوو دەستی لەبەر پشتوێنەکەی دەرهێناو دەستی بە چاوانیەوه گرت.
هێشتا شین و گریان کپ نەبووبوەوه، خەڵکی هەیوانەکە رژانە ژوورەوه هەموو رەنگیان زەردو لێویان وشك بوو بوو، کە ناوی ئەم نەخۆشییەیان بیست ژنان کەوتنە قژو پۆرتینەوه و پیاوان خێرا کەوتنە ئەوەی بەدوای چارەسەرێکدا بگەڕێن.
ئەم هەواڵە وەك تەقینەوەی بۆمبایەك لە هەموو ئاواییدا دەنگی دایەوه، بوو بە بنێشتە خۆشەی سەرزاری گەورەو بچووك و بە هەوێنی باسەکانی بێ ژنان و دەنگ وباسی پیاوانی ناو مزگەوت و ژێر پیرە داربییەکەی بەردەم مزگەوت.

دایکت و باوکت بە تەواوی هەرەسیان هێنا بوو بە ئەم نەخۆشیەی تۆو ئەو پاشاگەردانییەی مامۆستا دای بە سەر تۆی گرمۆڵە بوو لەکورەی ئازارو ئەشکەنجەی داو رۆژانی تەمەنی جوانیو خۆشنەدیویتا. بڕیارەکانی مامۆستایش لەو دێیەدا وێنەی جێبەجێ کردنی یاسای سەرزەمین و یاسای ئاسمان بوو وە پاشگەزبوونەوەیان لێنەدەکرا کەسیش نەك هەر جێبەجێی نەدەکردن بەڵکو بیریان لە جێبەجێ نەکردنی نەدەکردەوه،ئەوەی بیووتایە قسەکەی مامۆستا کەمێك لەنگە ئەوا دۆزەخی بۆ خۆی تاودابوو شاربەدەر کرا بوو، تەنانەت ئەگەر مامۆستا بیوتایە ماست رەشە ئەوارەش بووه رۆژێکیان پاش نوێژی جومعە بڕیاری دا کە ئەو کاربەدەستەی لە خەستەخانە بچکۆلەکەی دێدا کاردەکات دەبێت دەربکرێت لەبەر لەبەر ئەوەی فەلەیەو ئەهلی دۆزەخە ، پاش چەند سەعاتێك هەموو منداڵانی دێ بە چەپڵە (سەرکیس ئەفەندییان) رەوانە کردوو بەردەبارانیشیان کرد. خەڵکی دێی فێکرد ئەگەر

سەیرانکەرەکان ویستیان بەروبومەکانیان لێ بکرن ئەگەر قول رووت بوون یان قول رووتیان لەگەڵ بوو ئەوا پێیان نەفرۆشن، زۆربەی زۆری بەرهەمەکانیان کۆن بوونو لە کیلەرو کەنوو گۆزەو دێزەکاندا بۆگەنیان کرد ئەمانە هەموو لەلایەك بەڵام ئەو تاوانە درندانەی کەبەسەر تۆیدا سەپاند بەلای منەوە لەهەموو شتێك بە ئازارتر بوو.

پاش ئەوەی هەواڵەکە بەناو دێدا دەگەراو ماڵ نەما سەری پێدانەکات، پیران و بەساڵا چووانی دێ داوایان لە مامۆستا کرد کە چارەیەکیان بۆ بدۆزێتە وە پێش ئەوەی دەردەکە تەشەنە بکات و منداڵەکانی ئەوانیش بە دەردەکەی تۆ برۆن و ڕەنجەکەیان ببێتە ڕەنجەکەی فەرهاد.

ئێوارەی ڕۆژی دووهەم هات بۆ لات، بەڵام تۆ کەشکەڵانی فەلەکت لێ هاتبوە یەك نەچاوت هیچی دەبینیو نە لە هیچ شتێك دەگەیشتیت، تەنها مێشکت و دڵت ئیشیان دەکرد دڵنیایان دەکردیت کە ئێستا دێت و تاوانێکیتر دەخاتە پاڵ تاوانەکانی تری، بەڵام چۆن دەتوانیت ئەم هێرشە درندانەی بەربەست بکەیت کە تۆ کوێرو کەرو زارەتترەك بیت خۆ مامۆستا لەزمانی بێ دەنگی ناگات... لەو کاتانەیشدا بەزەیی لە بیروباوەریدا نامێنێت تا بلێ ئەمە تاقە کوڕی پیرە دایك و پیرە باوکیەتیو خۆ من حەکیم باشی نیم تا بزانم ئەمە ئاوڵەیە یان لە رزو تایە یان سێبەرۆیە، بەڵام چۆن دەبێت شتێك هەبێت و ئەو سەری لێدەرنەکات هەر لە ناونانی منداڵانەوە تا ژن مارەبڕین و یاسین و تەڵقین خوێندنی پێش ئەسپەردە کردنی مردووان پاشان لە سەوداگەری شت و مەك و نەخۆشیزانیو نووشتەکردن و ترس ڕەواندنەوەو تەلاق چاك کردنەوە....

هەر لە دوورەوە پێش ئەوەی بگاتە ژووری دوو پەنجەرەکەی کە تۆی لێکەوتبووین، دایکت و باوکتی کێش کردە دەرەوەو دەرگای ژوورەکەی لێ داخستیت فەرمانی دا کەس ئەو دەرگایە نەکاتەوە تاگیانی سپی دەردە کەیت و حەزرەتی ئیزرائیل دەبێتە میوانت، ئەمەیش تاکە ڕێگایەکە خودا پێی خۆشەو سوودی هەموو خەڵکی دێی تێدایەو ئاوڵەکە ئیتر بڵاو نابێتەوە، ووتی هەر تاوێکیش گیانی سپاردو ناڵەناڵی نەما ئەوسا دێم و من بە دەستی خۆم دەست و دەم و چاوەکانی دەنێمەیەك.

تۆ هەرگیز ئەو کابرایەت خۆش نەدەویست ئەویش هەرگیز چارەی تۆی نەدەویست، بەڵام وادیارە ئەم جارە بۆ دواجار زاڵ بوو بەسەرتداو دوا کوتەکی خۆیی لێوەشاندیت، ماڵەکەی بۆ بەجێهێشتن بەخش و هوری کەواو سەڵتە تازەکەیەوەو تادەهات دەنگی ترپەی جاش کەوشەکانی کزتردەبوو. دایکت دەروازەکەی لێ گرت و دەستی پێچا بە کەواکەیدا بە دەنگێکی لەرزۆکی پڕ لە گریانەوە لێی دەپارایەوە تا نووشتەیەك یا دەرمانێکت خەڵات بکات بەڵکو ببێتە نگینت وە پێی چاك بیتەوە ئەویش بەزەردەخەنەیەکەوە بە دایکتی ووت:ـ

ـ خودا گەورەیەو هیچ شتێك بەبێ خۆی ناکرێت..

ئەی هاوار لە ئاواییەکەی خۆتاندا کەس لەماتیو بێ دەنگی تۆ نەدەگەیشت هەندێکیان بەشێتیان دەزانیت کاتێك کە دەیانبینیت لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆی هاویندا و لەژێر خۆری سوتێنەردا یان لەچلەی زستانی تەڕوتووشدا بە ناو شەختەو سەهۆڵبەنداندا بەتەنها دێیت و دەچیت جارجار یکێش لە قوژبنێکی دوور لە ئاوایی چەند سەعاتێك بە تەنها دادەنیشتیت، تەنانەت شلێریش چەند جارێك ئەو پرسیارەی لێ دەکردیت بەڵام وەڵامی دەستگیر نەدەبوو، بەیانیەکی جەژن بوو دووبەدوو لەسەر ئەستێلکەکە دانیشتبوون لێی پرسیت:ـ

ـ وەیس، خۆزگە لەو ماتییەی تۆ بگەیمایە پاشان بمردمایە

ـ خوا نەکات

ـ دەپێم بلێ، بۆچی دەڵێی کاسەی دۆت ڕژاوە؟

ـ با نەزانیت

ـ بۆچی؟

ـ نامەوێت دڵت داخورپێنم ، گرەوە هەڵی بێنە

ـ دەقەیناکا چۆنی گەز دەکەیت گەزی کە، بەڵام خوابتپارێزێت

ـ لەچی ؟

ـ شتێکی زۆر ترسناك هەموو ڕۆژێك یەخەم دەگرێت، وادەزانم من و تۆ بەم زووانە لە یەکتر دادەبڕێین

ـ چۆن ؟

ـ نازانم

ـ ئەی چۆن وا دەڵێیت ؟

ـ خەوم دیوە

تۆ چاوت بڕیبوە نێو چاوە شینەکانی شلێرو سنووری ئەم دونیایەت پێشێل کردبوو تا شلێر ووتی

ـ وەیس .. وەیس

ـ گیانی وەیس

شلێر دەستی چەپی گەیاندە سەر شانت ودەستی ڕاستیشی هێنا بە دەم و چاوە زبرەکەتدا بەجۆرێك هەرچی سۆزو خۆشەویستیو بەزەیی هەبوو بەخشییە وەیسی کلۆڵ، پاشان لێوتان لەیەك ترانجاند هەتا هەناسەو گیانتان تێکەڵ بوو... لەم جیهانە فراوانەدا ئەو کچە جوانە تاقە هاوەڵ و هاودەمت بوو، جگە لەدایکت و باوکت و ئەو کەسێکیتر گوێی لە دەنگی تۆ نەبوو بوو لەو دێیەدا...

ـ شلێر کچی پیاوێکی خانەدان بوو، کاتی خۆی ئەم لە سکی دایکیدا بووە باوکی چووە بۆ کاروان بۆ ناوچەی شلێر، ئیتر ئەو چوونەی چوو بوو نە سەری هەبوو نە سۆراغ هەتا ئێستاش بە هیوای گەڕانەوەی باوکیەوە چاوەشینەکانی دەچێتە خەو، بێوەژنەکەی دایکیشی خۆی لەچل ساڵ دەدا بەڵام هیوای گەڕانەوەی بڕیبوو وە پرچی سپی هۆنیبووەوە خەڵکی ئەم دێیەش هەر خەریکی بوختان دروست کردن بوون بۆ ئەم ژنەو کچە جوانکیلەکەی ڕودانی چاکەیان پێدانە دەنان، لەیەکتریان دەپرسی بۆچی ئەم بێوەژنە نایەوێت شوو بکات تازە بە تەمای چییە؟ خۆ ئەگەر دار ئەرخەوانیش بووایە بەم بیست ساڵە قرۆڵ بوو بوو بەڵام ئەو هێشتا دەڵێی مانگەو بە ئاسمانی ئەم چیایانەدا دەدەرەوشێتەوەو خەرمانەی داوە هەروەها زۆر شتی تری لەم بابەتە، بەڵام ئەم نهێنییە ڕاستییەك بوو تەنها وەیس لێی بە ئاگا بوو تەنانەت شلێریش سەری لێ دەرنەدەکرد.

ـ تۆ بڵێی شلێر ئێستا چی بکات..؟

بەڵام داماوە دەتوانێت چی بکات، دڵنیابە ئێستا دەستەوسان وەستاوە، ئەگەر بیر لەوە بکاتەوە بێت بۆ لات ، دەبێت پێش ئەوە خۆییو دایکی جێگایەکی تر بدۆزنەوە کە ژیانی لە ئەوڕۆ بەدواوەیانی تێدا تەواو بکەن، چونکە مامۆستا بە پەیوەندییەکەی نێوانتانی زانیبوو وە کۆمەڵێك لە دەست و پێوەندەکانی خۆیی کردبوو بە چاودێر بەسەر تانەوە بەڕۆژان و سەعات بێ خەبەرتان نەدەبوو.

شلێر لەسەر بانیژەکەی خۆیان بەرامبەر بەژووری پەنجەرەبەند دانیشتووەو سەرتاپای خۆیی لە قور هەڵژەندوو، تۆیش لە گیانەڵڵادایت بەدەم ئازارێکی جەرگبڕەوە گرمۆڵە بوویت و ورێنە دەکەیت، هەرچۆنێکت کرد خۆت گەیاندە ئەو پەنجەرەیەی کە بەسەر ئاواییدا دەیڕوانی، لەسەر شانۆی دێدا تەنها شلێرت بەدی کرد هەموو گیانی لەقوڕ نابوو، ئای چەند تامەزرۆ بوویت ئێستا شلێر لە ئامێز بکەیت و بەسواری گالیسکەیەك هەموو کون و کەلەبەرێکی شەقامەکانی ئاسمانی بگێڕیت، پێڵوەکانیشت دوو ئەوەندە ئارەزووی یەکتری گوشینیان بوو بۆ ئەوەی مامۆستا نەیەت و بە دەستی خۆی دایان بخات.

چاوت قورس بوو، دەستت بە پەنجەرەکەوە شل بوو، هەستت بە تەزوویەکی زۆر خۆش کرد بە لەشتدا تێ پەڕی، گوێت دەزرگایەوە، شتی زۆر سەیر لەبەر چاوتدا دەهاتن و دەچوون ، واتدەزانی دەستێك گەیشتووەتە دڵت وە بەتەمایە شتێکی لێ دەربهێنێت، لە دڵی خۆتدا ووتت وادیارە ئەو مردنەی خەڵك باسی دەکەن ئەمەیە یانی ئەمە مردنە !!!؟ نەء. نەء ئەمە ژیانی ڕاستەقینەیەو لێرەوە دەست پێ دەکات، چونکە بەردەوامەو کۆتایی نایەت، هەر شتێکیش سەرەتای نەبێت و کۆتایی هەبێت هەرگیز ژیان نییە، نەخێر قیژەو هاوارو زریکەی ژنان لەبری چەپڵەو ئافەرین بەناو چەم و دۆڵەکانی دەوروپشتی ئاواییدا دەنگی دەدایەوە، گیانی تۆش لە شێوەی هەورەبروسکەیەکدا بە لا سەری دێدا گوزەری کردو ماڵئاواییت لێ کردن ئەوان بۆ تۆ دەگریان تۆیش بۆ ئەوان دەگریاییت بۆیە بارانێکی زۆربە خوڕ باری.

O

# رێنوار

## هونەرمەندی ئیمپرسیانیزمی مەزن



ئاهەنگی دانس

○
نووسینی
محمد عارف
○

● هەر لەسەرەتای ژیانیدا، دەست کورتی هێرشی بردوەتە سەر نیگارکێش و یەکێک لە دامەزرێنە مەزنەکانی قوتابخانەی هونەری نیگارکێشانی ئیمپرسیانیزمی واتە: (إنطباعي) (رێنوار)، بۆیەش هونەرمەند لە تەمەنی سێزدە ساڵیەوە بە ناچاری و بۆ زامن کردنی پارووی ژیان، دەستی بە هونەری بازرگانیو رەسم کردنی نەخش و نیگاری پەردەو باوەشێنەو فەخفووری کردوەو بۆ ماوەی هەشت ساڵ خەریکی ئەم جۆرە هونەرە بووە، تا لەتەمەنی بیست و یەك ساڵیدا لە ستۆدیوی هونەریی (گلێیر)دا خوێندوویەتیو هەر لەوێش پەیوەندی برادەرایەتیو دۆستایەتی لەگەڵ هونەرمەندانی ئیمپرسیانستی: (مۆنێ)و (سیسلێ)دا بەستوە.

● رێنوار لە شاری (لیمۆژێ)دا لە ساڵی ١٨٤١ لەدایك بووە، لە تەمەنی چوارساڵیدا، بەخێزانەوە لەپاریس جێنشین بوونە.

هونەرمەندی ریالیستی مەزن (کۆربیە) لەسەرەتادا کاریگەری تەواوی لە قۆناغە ئامادەییەکانی هونەرمەند کردوە، بەڵام هونەرمەندی بەهرەدار، بەرە بەرە خۆی لەم کارتێکردنە رزگار کردوەو کاروانی هونەریی خۆی بەرەو جیهانی ئیمپرسیانیزم بردوە.

ئەوەی سەرنجی ووردبینەکانی هونەر رادەکێشی، ئەوەیە کە هونەرمە





ئافرەتە چەتر هەلگرەکان

...ێر دلسۆزانە هەولی چارەسەرکردنی ...کێشەی «چۆنیەتی رەسم کردنی مرۆڤی لە ...مرەوەی بیناو ستۆدیۆ داوەو کارتێکردنی ...تیشکی رۆژو هەوای لەم مرۆڤە یاخود ...مو...لە سرووشتیە شیکردوەتەوەو بە ...ەرکەوتوویی بەهۆی رەنگە ...نەکانی‌یەوە بەرجەستەی کردوە، تاکو ...بووتە شۆرەسواری ئەم گۆرەپانە هونەرییە».

بەلام رێنوار لەچەند نیگارێکی ...مربارەی (پلانێر) واتە: (سرووشتی ...مرەوە) تا پلەیەکی سەرنج راکێش لە ...یگارەکانی هونەرمەندی ئیمپرسیانستی مەزن: (کلۆد مۆنیە) نزیك بووە ، بەلام ...ەرلەنوێ خۆی لەم کارتێ کردنەش ...گار کردوەو رووی لە جۆرە ...مەزراندنێکی هونەری) تازە کردوە ...ەوەی کە مرۆڤی کردوەتە سەنتەری بایەخ ...ی سرووشتی وەك پاشەکۆی ئەو مرۆڤە ...ەکار هێناوە.

● رێنوار بە شێوەیەکی دوور لە ...ەترسی، هەولی دەربرینی زەمینەی تایبەت ...ە قوتابخانەی ئیمپرسیانیزم داوە، ...تایبەتی دەربرینی (جوولانەوەو ...ینامیکیەت لەژێر کارتێ کردنی تیشکی رۆژ یاخود پلانێر)...

ئەم زەمینەیەی کە سەدان (کێشەی هونەریی) تێدایەو تەنیا شۆرەسوارانی مەیدانی هونەر دەزانن، زال بوون و دەستەمۆ کردنیان چ ـ ئەرکی فەرهاد ـ یکی دەوێ‌و چۆن هونەرمەندانی ئاسایی‌و دوور لە پسپۆریی لەم داهێنە مەزنانە پاش گەز دەبنەوەو دووره پەرێز دەوەستن.

● رێنوار لەگەل ئەوەی (رووداو) بەمانای دراماتیکی زۆر کەم لە نیگارەکانی رەچاو دەکرێ، بەلام چۆنیەتی دەربرینی (سیمفونیای رەنگ)... خۆشەویستی ژیان، گەشبینی، جوانیی ئافرەت، قەشەنگیی سرووشت، وای لەم هونەرمەندە کردوە کە پایەکی بەرزو بلند لەجیهانی ئیمپرسیانیزم داگیر بکات.

لە حەفتاکاندا گۆرینێکی سەرنج راکێش لە بەرهەمەکانی رێنوار رەچاو دەکرێ، ئەویش گۆرینەوەی (تەکنیکی پەلە رەنگە بە هێلی دەرەوە) واتە لەجیاتی بەکارهێنانی رەنگ بۆ بەرجەستەکردنی رووالەت یاخود (فۆرما)، هونەرمەند زیاتر پشتی خۆی بە هێلی دەرەوە واتە بە هونەری هێلکاریی بەستوەو بۆیەش لە هەشتاکاندا رووی لە رێبازو زەمینەی هونەری کلاسیکی کردوەو سوودی لە مامۆستای ئەم قوتابخانەیە: (پووسسان)ی مەزن وەرگرتوەو تا رادەیەکی تەواویش رووی کردوەتە مامۆستای هونەری ئەکادیمی (ئینگر)و ئەم قوناغە تازەیەشی لە نیگاری (چەند ئافرەتێك لەسەر روخی رووبار خۆیان دەشۆن) بەرجەستە کردوەو ماوەی سێ سالی ژیانی بۆ ئەم لێکۆلینەوە هونەرییە تەرخان کردوە.

● بەداخەوە لە نۆهەدەکاندا خۆری هونەریی رێنوار بەرەو ئاوابوون شۆربوەتەوەو ئاستی هونەرە بەرزەکەی بەرەو نزمی چووەو رەنگە تەنك و پر هەستەکانی کەمێك رووی لە رەنگی زەق و رووخساریی واتە (فۆرمالیزمی) کردوەو لە جیاتی فۆرمای بەرجەستە کراو، فۆرمای تەخت واتە (فلات)ی بەکار هێناوە.

بەلام بەرهەم و شاکارە هونەرییەکانی ئەم نیگارکێشە مەزنە پایەو ئاستی بەرزی لە مێژووی هونەری فەرەنسی‌و ئەورووپی‌و جیهانی نزم نابێتەوەو بە چاوێکی پر لە رێزو خۆشەویستی هەتا هەتایی سەیردەکرێ.

●



ئاهەنگی نان خواردن لە بەلەم دا



# تیشکێك لەسەر فلیمی کارتۆن

نووسینی: محمد سالەیی

ئاشکرایە کەوا رۆژی ئەمڕۆمان فلیمی کارتۆن بووەتە جێگەی سەرسامی و حەزی بچووك و گەورە. واتە هەردوو پێکەوە وەکو ئاشنایەك لە بەرامبەری تەلەفیزیۆن دادەنیشن و بەپەرۆشەوە تەماشای سەرکێشیەکانی مشك و پشیلەو جووجەڵەو بەرازو کەروێشك دەکەن و دەدەنە قاقاو بە پشتدا دەچن... وەنەبێت مەزنی فلیمی کارتۆن هەر لەو قاوغەدا پەنگی خواردبێتەوە، بەڵکو بریتی‌یە لە شێوازو هۆکارێکی راگەیاندنی توند لەبۆ هۆشیار کردنەوەو پێگەیاندنی زارووکان، هەر بۆیە حەزم کرد کەوا ئەم کورتە باسەی لەسەر بنووسم.

### ● کورتە مێژوویەکی سەرهەڵدانی فلیمی کارتۆن

دەتوانین بڵێین کەوا مێژووی سەرهەڵدانی کارتۆن، پابەندە بە مێژووی هاتنەکایەوەی فلیمی سینەمایی لەسەر دەستی «لۆمێر».

هەروەها ئەو ئامێرەی کە «ئەمیل رینو» بەناوی «زویترۆب»ەوە دای‌هێنا، خۆی لەخۆیدا بریتی‌یە لەجۆرە فلیمێکی کارتۆنی ساکار.

ئامێرەکە چواردە وێنەی تێ دەکرێت و دەسووڕێتەوە، گەر لە کونێکی تایبەتی سەر ئامێرەکەوە تەماشای وێنەکان بکرێت، لەسەر تۆرەی چاو وێنەیەکی جووڵەدار دروست دەکات !!

هەروەها «ئەمیل کۆل» ناوێك توانی بەتەڵە شقارتە چەند کورتە فلیمێك وەبەرهەم بهێنێت.. بەڵام فلیمەکانی هونەرمەندی کاریکاتێریست «ماك کای» بنەمایەکی سەرەتایی فلیمی کارتۆنن.

لەوانە فلیمی «دەیناسووری مل درێژ - گێرتی - ساڵی ۱۹۰۹»و «لۆزیتانیا - ۱۹۱۸».

شایانی باس کردنە کەوا بەرهەم هێنانی فلیمی کارتۆن گەلێ لە فلیمی سینەمایی ئاسایی بە ئەرك ترەو کات و ساتێکی زۆری دەوێت، بۆ بەئاکام گەیاندنی... هەر دوا بەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی گێتی یەکەم، خەڵکانێکی هونەر دۆستی بێ شوومار روویان کردە فلیمی کارتۆن بۆ پشوودان و حەسانەوەو لەبیرکردنی کارەساتە ناهەموارەکانی ئەو شەڕە نەگریسە، جا بۆیە دەبینین لەو دەمەدا چەند کەسایەتیەکی کارتۆنی ناودار هاتنە گۆڕێ، وەکو «پشیلە فیلیکس» و «کوکو»و «کرازی کیت». بەڵام بناف دەنگترینی ئەو کەسایەتیانە بریتی‌یە لە مشکی فێڵبازو خۆشەویست «مێکی ماوس».

ئەم مشکە داهێنراوە زادەی بیری هونەروەری ناسراوو بلیمەت «واڵت دیزنی»یە. هونەرمەند دیزنی هەوڵێکی بێ پایانی داوە لەبەرەو پێشەوە چوونی فلیمی کارتۆن دا.. خاوەن بەهرەو توانایەکی بێ وێنەیە لە سکێچ کردن و دروست کردنی وێنەی سەگ و پشیلەو گورگ و مانگا بە شێوازێکی پێکەنیناوی هەست بزوێنەر. تەکنیکێکی دانسقەی وای هەیە کە تاوەکو ئەم رۆژگارەش هەر شوێنی سەرسامی و خۆشەویستی بینەرانین.

ناوبانگی مێکی ماوس لە ماوەیەکی زۆر کورت دا بەسەرانسەری گێتی‌دا وەکو پەتا بڵاوبووەوە و کرایە ناوی زۆربەی کۆگاو کۆمپانیاو کاڵا بازرگانیەکان. لە پاش داهێنانی مێکی ماوس هەندێ کەسایەتی بەناوبانگی تری داهێنا وەکو «دۆناڵد دك»و «بلوتۆ

**و جۆڤ»... هەروەها هونەرمەند دیزنی چەند فلیمێکی کارتۆنی درێژی نایابی دروست کردووە، لەوانە «ئالیست لە وولاتی سەمەران دا»و «شازادەی نووستوو»، و «سنۆوایت و حەوت کرکنەکان (الاقزام السبعة)».**

لە ساڵی ١٩٢٨ بەدواوە خۆی وەکو جاران راستەوخۆ وێنەکانی نەدەکێشا بەڵکو بووە کۆمپانیایەکی ناودارو گەلێ وێنەکێشی بەتواناو لێهاتووی خستە ژێر باڵی خۆیەوە.. بە کورتی یەکەی واڵت دیزنی مامۆستاو بلیمەتی فلیمی کارتۆنەو جێی شانازی ئەم هونەرەیە.
لەبەر ئەو هۆیەیە لەوولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکادا شارۆچکەی «دیزنی لاند» یان دروست کردووە بۆ یاری و کات بەسەر بردن.

لە ئەنجامی بەرەو پێشەوە چوونی لایەنی تەکنەلۆژیای فلیمی سینەماو کارتۆن، ئەرکی دەرهێنانی کارتۆن سوکتر



بوو و وەکو ئەنجامێك کۆمەڵێ کۆمپانیاو هونەرەوەرو شارەزای تر، هاتنە نێو بوارەکەو لەبەرهەم هێنان دا بەربەرەکانی کارەکانی دیزنیان دەکرد، لەوانە هونەرمەند «تێکس ئافیری» کەوا توانی لە کۆتایی ساڵانی چلەکان دا هەردوو مشك و پشیلەی ناودار «تۆم و جێری» دروست بکات. سەرکێشیەکانی ئەم دووانە باس لە رکەبەرکێی پشیلەیەکی زۆرداری دڵ رەش دەکات بەرامبەر بە مشکێکی چاکەخوازی دڵ ساف و وریا. هەروەها «واڵتەر لانتەر» زنجیرەی کارتۆنی «ئۆزواڵدی کەروێشك»ی هێنایە ئاراوە بەڵام «سیگار» لە ساڵی ١٩٣٣دا کەسایەتی ناسراو «پاپای دەریاوان»ی خستە بەر دیدەی بینەران...

پاڵەوانیەتیەکانی پاپای خەریك بوون مێکی ماوس لەبیرو دڵی یاوەرانی کارتۆن بسرنەوە. پاپای لە پاش لووش دانی سپیناخی نێو قوتوو دەبێتە یەك پارچە هێزو بازوو و ماسوولکەو بێ سڵەمینەو «بروتس»ی تاقە دوژمنی دادەپلۆسێت. لێرەدا دەبێت پەنجە بۆ ئەوە درێژکەین کەوا زنجیرەی کارتۆنی پاپای جۆرە پروپاگەندەیەکی بازرگانی یە بۆ ئەو کۆمپانیایانەی هەڵدەستن بە دروست کردنی قوتووی داخراو «معلبات».

هەتا دێ فلیمی کارتۆنی لە نوێ بوونەوە دایەو زۆر لای هونەری مەزنی گرتوتە خۆیو ئاسۆی داهێنان و بواری کارکردنی لەبەرەو دایەو بێپەروا بەرەو پێشەوە تەکان دەدات و بابەت و چیرۆکی هەمە چەشنە لە ئامێز دەگرێت وەکو بابەتی پروپاگەندەو ئەندێشەی زانستی... لەم هونەرەدا رۆڵی دیاری وولاتە سۆشیالیستیەکان ناتوانرێت نکوڵی لێ بکرێت و بخرێتە پشت گوێ. وولاتی یەکێتی سۆڤیەت سەردەستەی ئەو وولاتانەیە، پشت ئەستوور بەو هەموو ئەفسانەو داستانەی لەنێو نەتەوە جۆراو جۆرەکانیدا هەن توانیویەتی ئاستێکی هونەری بڵند بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن و روویەکی هەرە مرۆڤانەو پێشکەوتووی فلیمی کارتۆن بخەنە بازارەوە.

**● کاریگەری فلیمی کارتۆن لەسەر بینەر**

گومانی تێدا نیە کە بینەری پلەیەکی کارتۆن بریتییە لە منداڵ، هەرئەوە بەدیاریەوە بە ئاسەی سوار دەبێت و بێ چرپە تەماشای دەکات. وردەو دریشتی بابەتەکان دەرخ دەکات و پاڵەوانی کارەساتەکان دەچێتە نێو دڵ و گیانیەوەو خەونیان پێوە دەبینێت. بەڵام ئەو کاریگەرییە لەلای گەورە کەمترەو بە رادەیەکی نزمتر پێیان دەخرۆشێت، چونکە پلەی رۆشنبیریو تاقیکردنەوەی رۆژانەی مرۆڤی پێگەیشتوو گەلێ لەوە مەزنترە بروا بە رووداوەکانی نێو فلیمی کارتۆن بکات.

منداڵ بوونەوەرێکی سادەو بێگەردە وەکو ماددەی خاو وایە بۆ بوونیات نان و دروست کردن، لە تواناد هەیە چەشنی کاغەزی سپی لەسەری بنووسیت و پەیرەوی ئامۆژگاریەکانت بکات و رچەی ووتەو قسەکانت بگرێتە بەر.

هەڵبەتە مەبەستی سەرەکی فلیمی کارتۆن تەنها پێکەنین نیەو بەس، بەڵکو



سەربـاری گیـانی خۆشی بەخشیـەکەی ڕێبـازێـك و هۆیـەکی بەهێـزیشـە لەبۆ ڕاگەیاندن و فێرکردن و ڕێ نیشان دانی منـدالان. بەو پێیە دەبێ زۆر بەووردی ئاگـاداری جۆری ئەو فلیمانە ببین کەوا منـدالانمـان تەمـاشـایـان دەکەن و بە بینینیان کات بەسەر دەبەن... باشتروایە گەر لە توانـادا هەبێت، هەر فلیمێـك کە لەگـەڵ ڕەوتی پێگەیاندن و تێ گەیاندن هەنگاو نەنێت، نەخرێتە بەر چاوی منداڵ. چونکـە منـداڵ مرۆیـەکـی مێـشـك پێنـەگـەییـوەو خاوەن کەسـایـەتیـەکی چەسپاوو دەروونێکی پتەو نییە، زۆربەی ئەو شتانەی دەیانبینێت، کاری تێدەکەن و لە مێشـك و بیریدا دەمێننەوە. کەوابو پێـویستـە شتی وایان پێشان بدرێت کە لەگەڵ جۆری ڕۆشنبیری‌و شارستانیەتی خۆمـان دا بگـونجێت و بتـوانێ گیـانی هاوکـاری‌و خۆشەویستی‌و تێکۆشان لەبۆ ژیـانـێـکـی ئاسـوودەو بەختـەوەرتـر ببـەخشێت، ئەگینـا پێچـەوانـەی ئەم مەبـەستانە دەبێتە هۆکارێکی ڕوخێنەرو دروست کەری نەوەیەکی سەقەتی شێواو لە هزرو حەزو ئارەزوودا.

بەڵام هەزار ئەفسـوس و مخـابن، ئەمڕۆ زۆربەی کۆمپانیاکانی جیهان تەنها لەرووی گیرفان پڕکردن و بازرگانیەوە بۆ مەسەلەکە دەچن.

فلیـمی خەیـاڵی وەهـا دەردەهێنن کەوا بەبیری هیچ کەسێك دا نایەت و لە قوتوی هیچ عەتارێکیش دا نیە... پڕن لە دیمەنی ناقۆڵاو شەڕو کوشتن و خوێن و سەربڕین و پاڵەوانیەتی‌و ئازایەتی تاقە کەس لە نێو کۆمەڵ دا.

هەموو ئەمانە دەبنە مایەی ئەوەی منداڵ زوو بەزوو بڕوای بەکـۆمەڵ لاواز بێت و ببێتـە خاوەن کەسایەتی‌یەکی هەڵچوو و توندو تیژو بیرو ئەندێشەشی بەرەو ئاسمان بڕواو دوورکەوێتەوە لە واقیع و ژینگەی بەرجەستە.

زۆربەی ئەو فلیمە توندو تیژو پڕ لە کوشتنانە دەبنە جێگەی ترس و لەرز لە بۆ دڵی منـداڵی ناسـك و بێ‌گـەرد، هەروەها خەون بینینیان بە ئەژدیهاو دێوو درنج و دیمەنی ترسناك و تۆقێنەر. ئەمە سەرباری ئەو فلیمـە کارتۆنیانەی کەوا سێکسین و هیچ مەرجێکی ڕەوشت پاکیان تێدا بەدی ناکـرێت. خۆش بەختـانـە تاوەکو نووکە لەلای خۆمان لێ نەدراون، بەڵام بۆ فلیمی شەڕو تونـدو تیـژ ئەوا کەمتەرخەمی‌مان نەکردووە بەزۆریش لێ دەدرێن!! هەروەکو فلیمی کارتـۆنی «گرین دایزەر»و «پیاوی ئاسنـین»و «جـونکەر»و «فلاش گۆردن»و «زێندۆ» و «هێڵی ترسناك»و «خوماسی» و ئەوانی‌تر.

خۆ ئەوە لە فلیمـە کارتـۆنیـەکانی «یـۆجی کۆری» ژاپۆنی هەر مەپرسە، لە پیسی‌و ناقـۆڵایـی‌دا بەشی کەسـیـان نەهێشتۆتەوە!! تەنانەت زۆربەی وولاتانی گێتی دەرگایان لەروویان داخستوون.

فلیمەکانی زێتر دەچنە قاوخی فانتازیای زیـادە ڕۆی‌و سوریـالیەوە و نەك منداڵ گەورەش بەتەواوی لێیان ناگات. لە فلیمی «باخچەی ئاژەڵانی ئادەمیزاد ـ ١٩٦٠»دا دەبینـین لە بری ئاژەڵ پیاو کراونەتە نێو قەفـەسـەوەو لەلایـەن ئافـرەتـانـەوە دەچـەوسێنـدرێنەوە.. هەروەها لە فلیمی «ئـەڤـین ـ ١٩٦٣»دا ئافـرەتێـك پیاوێك دەخـوات و پاشـان لە پاشـەڕۆکەکەیدا فڕێی دەداتەوە!!

ئەمـانـە هەمـوو بریتـین لە بیرو بۆچوونی مرۆڤی تەم و مژاوی نامۆی نێو کۆمەڵەکەی خۆی. جا بۆیە تاوەکو فلیمی کارتـۆنی لەبیرو بۆچوونی خۆمان نزیکتر بێتـەوە، ئەوا ڕاژەی زێتر دەبێت و جێ‌و شوێنێکی بە پێزتر لەبیرو هۆشی زارووك و گەورە دەگرێتەوە.

● **شاکارە ئەدەبیەکان و فلیمی کارتۆن**

پێـویستـە کارتـۆن جگە لەلایەنی پێکـەنیناوی بایەخی زۆریش بەبابەت و ناوەڕۆك بدات و هەوڵ بدا شتی بەسـود بخاتە بەر دیدەی منداڵان.

خۆش بەختـانـە هەنـدێ لە کۆمپـانیـا جیهـانیـەکـان ڕوویـان کردۆتـە شاکارە ئەدەبیەکان و وەکو چیرۆك و بابەتی شیاو دەیانکەنە فلیمی کارتۆنی.

لەراستـیـدا ئەم کارە هەوڵێکی پیرۆزەو دەبـێـتـە هۆی ئەوەی کەوا منـدالان لە نزیکەوە بێ خوێندنەوە بەرۆمان و چیرۆکی گەورە بویـژانی سەر ئەم زەمینـە ئاشنا ببن. لەبـەرئـەوەی زۆربـەی بەرهـەمـە ئەدەبیـە بەنـاوبانگەکانی جیهان بابەتی مرۆڤـایەتی هەڵدەگرن و باس لە ژیری‌و چاکە خوازی دەکەن و بەشێوازی هونەری بەرز لایـەنـی ڕاسـتـی‌و ڕووی درۆو زۆرداری دەردەخەن... بەڵام دەبێت ئەو کۆمپانیایانە بابەتی ئەدەبی وەها بقۆزنەوە



ـەگەڵ رادەی بیرکردنەوەی زارووکان دا ـگونجێت و شتی بەرزو و تەم و مژاویان ـیتـان نەدەن، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ـەوەلابونیان لەو جۆرە فلیمانە. بۆ نموونە ـهێنین ئەگەر رۆمانی «تاوان و سزا» کەی ـیستۆفسکی یاخـود «نـامۆ»کەی ئەلبێر ـکمۆ بکرێنە فلیمی کارتۆن، چەند منداڵ ـهیە بەدڵەوە سەیریان بکەن و پاشانیش ـیان بگەن.. ئەوا لێرەدا ناوی هەندێ لەو ـاکـارە ئەدەبیـانـە دەهێنمـەوە کەوا ـسەرکەوتوویی‌یەوە کراونەتە فلیم و لای خۆشمان لێدراون:ـ

١ـ گەشـتـەکـانـی گۆلیفـەر نووسینی جۆناسان سویفت.

٢ـ رۆبنسۆن کروزۆ نووسینی دانیاڵ ـیفۆ.

٣ـ کووری نۆتەردام نووسینی چارلز ـیکنز.

٤ـ تۆم سۆیار نووسینی مارك توین.

٥ـ سێ سوارچـاکـەکـە نووسـیـنـی ئەلیکسەندەر دۆماس.

٦ـ سووڕانەوە بە جیهان دا لەماوەی ٨٠ رۆژدا نووسینی جۆلز فێرن.

٧ـ رۆبن هوودو ئایڤن هوو وەلیـام تەل، لەبەرهەمی نووسەرانن.

٨ـ خەزێنەی سلێمان نووسینی هێنری رایدەر.

**● ئایا دەرهێنانی فلیمی کارتۆنی بەئەرکە؟**

دوورنیە هەندێك کەسان هەبن کەوا فلیمی کارتۆنی بە کارێکی ئاسان و سادە بێ بەها بزانن، بەڵام لە راستی‌دا کارەکە گەلێ لەوە مەزنتـرە کە بەو چاوەوە تەمـاشا بکرێت. ئەوەتا لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا دووبـارە سەرکـێشیـەکـانی تەرەزان و سۆپـەرمـان و شەمشـەمـەکـوێرەی پیاو «الرجـل الوطواط» دەردەهێننـەوە. هەر فلیـمـێکیـان دەیـان ملێـون دینـاری تێچـووە؟!! بۆ سەلمـانـدنی قسـەکـەی سەرەوەمـان فلیمی کارتـۆنی «مـەنجەڵی رەش» بۆ نموونە دەهێنمەوە. پاڵەوانی ئەم فلیمـە منـاڵێکی بزێوەو ناوی «تاران»ەو سەرچلێکی بێ وێنەی ئەندێشەو خەیاڵە. ئەم فلیمـە لەبـەرهەم هێنانی کۆمپانیای واڵت دیزنی‌یە... خوێنەری بەرێز پێویستە بێژین کە ٢٦٨ کرێکارو لێزان بۆ ماوەی پێنـج ساڵی رەبەق کاریان تێدا کردووەو ٢٥ ملیۆن دۆلاریشی تێ چووە. وێنەکانی ئەم فلیمە لە دەستکردی دوو نیگارکێشی کۆمپانیای ناوبراون خۆیان دەدەن لە دوو ملیـۆن و «٥١٩٢٠٠» وێـنـەو ماوەی فلیمەکەش نزیکەی یەك سەعاتە!!!

هەروەهـا فلیمێکی تر لە هولیـود دەرهێنراوە کەوا وێنەی کارتۆنی‌و ئەکتەری راستەقینە لەگەڵ یەکتری‌دا دەور دەبینن! ئەو فلیمەش ناوی «کەروێشك رۆجەر»ە. ئەم فلیمە سینەمایی کارتۆنی‌یە سەیرە لە دەرهێنـانی «ستیڤن سبیلبـەرج»ەو بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو سێ سەد نیـگـار کێشی بلیمەت بەبەردەوامی کاریان تێدا کردووە. ئەوجـا خوێنـەری بەرێـز خۆت سەرپشك بەو بزانە ئایا دەرهێنانی فلیمی کارتونی بەئەرکەیان نەء؟

خۆزگە ئێمەی کوردیش دەمانتوانی فلیمی کارتۆنی کوردی وەبەرهەم بهێنین، بەڵکـو منداڵانی کورد بەزمانی دایکزای خۆیـان کارتـۆنیـان دەبینی... من بەش بەحـاڵی خۆم لەگـەڵ بەرێـوەبـەری تەلەفیـزیـۆنی کەرکـوك لەسـەر بەرهەم هینانی شێوازێکی هونەری نزیك بەفلیمی کارتۆن، لەدەستکردی خۆم رێککەوتم کەوا بەزمـانی کوردی لەو تەلەفیـزیـۆنەوە بۆ مـنـداڵان بڵاوکـرێتـەوە، بەڵام مخـابن لەبەرچەند هۆیەك پرۆژەکە سەری نەگرت هەوڵەکەی منیش هەر وەکو ئاوات مایەوە...

شـایـانـی باسـکـردنـە زۆر بە شانـازییـەوە دەڵێم ئەوەنـدە چیرۆك و هەقایەتی فۆلکلۆری نایابمان هەیە کەببنە ماددەیەکی خاوی لەبن نەهاتوو بۆ بەرهەم هێنانی فلیمی کارتۆن لە دوا رۆژدا.


**بۆ ئەم نووسینەم سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە**

١ـ کتێبی افلام الرسوم المتحركة والدمى نووسینی رضا الطیار.

٢ـ کتێبی فهم السینما نووسینی لوي دي جانیتي.

٣ـ گۆڤاری فنون عربیة ژمارە «٥»، ساڵی ١٩٨٥.

٤ـ گۆڤاری مجلتي ژمارە «٤٥»، ساڵی ١٩٨٩

٥ـ علم وتكنلوجیا ژمارە «٥٠»، ساڵی ١٩٨٧.

٦ـ گۆڤاری العربي ژمارە «٣٦٨»، ساڵی ١٩٨٩.

٧ـ گۆڤاری السینما السوفیتیة ژمارە «٩».


٥

# هونەری نووسینی دراما

«دانا عەلی سەعید»

بەر لەوەی لە دەرگای ئەم جۆرە بابەت و لێکۆڵینەوانە بدرێ، پرسیارێکی پێویست و گرنگ خۆی قووت دەکاتەوە.. ئایا ڕێساو دەستوورێکی تایبەتی چەسپاو هەیە بۆ نووسینی دەقی شانۆیی؟ لەوەڵامدا دەڵێین: بێگومان نەخێر.. چونکە هیچ ڕێساو دەستورێکی چەسپاو نییە بۆ نووسینی شانۆیییەکی سەرکەوتوو. «دەقی شانۆیی» دامەزراندن و هەڵسانی کۆشکێکی تایبەت نییە کە پێویستی بە نەخشەیەکی ئەندازەیی هەبێت. بەڵکو کردەیەکی هونەری داهێنەرانەیە، هەروەك و هونەری شیعر نووسین یان هونەری چیرۆك نووسین یان هەر جۆرێك لە هونەرە ئەدەبییەکانی دی، کە هیچ جۆرە قاڵب و بازنەیەکی دیاری کراوی تایبەت بەدەوریاندا نەکێشراوە، یاخود هێڵێکی ڕاست لە بەردەمیاندا درێژ نەکراوەتەوە، هەرچی لەو هێڵە ترازا، ئیتر سەرکەوتنی بەرهەمە ئەدەبییان هونەرییەکەی لەدەست دەرچوو. تارادەیەکیش ئەتوانین لێرەدا بڵێین بە پێچەوانەوە. گەلێك جار نووسەران بەهۆی ئەو دەرچوون و دەست نیشان کردن و دۆزینەوە نوێیانەوە سەرکەوتووتر بوون لەوانەی پێش خۆیان.

بۆ نموونە کاتێك «ئەسخیلیوس» کاراکتەری دووەمی لەسەر شانۆ زیاد کرد، بەمە هەنگاو و گۆڕێکی قەبەتری بەشانۆی سەردەمەکەی نا.. هەروەها «سۆفۆکلیس» بە کاراکتەری سێهەم شۆڕشێکی نوێی بەرانبەر پێش خۆی هەڵگیرساند. لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ بنەماو ڕێسایەکی دیاریکراوی چەسپاو نییەو نووسەرانیش لە گۆڕان و جووڵەیەکی بەردەوام دا هەڵدە سوورین، بەڵام لەهەمان کاتدا پێویستە لەسەر هەموو نووسەرێکی شانۆیی، شارەزاییەکی تەواوی دەربارەی بنەما سەرەکییەکانی هونەری نووسینی شانۆیی هەبێ‌و ئاگادار بێت لە چۆنیەتی‌و چەندییەتی دەرچوونی لەقاڵبە چنراوەکەی نووسینی شانۆیی. کەواتە شارەزایی زانستییە سەرەتاییەکە کارێکی پێویست و حەتمییەو پابەند نەبوون و دەرچوونیش لەو قاڵبە دیاری کراوە سەربەستییەکی خودییە. کاتێکیش دەڵێین



«ئاگاداربوون لە زانستییە سەرەتاییەکە کارێکی پێویست و حەتمییە» لەسەر ئەو بنچینەو مەبەستەیە کە: ئایا نووسەرێك چۆن سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر نەزانێ دیالۆگ یان کاراکتەر (یان جۆرەکانی مل ملانێی شانۆیی یان پەیژەی دراماتیکی یان.... تاد. چییەو چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکات؟

بێ گومان نووسەرێکی سەرکەوتوو نابێت. هەربۆیە ڕۆشنبیرییە گشتییەکە، پاڵپشتێکی بەهێزو ڕێخۆشکەری توانای داهێنەرانەی نووسەر دەبێ‌و ئەمەیش دەسەڵاتی ڕەسم کردنی بیرو بۆ چوونەکانی لە قاڵبێکی هونەری بەرزدا ئاسان و فراوان دەکات. نووسەری شانۆیی پابەندی پانتایەکی دیاری کراوی بچکۆلەیەو پێویستیشە کۆمەڵێ ڕووداوی شوێن کەوتووی کۆمەڵێ کاراکتەری زیندوو ڕەسم بکات، لە کاتێکی ئێجگار کورتی دەست نیشان کراودا.. کە ئەمە خۆی لە خۆیدا نووسەر دەهاوێتە بەردەم تێڕامان و سەلیقەیەکی زۆر ووردی هونەری ئەوتۆ، کە بیرۆکەو بۆ چوونەکان، گەلێك بەزەحمەت لە نێوانی ئەو دیوارە تەنگ و باریکانەدا بێن و برۆن.

هەر ئەم تێڕامان و ڕۆچوونە ووردە هونەرییەش، دەست ڕەنگینی‌و وەستایەتی نووسەرێك لەنووسەرێکی دی جیادەکاتەوە. واتە سەلیقەی دارشتنە گشتییەکەو گرێدان و پێکەوە بەستنی بنەما بنچینەییەکان، یەکەیەکی ئیستاتیکی پتەوی لێك نەپچڕاو لەنێوان بابەتو شکڵدا پێك دەهێنێ‌و یەك

ـەوی تریان تەواو دەکەن و سەرجەم بەرهەمێکی بەرزو نەمر ـخولقێنن ئەمەیش بێ گومان لەخۆرانایەت، تاوەك و نووسەر ـرەزایی‌یەکی سەرتاسەری سەبارەت بە مێژووە پڕ ئاڵ و گۆڕەکەی هونەری شانۆی کۆن و نوێ نەبێت، لەسەر و ـانەیشەوە پێویستی بەوە هەیە، زانیای‌یەکی گشتی ـربارەی ئەفسانەو داستان و کەلەپوورو زمان و مێژوو و ـنستە کۆمەڵایەتی‌و دەروونی‌یەکان و جۆرەکانی مل ملانێی ـروڤ و کێشەکانی سەردەم هەبێ. بە مەبەستی چنین و حستنە رووی بابەت و کاراکتەرو رووداوە پڕ مل ملانێکانی ـزیندوویەتی و توند و تۆڵی، تاوەك و ئەو بەیەك گەیشتنە مەزن و کاریگەرەی نێوان تەختەی شانۆو حەشاماتی بینەرانێکی ـستەو خۆی رووبەروو، ساز بکات و پێك بهێنێ. هەربۆیە ئەگەر بڵێین: «نووسینی دەقی شانۆیی» لەهەموو بەشەکانی تری ئەدەب گرانترو ئاڵۆزترە، رەنگە بەهەڵەدا نەچووبین کەواتە لێرەوە بگەڕێین بەدوای ئەو بنەما بنچینەیی‌یانەدا کە ئەدەبی شانۆیی لەبەردەمدا کردووین بەگرانترین و ئاڵۆزترین بەشی ئەدەب و بزانین ئەو نهێنی‌یانە چین کە لەناوەخنی دەقی شانۆییدا خۆی حەشار داوە. بۆ ئەمەیش دەبێ یەکەمجار بگەڕێینەوە سەر ئەو بنەما سەرەکی‌یانەی کە دەقی شانۆیی پێك دەهێنن.. بۆ گەیشتن بەم مەبەستەیش بەپێویستی دەزانم، سێ کوچکە بنەرەتی‌و ئاڵۆزەکەی دەق وەربگرین و شی بکەینەوە:-

**یەکەم: دیالۆگ «الحوار».**

**دووەم: کاراکتەر «الشخصیه»**

**سێیەم: هۆنینەوەی شانۆیی «الحبكة المسرحیة»**

کەسەرجەمی بەشەکانی تری دەق لەمان ئالاون و لەمانیشەوە دەردەچن، ئاشکراکردن و گەیشتنمان بە نهێنی‌یەکانی ئەم سێ بەشە پێکهێنەرە بنەرەتی‌یەی دەقی شانۆیی، راستەوخۆ دەمانگەیەنێتە قووڵایی باسەکەمان و لەئامانجە گشتی‌یەکەیشمان نزیك دەکاتەوە.

**یەکەم■ دیالۆگ ■**

دیالۆگ چی‌یە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، پێویستە سەرەتا، دیالۆگ لەکاری درامی‌داو دیالۆگ لەووت و وێژی ئاسایی‌دا، لێکتر بترازێنین و جیا بکەینەوە. چونکە دیالۆگ لە ژیانی ئاساییدا، بازنەیەکی داخراوەو پەیوەست نییە بەهیچ جۆرە پێداویستی‌یەکی هونەری و فیکری‌یەوەو وورووژاندنی بابەتەکانیش تێکەڵاو و شێواوە، کەم ووتن و زۆر بڵێیی و گواستنەوەی بێ بنچینەی بابەتەکانیش بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ، بارێکی ئاسایی وەردەگرێ. بەڵام دیالۆگ لەکاری درامی‌دا مانـاو وەڵامێکی قەبەترو فراوانتر هەڵدەگرێ، کە لەژێر کۆنترۆڵێکی هونەری هەستیاردا گەشە دەکات و دەبزوێ، ئەمەیش بەتەواوی لەووت و وێژی ئاسایی دابڕ دەکات و جیای دەکاتەوە. لێرەدا بابزانین ئەو کۆنترۆڵە هونەری‌یە هەستیارە چی‌یە، کە دیالۆگ دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە؟ دیالۆگ دیارترین بەشە لەکاری درامی‌داو نزیکترین و باشترین هۆیە بۆ ئاشکرا کردنی بیرۆکەی نووسەرو گەیشتنی بە گوێی جەماوەر، هەروەها بە شێوەیەکی راستەوخۆ و نا راستەو خۆ شوێن لایەنەکانی کاراکتەر دەکەوێ‌و چرکردنەوەو بەرزکردنەوەی مل ملانێ‌و کێشە سادەو ئاڵۆزەکان لە ئەستۆ دەگرێ‌و سەرجەم یەکەیەکی: بابەتی ساز دەکات و هەردوو جەمسەرە هونەری‌و فیکری‌یەکە پێك دەگەیەنێ . لەهەمان کاتدا دیالۆگ ئەو هێڵە ئەستور و پتەوەیە کە بارە دەروونی‌و فیکری‌و کۆمەڵایەتی‌و مێژووی‌و.. تاد.

دەگەیەنێتە ساتەکانی نمایشو، شانۆو جەماوەر لەبەرەیەکدا کۆدەکاتەوە.

هەموو ئەمانە ئەو هۆکارەگرنگانەن کەناچارمان دەکەن، زۆر بەووردی‌و زیرەکانە لەدیالۆگ وورد ببینەوەو مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. دیالۆگی درامایی کۆمەڵێ خاسیەت و ئەرکی تایبەتی لەگەڵ پێی خۆیدا هەڵدەگرێ، کە کۆنترۆڵ و سیستمێکی هونەری زۆر هەستیارو بەرز بەرێوەی دەبات، هەربۆیە نووسەری شانۆیی دەبێ راستگۆیانەو هونەری‌یانە شوێن حاڵەت و دیمەنە شانۆیی‌یەکان بکەوێ‌و دیالۆگە درامایی‌یەکان دابڕێژێ، بێ ئەوەی هیچ جۆرە کەم و کوڕی‌و زۆرە کاری‌یەکی پێوە دیاربێ. واتە:

[ئەو دیالۆگە دەبێتە دیالۆگێکی درامایی، گەر لەرەوتێکی درامایی‌یەوە بێت و ببێتە هۆی خزمەتێکی درامایی دیاری‌کراو][1] دیالۆگ لەکاری درامی‌دا بەپێی کاراکتەرو رووداوەکان بەتەنها دانارێژرێ، بەڵکو بەپێی دیمەن و گۆشە وەرگیراوە جیاجیاکانی ژیانی کاراکتەرو رووداوەکان وەردەگیرێ‌و یاری پێ دەکرێ. چونکە دیمەن و رووداوەکان لەدەقی شانۆییدا، بەپێچەوانەی ژیانی ئاساییەوەیەو بازنە داخراوەکە شەق دەکات و کۆمەڵە بازنەیەکی کراوەی پێکەوە بەستراو پێك دەهێنێ، کەیەك ئەوی تر تەواو دەکات. هەر بۆیە دەبێ دیالۆگ تەواوکەری دیمەنە جیاجیاکان بێت و ببێتە بەشێکی زیندووی رۆنانە درامایی‌یەکە. نووسەر کاتێك وێنەی کۆمەڵە کاراکتەرێك دەکێشێ، بۆ ئەوەی کێشەیەك بکەنە رووداوێکی درامایی، بێگومان دەست نیشانی چەند گۆشەیەکی تایبەت و هەڵبژێردراو دەکات، کە هەر یەکێکیان بەشێکی گرنگی رووداوە گشتی‌یەکە دەخاتە روو، کەواتە پێویستە تێکرای شتەکان لەخزمەتی ئەو دیمەنە بەش بەشانەدا



یوربیـدس



سوفوکلیس



ارستوفانیز

بن، کەسـەرجەم کێشە جەوهەری‌و سەرەکی‌یەکە دەگەیەنێتە لوتکـەو دەیکـاتـە کێشەیەکی درامایی. لێرەدا ئەگەر دیالۆگ نەبوو پێکهێنەرێکی بنەرەتی دیمەنە شانۆیی‌یەکان.. بێ‌گومان یەکێك لەسیفاتە بنچینەیی‌یەکانی خۆی وون دەکات و بەمەیش ناچێتـە خانـەی دیـالۆگی درامـایی‌یـەوە. پابـەند نەبوون و خۆبەستنەوەی نووسەر، بەو چەند گۆشە مورتە هەڵبژێردراوەی کە مل ملانێ درامـایی‌یـەکـە لە نووکـە پێوە دەگـەیـەنێتـە تەوقەسەر، لە یەکەیەکی «کاتی» دیاری‌کراودا.. نووسەر ناچار دەبێ، دیـالۆگ بەشێـوەیەکی پڕمەبەست و جێگیر دابڕێژێ‌و خۆی لەهـەموو دیالۆگێکی کەم واتا و لاواز دوور بخاتەوە کە لەخزمـەتی پەرەسـەنـدنی دیمـەن و کاراکتەرەکاندا نەبێت بێ‌گـومان ئەمەیش بە شێوەیەك نا کە دیمەنەکان کاڵ و کرچ بکـات و کاراکـتـەرەکـان نادیـارو مل ملانێکـەیش ئاڵۆزو شاراوەبکـات بەڵکو بە شێوەیەك دیالۆگ لەنێوانی ئەو گۆشەو دیمـەنـە وەرگـێراوانـەدا تێکەڵ ببێ‌و بتوێتەوە کە یەکەیەکی ئیستاتیکی گشتی پێك بهێنن و لێکتر جیا نەکرێنەوە هەروەك و ئەو فەرشەی کە چەندەها شێوەی گوڵ و هێڵی لەسەر کێشراوەو سەرجـەم جوانی‌یـەکی تایبـەتی ئەوتۆیان درووست کردووە، کەهەست بەهیچ جۆرە کەم و زیادی‌یەك ناکەین. بۆ خوڵقاندن و گەیشتن بەو یەکـە بابـەتی‌و ئیستاتیکی‌یە، ئەرکێکی قەبەترو قووڵتـر دەچێتـە ئەستـۆی نووسەری شانۆیی، ئەویش پاش ئەوەی دیـالۆگ بەتەواوی دەبێتە بەشێکی پێکهێنەری دیمەنە شانـۆیی‌یەکە و مل ولانێ درامایی‌یەکە، بەهەمان شێوە ببێتە تەواوکـەری کاراکتەرەکان و سەرو مر ملکی کەسایەتی‌یەکان خۆیان بێت. واتە هەست بکەین کاراکتەرەکان خۆیان دەدوێن و بەشەردێن و ئاشت دەبنەوە. واتە کرێکارێك دەبێ هەروەك و کرێکـارێـك لەئـازارەکانی بدوێ‌و ئەفسەرێك وەك کابرایەکی سەربازی بیر بکاتەوە. نەك بەپێچەوانەوە، هەروەك لە هەندێ لەشانۆیی‌یە کوردی‌یەکاندا دێتە پێش چاو، کرێکارێك هەروەك و فەیلەسوفێك یان ئەدیبێك ئازارەکانی دەردەبرێ‌و کابرایەکی خاوەن کارگـە، هەر لەبـەر ئەوەی کەسایەتی‌یەکی سەلبی لە دەقەکەدا هەیە، ئیتر هەروەك مناڵێك دەدوێ‌و بیر دەکاتەوە. واتە ئەگـەر «کاراکتەرو دیالۆگ» هاوسەنگ و هاوجووت نەبن، ئەوە هەرگیـز ئەو یەکـە بابـەتی‌و ئیستـاتیکی‌یە درووست ناکات و کاراکتەرەکانیش یەك راست دەبنە ووتار بێژێك و بیرو بۆچوون و ویستەکانی نووسەر دەبێژن و دەڵێنەوە.

پێـویستـە دیـالۆگ نەك هەر بەتـەنهـا لەخزمەتی لایەنەکانی کاراکتەر دابێت، بەڵکو دەبێ لەخزمەتی پاش یان دوای لایەنە کانیشدا بێت. بەمانایەکی فراوانتر، دەبێ لەخزمەتی داهاتووی کاراکتەرو رووداوەکانیشدا بێت. واتە دەبێ هەموو دیالۆگێك، ئەرکێکی تایبـەت بەجێ بگـەیـەنێ‌و خۆی لەخـۆیـدا، ووزەو هێـزێکی فرەتـر بەدەقـەکـە بدات و بەشێـك لە لایـەنەکانی کاراکتەرو مل ملانێ گشتی‌یەکە راپەڕێنێ، هەروەك و دکتۆر «عبدالعزیز حمودە» دەڵێ: [ئەو رستەیەی نەتوانێ، شتێك بۆ بەدیـار خستنی لایـەنەکانی کەسێتی‌و پەرەسەندنی‌و رووداو زیاد بکـات، لەسەر شانۆ بەرستەیەکی مردوو دادەنرێت][1] نکوڵی لەوە ناکرێ کە دیالۆگ یەکێکە لە پێکهێنەرە گرنگەکانی ئیقـاعی شانـۆیی، هەربـۆیـە پێـویستە نووسەری شانۆیی گوێیـەکی مۆسیقی‌و هەستیاری‌و وای هەبێ، کەبزانێ چۆن دیالۆگەکانی بەپێی ئیقاعە گشتی‌یەکە دادەڕێژێ، ئەمەیش بە شێوەیەك بزانێ لە کوێدا خێرایی‌و لە چ حاڵەتێکدا راوەستان و چۆن دیالۆگی کورت و درێژ دادەنێ‌و دەبنە لایەنێکی هاوبەش و گرنگی ئیقـاعی نمایشە شانۆیی‌یەکە. هەروەها شارەزایی‌و ئاگـاداریـەکی تەواوی سەبـارەت بەچۆنیەتی دابەش کردنی دیـالۆگـەکـان پێ بە پێی نمـایشی شانـۆیی هەبێ، ئەمەیش بەمـەبەستی ئاسان کردنی کاری دەرهێنان و هونەری‌یەکانی دی. چونکە ئەو دابەش کردنە هونەری‌یەی دیالۆك، لەلایەکەوە رێگـە خۆشکـەری ئەکتـەرە بۆ زیـاتر گوزارشت کردن لەواتا شاراوەکـان و لەلایـەکی تریشـەوە دەسـەڵاتی دەرهێنـەر لەبەرجەستەکردنی نمایشە هونەری‌یەکەدا فراوانتر دەکات.

**دووەم: کاراکتەر «الشخصیة»**

گومـان لەوەدانییـە کە مل ملانێی درامـایی، بەکێشە سادەو



شـۆ



ئۆنیل



ئالۆزەکانیەوە، بەرگری کردن و خستنە رووی جۆرێکە لە مل ملانێکانی مرۆڤ.. مل ملانێی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا بێت، یاخود لەگـەڵ بەرانبـەرەکـەیـدا یا لەگـەڵ هێزە وونە چارەنووسی‌یە قەدەرەکاندا، یا لەگەڵ بیرورا کۆمەڵایەتی‌و فەلسەفی‌یەکاندا یان بیرۆکـە هاودژەکـانـدا بێت.. ئیتر هەر جۆرە شێوەیەك لە مل ملانێکـان بگرین، خۆی دەچێتە خانەی یەکێك لە کێشەکانی ژیـان و بیرکردنەوەو دڵەراوکەی مرۆڤەوەو سەرەنجامی بەلادا کەوتنی کێشەکەیش هەر بۆ مرۆڤەکەیە.

ئاشـکـرایـە کاراکـتـەری شانـۆیی، هەڵـگـری سیفـاتـە مرۆڤایەتی‌یەکانەو دەبێتە خاوەنێکی شەرعی مل ملانێ درامایی‌یەکە.

کەواتـە دەبێ نووسەری شانۆیی دەسەڵاتێکی بێ سنووری سەبـارەت بە ئاشـکـرا کردن و بەدیـارخستنی سیفاتە ووردو گەورەکـانی کاراکتـەر هەبێ و زۆر بەووردی شۆڕبێتەوە ناو تێکـرای لایـەنـە پێکهێنەرەکانی‌و تەواوی ئیشارەتە وێنەیی‌و فیکـری‌و دەروونی‌یـەکـانی بەدیـار بخـات. بۆ ئەم بەدیـار خستنـەیش پێـویستـە نووسـەری شانـۆیی شارەزایی‌یەکی فراوانی دەربـارەی هەرسێ لایـەنـە گرنگـەکـانی کاراکتەری شانـۆیی هەبێ، دۆزینەوەی ئەم سێ لایەنەیش لە کاراکتەری شانـۆییـدا، گەیشتنـە بەگیـان و جەوهـەری راستـەقینـەی کەسـایـەتی‌یـەکـانیان و هەر سێ قۆناغەکانیشیان «رابردوو، ئێستا، داهاتوو» ئاشکرا دەکات. ئەو سێ لایەنانەیش:ـ

یەکەم: لایەنی فسیۆلۆژی «لەشی»

کەتێکرای بارە ماددی و هەڵکەوتنە سروشتی‌یەکانی دەگرێتەوە

وەك: نێرە یان مێ، تەمەنی، درێژی، رەنگی پێستی، جوانی‌و ناشرینـی، لاوازی‌و قەڵەوی، پاکـی وپیسی، نیـشـانـە بۆ ماوەیی‌یەکانی، نەخۆشی‌یەکانی، نیشانە دیارەکانی‌و...تاد.

دووەم: لایەنی سۆسیۆلۆژی «کۆمەڵایەتی»

ئەم لایـەنـەیش شێـوەی گوزەران و چۆنیەتی بەڕێوە چوونـی ژیـانـی و کات و ـشوێـن و سەردەم و بارە کۆمەڵایەتی‌یەکانی ئاشکرا دەکات وەك: ئاینەکەی، ئیشەکەی، ئارەزووەکـانی، رەگەزەکەی ئەو چینەی تیایدا دەژی، ناوەندە کۆمەڵایەتی‌یەکەی، شێوەی فێربوون و رادەی خوێندەواری، لە کوێدا دەژی‌و لەگەڵ کێ..تاد

سێیەم: لایەنی سایکۆلۆژی «دەروونی»

ئەمـەیش ئارەزووە کەسـایەتی‌یەکانی‌و کەم و کوری‌یە دەروونی‌یـەکـانی‌و ژیـانی سێکسی‌و ئامـانجەکانی لەژیاندا‌و توانای نوێکاری و ئارەزووەکانی‌و بیرکردنەوەکەی و تێکرای بارە دەروونی‌یـەکـانی بەدیـار دەخات وەك: کۆمەڵایەتی بێت یان گۆشەگیر، تێکۆشەر بێت یان خۆبەدەستەوە دەر، هەڵەشەبێت یان هێمن، جوامێر بێت یان ترسنۆك و...تاد.

دیـاری کردن و بەرجـەستـەکـردنی ئەم سێ لایـەنە گرنگەی کاراکتـەر، ئەو تەنهـا رێگـە ساکـارو بێ کۆسپـەیـە، کە کاراکتـەرەکـان بەزینـدوویـەتی‌و سەلامـەتی دەگـەیـەنێتـە نمایشێکی سەرکەوتوو.

چونکـە ئەمـانـە ئەو نیشـانـەو هەڵس و کەوت و رەوشتـە سەرەکی‌یـانـەن کە کەسێـك لە کەسێکی دی جیـادەکەنەوەو تایبـەتمـەنـدو سەربـەخـۆ ناسراوی دەکـات. هەر ئەوەیش توێـژینـەوە هونـەری‌یـەکـە لەبـەردەم ئەکتـەرو دەرهێنـەرو هونەری‌یەکانی تردا ئاسان دەکات.

بەڵام هەندێك جار نووسەر دووچاری دانان و قووت کردنەوەی کاراکتـەری زۆر بچکۆلە دەبێ‌و لەوانەیە هێندەی پێویستیش نەتـوانێت بیخـاتـە خزمـەتی مل ملانێکـەوە و بەتـەواویش لایـەنەکانی دیاری بکات و گۆڕانکاریە بەردەوامەکەیشی تیادا ئاشکرا بکات. هەروەك کاراکتەری خزمەتکارێك یان پاسەوانێك

یان هەژاری دارایییەك، یان هەر جۆرێكی تربێت. لێرەدا ئەمە تەنها بۆ بەهێز كردنی رووداو و كاراكتەرەكانی دی نێو شانۆنامەكە كە بوونیان پێویستەو نەبوونیشیان كەم و كورییە. لەم حاڵەدا مەرج نییە نووسەر بەزۆرەكارییەكی نادروستەوە شوێن لایەنەكانیان بكەوێ، چونكە ئەمە تەنها بۆ خزمەتی حاڵەت و كاراكتەرو دیمەن و مل ملانێ گشتییەكان بەكار دەهێنرێ، ڕێك دەكەوێ هەندێك جار ئەم كاراكتەرە وردانە دەبنە بنكەیەكی زیندووی كاریگەری مل ملانێكە هەروەك لە شانۆیی «ئۆدیب بە پاشایی»دا كاراكتەری «شوان»ەكە بەدیار دەكەوێت. بە پێچەوانەیشەوە، خزمەتكارەكەی شانۆیی «ماڵی بووكە شووشە» كە تەنها خزمەتكارەو هیچی دی.

لێرەدا دەبێت ئاگاداری ئەوە بین، لەبەرئەوەی مل ملانێ درامایییەكە لە ئاستێكدا ناوەستێت و بەردەوام لە گۆڕان و بەرز بوونەوەدایە، دەبێ كاراكتەریش پێبەپێی ئەو گۆڕان و جووڵەیە هەنگاوی خۆیان بنێن و بەرەو ژوور و بەرەو خوار، شوێن دیمەن و قۆناغ و مل ملانێو پەیژە دراماتیكییەكە بكەون.

گەلێك جاریش ئەم شوێن كەوتنەی كاراكتەر بەپێی گۆڕانكارییە لە پلە دراماییەكە، دەچێتە خزمەتی كردارو گرێ سەرەكییەكەی دەقی شانۆییەكەو ئەوەندەی تر مل ملانێیە بەهێزو چڕ دەكات.

ئەگەر لە دەقە شانۆییە جیهانییە سەركەوتووەكان ورد ببینەوە، بەئاشكرا ئەم جووڵەو گۆڕانەی كاراكتەرمان بەرچاو دەكەوێت.. بۆنموونە لە شانۆیی «ماڵی بووكە شووشە»ی ـ هنریك ئیبسن ـ دا سەرەتا «نورا» ئافرەتێكی ساویلكەو سادەو منداڵەو پاشان بەپێی چڕ بوونەوەو بەرزبوونەوەی مل ملانێی دراماییەكە «نورا» دەگاتە تەواوی تێگەیشتنی فیكری و هۆشمەندی، تەنانەت دەگاتە بڕیاری خۆكوشتن و پاشان كە بەتەواوی حەقیقەتەكان ئاشكرا دەكات، بڕیاری جێهێشتن و رەفز كردنی مێردو منداڵ و ماڵەكەی دەدات و لە ماڵەكەی بەدەر دەچێت.

هەروەها كاراكتەری «هاملیت» لە شانۆیی ـ هاملێت ـ دا، [illegible] لەسەرەتاوە بە گومان و دڵەڕاوكەی كوشتنەكەی باوكی دەست پێ دەكات و پاشان بە كوشتن كۆتایی پێ دێ. یان شانۆیی «ئۆدیب بە پاشایی»ی ـ سۆفۆكلیس ـ سەرەتا بە گەڕان بە دوای چارەسەری بڵاوبوونەوەی كۆلێرادا دەست پێ دەكات و بە خۆكوشتنی «جۆكاستا»، و چاو هەڵكۆڵین و كۆچ كردنی «ئۆدیب» كۆتایی پێ دێ.

بێ گومان دەبێ ئەم گۆڕانكارییە هیچ جۆرە بەزۆر تێئاخنین و دەستكردییەكی پێوە دیار نەبێ و شێوەیەكی پلە پلەو ماقووڵ وەربگرێ. بۆ نموونە ئەگەر كاراكتەرێكی خراپ بەرەو تاوانێك لە سەرەتاوە هەنگاوی هەڵهێنا و بەهۆی هۆنینەوە دراماییەكەوە نەمانتوانی بگەینە ترۆپك و كۆتایی تاوانەكە، لێرەدا تەنها دڵەخورپەی نزیك بوونەوە لە تاوانەكە، یان هەوڵدان بۆ جێبەجێ كردنی تاوانەكە، هەمان واتاو مەبەست دەگەیەنێو رەنگە لەپای گۆڕانكارییە سەرتاسەرییەكەدا هیچی لە جێبەجێ كردنی تاوانەكە كەمتر نەبێ.

چڕی و توندو تۆڵی مل ملانێ درامایییەكە، لەو شانۆیانەدا كە پشت بەتەنها پاڵەوانێك یان دووان دەبەستێت، گەلێك جار هۆیەكی سەرەكی بەهێزكردنی كاراكتەرە پاڵەوانەكان دەبێت. چونكە راگرتن و هاوسەنگ كردنی هەردوو هێزە دژ بەیەكەكە بەرانبەر بەیەك، خۆی لە خۆیدا پاڵەوانەكەیش و مل ملانێكەی تۆانیشیان بەهێز دەكات و دەیكاتە پاڵەوانێكی نموونەیی.

**هەروەك بەهێزیو فێلبازیو زیرەكی [یاگۆ] لە شانۆیی [ئۆتێللۆ]ی ـ شكسپیر ـدا، كارەكتەری [ئۆتێللۆ] دەكاتە كاراكتەرێكی تراژیدییان بلیمەتیو هێزە كۆمەلایەتیو دەسەلاتە پیشەییەكەی كاراكتەری [القائمقام] لە شانۆیی [دوژمنی گەل]ـیـ[هنریك ئیبسن] دا كاراكتەری [دكتۆر ستۆكمان] دەكاتە پاڵەوانێكی نموونەیی. نەك هەروەك و لەوەبەر باسمان لێوەكرد، كە كرێكارێك تەنها لەبەرئەوەی كاراكتەرێكی ئیجابییە، هەروەك و كابرایەكی رۆشنبیرو زیرەك، بۆ شتەكان بچێو هۆكانی لێك بداتەوە و كابرای خاوەن كارگەو دەسەلاتداریش تەنها لەبەرئەوەی كاراكتەرێكی سەلبییە، ئیتر هەروەك و مناڵێكی نەفام و نەزان بجوڵێ و بیربكاتەوە. ئەو شانۆییانەیش كە پشت بەتەنها پاڵەوانێك نابەستێت و كۆمەڵە كاراكتەرێك دەبنە كارگێری سەرەكی مل ملانێكە. ئەوا پێویستە بە توانایەكی بەرزەوە كاراكتەرەكان لێكتر جیابكاتەوەو هەریەكەیان سیفات و شێوازی تایبەتی خۆی بداتێ، بەبێ ئەوەی هیچیان لەیەكتری بچن. باشترین نموونەی ئەم جۆرە شانۆییانەیش، شانۆیی «ماڵی بووكە شووشەی» ـ هنریك ئیبسن ـ ە. كەشانۆییەكی كۆمەڵێیەو بوونی هەریەكێكیان لەوەی تریان كەمتر نییەو سەرجەم دەبنە خزمەتی مل ملانێ گشتییە دراماییەكەوە. كاراكتەری «نورا» سادەو ساكارە و هەموو دڵسۆزی خۆشەویستییەكی بەرانبەر مێردو منداڵەكانیو هاوڕێكانی هەیەو هەمیشە ئامادەیە، هەمووشتێك لەپێناوی**



ماڵەکەیدا بکات و تەنانەت سەرباری گرێ و گرفتە گەورەکانی ژیانی خۆی، دڵنەوایی «لیندا» و «دکتۆر رانك» دەکات و خەمیان پێوە هەڵدەگرێ و لەپێناوی مێردەکەیشیدا، ئامادەیە ئەو پەری رەنج و شەونخونی بکێشێت. کەچی کاراکتەری «تۆرڤالد» بە پێچەوانەوە، کابرایەکی خۆویستەو هەموو شتێك لە پێناوی ناوەندە کۆمەڵایەتی‌یەکەیدا دەکات و تەنانەت «نورا»یش بەچاوی بووکە شووشەیەکەوە تەماشا دەکات و تا دەگاتە ئەوەی لەترسی پیشەو رێزە کۆمەڵایەتی‌یەکەی بە رووی «نورا»دا بتەقێتەوەو هەموو دڵسۆزی‌و خۆشەویستی‌یەکی «نورا» مایە پووچ بکات و بەتاڵ بکاتەوە. هەروەها کاراکتەری «کروجستاد»، کابرایەکی کەوتووەو هەمیشە بەدوای کەم و کوری کەسانی تردا دەگەرێ‌و دەیەوێ لەو رێگەیەوە ئاواتە لەدەست چووەکانی خۆی بگێرێتەوە. هەرچی «دکتۆر رانك»یشە، سەرباری نەخۆشی‌یە کوشندە بۆماوەیی‌یەکەی، کابرایەکی رۆحانی، عاشقەو بەهێمنی‌و بێدەنگی خۆشەویستی‌یەکی مەزنی بەرانبەر «نورا» هەیەو شاردوەتەوە. خاتوو «لیندا»ش ئافرەتێکی خوێندەوارو تێکەیشتووە و هەموو شتەکان لێکدەداتەوەو بەووردی بەرەو چارەنووسی ودواڕۆژەکانی ژیانی دەچێت.

لەکۆتاییدا دەبینین، هەر کاراکتەرێك لەوی دی جیاوازە و هەریەکیان تایبەتمەندی‌یەتی خۆی وەرگرتووەو سەرجەمیش دەچنە خزمەتی بیرۆکەی سەرەکی «هنریك ئەپسن»، ئەویش بەرانبەر کۆمەڵەکەی‌و سەردەم و تێگەیشتنە کۆمەڵایەتی‌یەکانی خۆی.

کەواتە چۆنیەتی چر کردنەوەی مل ملانێ سەرەکی‌یەکە، لەئەنجامی دارشتنی کاراکتەرە لەیەك نەچووە بەهێزەکان، بەتەرزێکی توندو تۆڵی سەربەخۆ، خۆی دەبێتە یەکێك لە گرنگترین هۆکارە سەرەکی‌یەکانی سەرکەوتنی دەقی شانۆیی. ئەوەتا «عادل نادی»، سەبارەت بەوەرگتنی ئەو دەنگە خودی‌یە سەربەخۆیەی کاراکتەر دەڵێ:

[پێویستە ناکات نووسەری شانۆیی، سەرجەم کاراکتەرەکانی بەشێوەیەکی گونجاو و رێك و پێك دەخولقێنێ.. یان بە واتایەکی تر، هەموو کاراکتەرەکانی لەسەر یەك تەرزو شێوە دەنووسێ. بەڵکو دەبێ کاراکتەرەکانی هەر بە تیپێکی موسیقی بچن، کە هەر ئامێرە دەنگێکی تایبەتی دەردەکات کە لەیەکتری جیاوازە، و بالانسیش هەمیشە ویان پێکەوە پارچە موسیقایەکی پێکەوە گونجاو و تێکەڵاو بەیەکترمان دەدەنێ...][3]

سێیەم: «هۆنینەوەی شانۆیی» «الحبکة المسرحیة».

سەبارەت بەهۆنینەوەی شانۆیی دا ئامین بە دڵنیایی‌یەوە ئەڵێین ئەو دەێنی یە شاراوە هونەری‌یە زۆر کاریگەرەیە، کە لەناوەندی دەقی شانۆییدا خۆی حەشارداوە، یان دەمانایەکی تر، ئەو دەزوولە گرنگ و ئاسایی‌یە، کە سارەبەی پێکهێنەری هونەری یا فیکری‌یەکانی دەقی شانۆیی پێکەوە دەبەستێ و یەك لەوی تردا دەهاندرێنێیەوە، دەنێو وەرگەیشتن بەو دەزوولە بالایەدا، ئەوزەبنە سەرەتایی‌یە لەبەردەم نووسەری شانۆییدا خۆش دەکات کە بەهۆیەوە بەسەر یەکی دات و شوێن و رووداو کاراکتەر و دیالۆگ و سارەبە پێکهێنەرەکانی تری دەقی ... زاڵ دەخات وهەروەها ئەو پەیژە هونەری‌یە ئەندازیی‌یە بێ مەترسی‌یەیە، کە ... دەنگاو دەگەیەنێتە لوتکەو ترۆپکی کاری هونەری‌یەکە.

ئەو ... شانۆیی بەشی ... هۆنینەوەکەی لاوازو ... بێت، ئەوا رۆنانە دراماییەکەی کاڵ و کرچ و بێ ... دەبێ و ئەو سیستەمە گشتی‌یەی کە هەر هەموو بەش و لقەکانی «دەق» کۆدەکاتەوەو رێکیان دەخات، لەگرێژنە دەباو لەدەست دەدات. هەربۆیە ئەتوانین بڵێین، هۆنینەوەی شانۆیی بریتی‌یە:

[لە قاڵبی گشتی کردارو هێڵی گەشەکردنی چیرۆك.. ئەو هێڵە کردەیی‌و هونەری‌یەیە، کە لە رێگەیەوە کاراکتەرو تێکرای پێکهێنەرە دراماییەکان، خۆیان ئاشکرا دەکەن][4]

هۆنینەوەی شانۆیی کۆمەڵێ قۆناغی شوێن یەك کەوتووە، کە یەك سەرەتای ئەوی ترەو تێکرا دەچێتە خزمەتی بەرزکردنەوەی مل ملانێکەو رۆنانە درامایی‌یەکە پێك دەهێنن.. ئەو پەیژە.
درامایی‌یەش بریتی‌یە لە:

**١- دیباچە، یان سەرەتای درامای : «التقديمة الدرامية أو العرض»**

ئەو دیمـەنـە سەرەتایی‌یەیە، کە کات و شوێن و رووداوەکان ئاشکرا دەکات و پەیوەندی کاراکتەرەکان دەخاتە روو، لەگەڵ هەنـدێك پێشبینی بۆ چوونـە ناو رووداوە گشتی‌یەکەوە. بە مەرجێ ئەم سەرەتایە دابڕ نەبێ لە دیمەنەکانی داهاتوو.

**٢- خاڵی دەرچوون. «نقطة الأنطلاق».**

ئاشکرا کردن و دەست پێ کردنی سەرەتای رووداو و مل ملانێ گشتی‌یەکە، واتە خاڵی یەکەمین چوونە ناوەوەی کێشە شانۆیی‌یەکە.

٣- رووداوی بڵندرۆ: الحدث الصاعد».

ئاڵۆزکردنی کێشەو بەدیار خستنی چەند رووداوێکی دی، کە لە خزمەتی چڕ کردنەوەی مل ملانێ گشتی‌یەکەدا بێت.

**٤- دۆزینەوەکان: «الأكتشافات»**

دۆزینـەوەو ئاشکرا کردنی ئەو جەمسەرە کاریگەرانەی کە لە رووداوە گشتی‌یەکە کۆبوونەتەوەو قەوارەی مل ملانێکە قەبەترو چڕتر دەکەن.

**٥- پێشبینی کردن: «التنبؤ أو التلميح»**

پێشبینی‌و جۆرە ئیشارەت کردنێکە بۆ رووداوانی کارەساتێك.. یان بەیەکداچوونێکی درامایی.

**٦- گرێ سازکردن: «التعقيد»**

چڕکردنەوە ئاڵۆزکردنی کێشەکەو، کۆسپ و گرێ دروست کردن لە بەردەم چارەسەری کێشەکەدا.

**٧- دروست کردنی تامەزرۆیی :« التشويق»**

سازکـردنی هەنـدێك رووداوی لاوەکی سادەو بەچێژ، شان بەشـانی گرێ شانـۆیی‌یـەکـەو چڕکردنەوەو ئاڵۆزکردنی مل ملانێکـە، هەست و سۆزی بینـەر بەرەو قووڵایی‌و بابـەتەکە رادەکێشێ‌و بەمەیش چێژی بینین لای جەماوەر دروست دەکات.

**٨- تەنگ و چەڵمەی درامایی: «الأزمة»**

سەرەتـای چاوەروان کردنـی تەقینـەوەی رووداوەکـانـەو، بەیەکداچوونی کێشەو مل ملانێکەیەو نزیك بوونەوەیە لە کۆتایی

**٩- ترۆپك : «الذروة»**

لوتکەی بەیەکداچوونی رووداوەکانەو خاڵی کۆتایی گەیشتنە بە دوا قۆناغ و سەرجەمی رووداو مل ملانێکانی تیادا دەتەقێتەوە.

**١٠- رووداوی نزمرۆ: «الحدث الهابط»**

کۆتـایی تەقینـەوەکـەیەو هاتنە خوارەوەی رووداوەکانەو ئیتر تیـایـدا جەمسـەری کۆتی‌یـەکە تێکر دەبێ‌و سەرەنجامی بەیەکدا چوونەکەیش دەردەکەوێ. بە پێی کۆتایی جۆری شانۆ نامـەکە، یان بە پێی ویستی نووسەری شانۆیی، بە مەرجێك هاتنە خوارەوەیەکی مەنتقی وەربگرێ.

**١١- چارەسەرو کۆتایی: «الحل»**

دوا چارەسەرو بەلادا کەوتنی رووداوەکانەو کۆتایی پێهێنانی شانۆیی‌یەکەیەو بە دیارخستنی سەرەنجامی کێشەکانە[٥].

★★★

**هۆنینەوەو مل ملانێ:**

تەنها خاڵێکی سەرەکی کە هۆش و سۆزی بینەران بە تەواوی و بەردەوامی بۆ شەرشانۆ رابکێشێ «مل ملانێ» یە. چونکە هەر ئەم مل ملانـێ بەردەوامـە، خاڵی بەردەوامـی شوێن کەوتنی جەماوەر بۆ کاراکتەرو رووداوەکانی سەر شانۆ دیاری دەکات و وەردەگرێ.

«مـل ملانێ» کرۆکی ئەو بەیـەکـدا چوونـەیـە، کە هۆنینەوە شانۆیی‌یەکەی لەسەر دەکێشرێ‌و رۆنانە درامایی‌یەکەی لەسەر هەڵدەسێنرێ. بەهێزی‌و گرنگی بابەتی مل ملانێکەیش، شێوەی گشتی دەقە شانۆیی‌یەکە، لە نمایشێکی سەرکەوتوودا دەخاتە بەرچـاوو گوێی بینەران. هەر بۆیە مل ملانێ دەست نیشانی شێـوەی هۆنینـەوەکـە دەکـات و بەیـەکێك لە سەرەکی ترین رەگـەزەکـانی هونـەری شانـۆیی دادەنـرێ، بەمـەرجێ «مل ملانێکـە» کێشـەیـەکی راوەستاوی بێ کردار نەبێ‌و جووڵەو وورزمیـەکی شانـۆیی‌یـانـەی تیـادا هەبێ. هەروەك «دکتـۆر عبدالعزيز حمودة» دەڵێ: [مل ملانێ بڕبڕە پشتی بینای دراما ئەنوێنێ، بەبێ ئەو رووداوەکە هیچ نرخێکی نییە، یاخود رووداو بوونی نییە..][١] کەواتە ئەتوانین تا رادەیەکیش بڵێین، مل ملانێ چەقی ناوەراستی دەقی شانۆییمان دەداتێ‌و ئیتر هەموو هێڵە هونـەری‌یـەکـانی دی لەمـەوە ئاڵاون و لە دەوری ئەم چەقە سەرەکی‌یەدا کۆبوونەتەوە. تەنانەت کاری هونەریی دەرهێنەر و ئەکتـەرو هونـەری‌یـەکانی دی‌و تەختەی شانۆیش، سەرجەم دەچێتـەوە خزمـەتی‌و شێـوەی خستنـە رووی مل ملانێکـەو چارەسەر کردنەکەی.

کەواتـە هەڵبـژاردنـی جۆرو چۆنیـەتی دارشتنی مل ملانێ شانـۆیی‌یـەکـەچ، نیوەی تەواوی سەرکەوتنە هونەری‌یەکەی نووسـەری و شانـۆیی مسـۆگـەر دەکات.. لەبەر گرنگی ئەم هەڵبژاردنە سەرەتایی‌یە کاریگەرە، پێویستە لێرەدا جۆرەکانی چۆنیەتی دارشتنی مل ملانێی شانۆیی بە شێوەیەکی گشتی بخەینە روو، مەبەستمان لەم شێوە گشتی‌یەش ئەوەیە، کە ئەم

ــ نە ئەو شێوە هاکەزاییو باوانەیە کە لەبەر دەستماندا بێ
ـــەو بڵاوە. لەبـەر ئەوە ناتوانین هیچ قاڵبێکی دیاری کراو،
حەتمی بکـەین و نووسـەرانی تێ بتـرنجێنن چونکە لەوانەیە
ـــوونـەیش لە دەرەوەی ئەم جۆرانـەدا هەبێو رووبـدات.
ـرگـترین ئەو جۆرانەیش.

**یەکەم: مل ملانێی وەستاو. «صراع ساکن».**

ـە جۆرە مل ملانێیە دەگرێتەوە، کە کێشەکە راوەستاوە، بەڵام
ـەو نەکە دەجووڵێو بەردەوامە، بەبێ ئەوەی بۆ هیچ مەبەست
ـ ـــانجێـك هەوڵ بدات.. ئیتـر دەبینـین پاڵەوان لەم جۆرە
ـــۆیی‌یانەدا دەگرێو دەڵێ و کاردەکات، بەڵام بۆ هیچ خاڵێکی
ـــریکراو نییە. بەڵکو تەنها لە پێناوی ئەو کێشەو حەسرەتە
ـحتی‌یەدایە کە تیایدا هەڵدەسورێ. ئەم جۆرە کێشەیە زۆر
ـەرکەوتوو نییەو بینەرانیش بەتەواوی ناتوانێ شوێنی بکەوێ
ـیزی لێ وەربگرێ.

**دووەم: مل ملانێی بازدەرانە «صراع واثب»**

ـەمیش ئەو جۆرە مل ملانێ‌یە دەگرێتەوە، کە بەبێ هیچ جۆرە
ـجینـەیەك کێشەکە لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی بەرزتر لە خۆی
ـەزدەکـەوێ. واتـە هۆکـاری گەشەسەندنەکە وونەو هەموو
ـتەکان بەرێکەوتێکی ناوەخت لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی بەرز
ـعێتەوە.

**سێیەم: مل ملانێی بلندورۆ: «صراع صاعد»**

ـێتـە لەم جۆرە مل ملانێیـانـەدا، بە شێوەیەکی گونجاوی
ـەنتقی سەردەکەوێو بەپێی بارودۆخی دیمەن و کاراکتەرەکان
ـە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تر دەگوێزرێتەوە.

**چوارەم: مل ملانێی بنیادنەرانە. «صراع مرهص»**

ـەمیان ئەو جۆرە مل ملانێ‌یەیە کە بەردەوام بینەر پێویستی
ـەیە، چاودێری رووداوەکان بکات، بۆ ئەوەی بتوانێت، شوێن
ـێشەکە بکەوێت. چونکە کرۆك و جەمسەری کێشەکە نادیارو
ـلۆزکاوەو چاوەروانی دۆزینەوەو تەقینەوەیەکی نادیارە.

★★★

ـەکارهێنانی جۆرەکانی مل ملانێو چۆنیەتی دارشتنی رۆنانە
ـرامـاییـیەکـە بە پێی ئەو هۆنینەوە پەیژەیی‌یەی کە دەست
ـیشانمان کردووە، ناچێتە خانەی ئەو پرۆگرامە چەسپاوەوە، کە
ـووسـەری شانـۆیی پەیـژە درامـاییـیەکە لەبەردەمی خۆیدا
ـ بنێو پلە پلە بەرهەمە ئەدەبی‌یەکەی پیادا سەربخات. بەڵکو
ـەم دیاری کردنە، سروشتی درامایە، واتە بەردەوامی سروشتی

هونەرەکە خۆی ئەو پانتایی‌یەی داگیر کردووە. گەلێك نووسەری شانۆیی، دەنگێکی زۆر تایبەت و خودی‌یان بۆ خۆیان مسۆگەر کرد، بەرادەیەك دوژمنایەتی‌یەکی راستەو خۆیان بەرانبەر پێش خۆیـان و سەردەمەکەی خۆشیان ئاشکرا کرد- کەچی لەگەڵ ئەوەشـدا، دەتـوانـین بە ئاشکـرا هۆنینـەوە درامایی‌یەکە لە تەرزێکی نوێو تێروانینێکی خۆکردی هاوچەرخانەدا، بەهەمان شێـوە بە باڵای بگـرین، بەبێ ئەوەی هیـچ کەلێن و قۆرتێـك بەرهەمە ئەدەبی‌یەکەی کاڵ و کرچ کردبێت. ئیتر ئەگەر هەر لە «یوربیدس و ئەسخیلیۆس»ەوە تا «شکسبیر و کۆرنێو مۆلێر» و تا دەگاتە «ئەپسن و گۆرکیو چیخۆف و ئونێل و سترنبورگ و ئەدامـۆف و یونسکـۆ» ئەم بەراوردە وەربگرین، دەتوانین ئەم راستی‌یە بە دڵنیایی‌یەوە بچەسپێنین.

بەڵام لەبـەر ئەوەی ئەم بەراورد کردنـە مەبەستی بابەتەکەی ئێستامان نییە، لێرەدا واز لەم پێوانەو پێوانەکاری‌یە دەهێنن و بە کورتـەی زۆر زۆر کورتـی خـستنـە رووی سێ کۆچکـە بنەرەتی‌یەکە دەست هەڵدەگرین و دەگەرێینەوە سەر شێوەی گشتی هونەری نووسینی دەقی شانۆیی.

«ئـەرستـۆ» لە کتێبەکەیدا «هونەری شیعر» تەنها دوو یەکەی دیـاری کردووە «رووداو ـ کات» لەبـەر ئەوەیش «شـوێن» لە شانۆیی‌یە گریکی‌یەکانی کۆندا هەر یەك شوێن بووە، «ئەرستۆ» «شوێن»ی بەیەکەیەکی سەربەخۆ دانەناوە. بەڵام دیاری کردن و پێکەوە بەستنی هەرسێ یەکەی «کات ـ شوێن ـ رووداو» لە دەقێکی شانـۆییـدا، پێـویستی‌یـەکی دروستـەو هەر ئەو سێ‌یەکەیەش سنووری چۆنیەتی جۆری نمایشی شانۆیی دیاری دەکات. مەرج نییە ئەم ئاشکرا کردنەیش، تێئاخنینێکی دەست کردانەی زەق بێت، بەڵکو دارشتنە هونەری‌یەکە خۆی حوکمی دەست نیشان کردنەکە بکات. بە تایبەتی هەردوو یەکەی «کات و شوێن» کە زەمینـەی گشتی نمـایشـە شانـۆیی‌یـەکـە کۆ دەکاتەوەو هەروەك و لەوە بەریش باسمان لێوە کرد «کارکتەرو دیـالۆگ» دەبنـە بەشێك لە پێکهێنەرەکانی دیمەنی شانۆیی، دیمەنی شانۆیش، ئەو گۆشە جیاجیایانەیە کە بە پێی ئەو یەکە پێکـەوە بەستـراوە تونـدو تۆڵەی نێـوان «کـات و شوێن» وەردەگیرێ، بەمەبەستی خستنەرووی مل ملانێ درامایی‌یەکە، یان رووداوە شانۆیی‌یەکە.. واتە هەر سێ‌یەکەی «کات و شوێن و رووداو» ئەبنە سێ بنەمای جەوهەری دیمەنە شانۆیی‌یەکان و پاشانیش سەرتاپای دەقە شانۆیی‌یەکە بە گشتی.

کاتێکیش ئێمە دەڵێین «رووداو» بێ گومان مەبەستمان هەردوو

جۆرەکەی ڕووداوە، کە هەریەکێکیان کاریگەری تایبەتی خۆی هەیە، «ڕووداوی سادە» کە سەرجەمی ئەو ڕووداوە ووردانەیە، کە دیمەنەکان تێرو تەسەل دەکەن,و دەبنە پاڵپشتی مل ملانێ سەرەکی یەکە. لەگەڵ «ڕووداوی ئاڵۆز» کە جەوهەری ڕووداوە بنچینەیی یەکە پێك دەهێنێ‌و بە شێوەیەکی سەرتاپاگیر نمایشە شانـۆیی یـەکە دەگرێتەوە، کەواتە ئەتوانین بڵێین: [ڕووداوی درامایی بریتیە، لە جووڵەی ناوەوەی ڕووداوەکان، یان جووڵەی ناوەوەی ئەوەی بینەر بەچاو و گوێ دوای دەکەوێ، ئەنجامی کۆتایی جووڵەکەیش، لە کۆتایی نمایشەکەدایە..][7] لە کۆتاییدا نکـوڵی لەوە ناکـرێ، کە ئەگەر کەسێك شاعیر نەبێ هەزاران کتێبی شعریش ئەم دیو و ئەو دیو بکات، نابێتە شاعیر. ئەمەیش دووبارە کردنەوەی هەمان ڕای وەك «ڕوگرم بسفیلد» و «ڕوبرت ئیس گرین» و «تشارلس مورگان» و «دکتۆر ئیبراهیم حمادە» و «دکتۆر رشاد رشدی» و «دکتۆر عبدالعزیز حمودە» و «عادل نادی» و..... کەسانی تری وەك ئەوان، کە لە بواری هونەری شانۆ نووسیندا، رەنج و هەوڵێکی گەورەیان دیارە.. کە هەرگیز ئەم جۆرە لێکـۆڵینەوانە کەسێك ناکاتە نووسەرێکی شانۆیی، یاخود ڕێنمایی کردنێکی ماتماتیکی نییە، کەسێك لێوەی فێربێت و ببێتە کەڵە نووسەرێکی سەرکەوتوو. بەڵکو تەنها پاڵپشتی ئەو توانـاو هەستـە هونەرییە بەرزەیە کە بە هەرچی ووشە هەیە پێنـاسە ناکرێ. تەنانەت «هونەری شیعر»ەکەی «ئەرستۆ» کە یەکـەمـین هەوڵە لەم بوارەدا، ڕاوسـەرنـج و پێشبینییەکانی بلیمـەتێکی وەك «ئـەرستـۆ» یش، تەنهـا دووبـارە کردنەوەی ئەوداهێنانە مەزنەیە کە هەرسێ شاعیرە مەزنەکەی گریکی کۆن «یۆربیدس و ئەسخیلیۆس و سۆفۆکلیس» بەدەستیان هێناوە، سەبـارەت بە تراژیـدیـاو هونـەرە بەرزو ئاڵۆزەکـەی «دەقی شانـۆیی» یاخود هیچ ڕاستەو پرگاڵێك نەبووە، کەسێکی وەك «شکسبـیر»ی کردبێتـە خاوەنی ئەو شاکارە مەزنانەی، کە تا ئێستایش جێگای تێرامان و لێکۆڵینەوەی زیاترو نوێیە..

ئەمـەیش دڵنیـابـوونە لەوەی کـە سروشتی هونەری شانۆیی‌و هەستی هونـەرمـەندانەو داهێنەرانەی نووسەرانی شانۆیی، خۆیـان ئەم یاسـاو ڕێسـایـانـەیان هێناوەتە گۆڕێ، نەك بە پێچەوانەوە، ئەوانەی پەیڕەوی یاساو ڕێسایەکی تایبەتیان کردبێ.

بەهەرحاڵ لێرەدا بەم باسە کورتە، کۆتایی بە «هونەری نووسینی درامـا» دەهێنین، هەرچـەنـدە گەلێـك خاسیـەت و ڕەگـەزی جەوهـەری گرنـگـمـان پشت گوێ خستـووەو تەنـانـەت ئیشارەتیشمان بۆ نەکردووە ، لەگەڵ ئەوەیشدا ئومێدەوارین ، تا رادەیـەك ئەم ڕوون کردنـەوە سەرپێیی یە ، ئەرکی یەکەمین سەرەتای لە خۆگرتبێت .

**پەراوێزەکان**

١ـ ڕۆنانی درامایی ـ نووسینی : دکتۆر عبدالعزیز حمودة ـ وەرگێرانی دلاوەر قەرەداغی . لاپەرە ـ184ـ

٢ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ لاپەرە ـ190ـ

٣ـ مدخل الیٰ فن کتابة الدراما : تألیف : استاذ عادل النادي نشرو توزیع مؤسسات «عبدالکریم عبدالله» «تونس» الطبعة الأولیٰ «1987» لاپەرە ـ55ـ

٤ـ المدخل الیٰ الفنون المسرحیة ـ تألیف : فرانك م . هواینتج : ترجمة : کامل یوسف الدکتور رمزي مصطفیٰ ـ بدرالدیب ـ درینی خشبة ـ محمود السباع /مراجعة/ حسن محمود سعید خطاب الجمهوریة العربیة المتحدة وزارة التربیة والتعلیم / الناشر ـ دار المعرفة ـ قاهرة /1970/ لاپەرە «177» .

٥ـ مدخل الیٰ فن کتابة الدراما ـ تألیف الأستاذ عادل النادي نشرو توزیع مؤسسات «عبدالکریم عبدالله» « تونس » الطبعة الأولیٰ «1987» لاپەرە «61»

٦ـ ڕۆنانی درامایی ـ نووسینی : دکتور عبدالعزیز حمودە ـ وەرگێرانی دلاوەر قەرداغی . لاپەرە ـ137ـ

٧ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو . لاپەرە ـ56ـ

**سەرچاوەکان**


١ـ مدخل الی فن کتابة الدراما . تالیف : الأساذ عادل النادي ـتونس ـ نشر وتوزیع مؤسسات «عبدالکریم عبدالله» الطبعة الأولیٰ «1987».

٢ـفن المسرحیة تالیف ـ فردب میلیت ـ جیرالدایدس بنتلی ترجمة : صیدقی خطاب ـ مراجعـة: الدکتور محمود السمره دار الثقافة ـ بیروت ـ نشره بالأشتراك مع مؤسسة فرنکلین للطباعة والنشر ـ بیروت ـ نیورك ـ ـ 1966 ـ

٣ـ ڕۆنانی درامایی . نووسینی : دکتۆر عبدالعزیز حمودة ـ وەرگێرانی : دلاوەر قەرەداغی ـ الناشر مکتبة لأنجلو المصریة ـ ئەم کتێبە مۆڵەتی چاپ کردنی لە ساڵی ـ1986 ـ وەرگرتووە، بەڵام تائێستا بەچاپ نەگەیشتووە و دەست نووسە .

٤ـ المدخل الی الفنون المسرحیة تالیف فرانك م هواینتج ترجمة : کامل یوسف ـ الدکتور رمزي مصطفیٰ ـ بدرالدیب ـ درینی خشبة محمود السباع / مراجعة: حسن محمود ـ سعید خطاب .
الجمهوریة العربیة المتحدة وزارة التربیة والتعلیم الناشر ـ دارالمعرفة ـ قاهرة / 1970 /

٥ـ الحیاة في الدرامة تالیف اریك بنتلی ترجمة : جبرا ابراهیم جبرا المکتبة المصریة ـصیدا ـ بیروت ـ نشر باشتراك مؤسسة فرنکلین للطباعة والنشر بیروت ـ نیورك ـ1968 ـ

٦ـ فن الشعـر ـ تألیف: ارسطوطالیس. ترجمة: عبدالرحمن بدوي دار الثقافة ـ بیروت ـ لبنان ـ1973 ـ الطبعة الثانیة .

٧ـ النقد الأدبي الحدیث ـ تالیف الدکتور محمد غنیمي هلال ـ دارالعودة ـ بیروت ـ1973 ـ

٨ـ فن الکاتب المسرحي «للمسرح والاذاعة والتلفزیون والسینما» تألیف : روجرم بسفیلد ترجمة وتقدم :درینی خشبة .
الناشر مکتبة نهضة مصر مع مؤسسة فرانکلین للطباعة والنشر ـ القاهرة نیویورك ـ 1964 ـ

٩ـ صناعة المسرحیة (دلیل الی فن بناء المسرحیة والمبادئ الأساسیة للدراما.
تالیف : ستوارت کریفش ـترجمة : الدکتور عبدالله معتصم الدباغ .
دارالمأمون للترجمة والنشر ـ وزارة الثقافة والأعلام ـ بغداد ـ1986 ـ


O



# کیمیاو ژیان.....

# تێ ڕوانینێك لە جادوگەرییەوە تا سەرهەڵدانی کیمیای نوێ

نووسینی: دکتۆر ئازاد تۆفیق فیض الله

**هەروەك ئاشکرایە سروشت بەپێی چەند یاسایەکی تەبیعی دەڕوات کە زووربەیان ڕواڵەتی نهێنین وەمرۆڤ هیچ کاتێك بێدەنگ نەبووە لەم سروشتە بەڵکو بەهەموو توانای بیریو ئامرازێکەوە هەوڵیداوە ئەم یاسایانە بدۆزێتەوە کە لە سەرەتادا بەهۆی کەم توانایییەوە ناوی دەبوون «نهێنییەکانی سروشت» وە بەهێزترین فێڵ کە سروشت پەنای بۆ بردبێت کەڵك وەرگرتن بووە لە خەڵەتاندنی هەستەکانی مرۆڤ و ون کردنی هۆشیو بەرەو چەند بڕوایەکی بێ کەڵك بردوویەتیو لە ئەلقەیەکی بۆش ـ ا سووڕاندویەتییەوەو دووری خستۆتەوە لەو ئامانجەی ئارەزووی بووە.**

**بەڵام هۆشی مرۆڤ کە هیچ هێزێك نیە ڕێگای ئامانجی لێ بگرێت چالاکانە درکی بە هەڵەی خۆی کردوەو هەنگاوی نوێی دەست پێکردوە وەبێ گومان لە کۆتاییشدا سەرکەوتن هەربۆ هۆشەو سروشت ڕێگای نەماوە خۆبەدەستەوەدان نەبێت و خستنەڕووی نهێنییەکانی یەك لە دوای یەك.**

لە زانستی ئەستێرەناسیدا سروشت تێڕوانینی مرۆڤی بە هەڵەدا بردبوو وای لێکردوو بڕوای بەوەبێت کە زەوی ناوجەرگەی گەردوونە و مانگ و ڕۆژو ئەستێرەکانی دیکە بەدەوری زەویدا دەخولێنەوە. ئەم بیرورا هەڵەیە هەزاران ساڵ زاڵ بووبوو بەسەر بیری مرۆڤ دا تا هاتنی کۆپەرنیك و



ئەنتوان لوربیە لاڤوازیە (باوکی کیمیا)

ئەستێرەناسەکانی دوای ئەو کە ڕاستی‌یان دەست نیشان کردوو وێنەکەیان ڕاست کردەوەو بناغەی زانستی ئەستێرەناسی نوێ‌یان دانا. لە زانستی پەیدا بوونی مرۆڤ و گیان لە بەرانی دیکە سروشت هۆشی مرۆڤی تێك دابوو کە گوایە گیان لەبەرە زیندووەکان هەر یەکە بەشێوەیەکی سەربەخۆ پەیدابوون وە هەر جۆرە هەروەك چۆن پەیدا بووە وا دەمێنێتەوە و لە شێوەیەکەوە ناگۆڕین بۆ شێوەیەکی دیکە. بەڵام کە (داروین) هات و کۆمەڵێ ڕاستی کۆکردەوە سەلماندی کە هەموو گیان لەبەرە زیندوەکان لەیەك بنەچەوە پەیدا بوون و دوایی لقیان

سەرەکی‌یانەی هەموو ئەو شتانەی لێ پێك هاتووە کە لەبەرچاوماندایەو هەستی پێدەکەین. جا مەسەلەیەکی ڕۆشنبیری سەرەکی‌یە کە بیخەینە ڕوو مرۆڤ چۆن توانی ڕزگاری بێت لەو بروا نابەجێ‌یانەی هەزاران ساڵ بە ڕێگا پێچاو پێچەکاندا خولی دەخواردەوەو مرۆڤ چۆن سەلماندی کە ملیۆنەها ماددە وەك بەرد لە کانەکاندا یان شانەی زیندوو لە گیان لە بەراندا یان گازی کوشندە یان ئەو ئەستێرانەی کە بە ملیۆنەها ساڵ ڕووناکی‌یەکەیان دەگاتە ئێمە، ئەمانە هەمووی لەچەند تەنۆلکەیەکی ئەلەکتریکی یان ئەلەکتریکی پێك هاتوون وە لەم تەنۆلکانە ئەتۆمی توخمە جۆر بە جۆرەکان دروست بوون وە لە ئەتۆمەکان مۆلیکیولەکان پێك هاتوون و لەم مولیکیولانەش هەموو ماددەکانی تری سروشت پەیدا بووە.

تەنگوچەڵەمەی پێکهاتنی ماددە بیری زووربەی خەڵکی قاڵ کردبوو لە سەرەتای لێکۆڵینەوەی فەلسەفیدا وە لێرەدا بلیمەتی و توانای بیری فراوانی یۆنانی‌یەکان لەیاد ناکەین ڕاستە زۆر لە وڵاتانی‌دیکە وەك کلدانیەکان و هیندو میسر بیریان لەم باسە دەکردەوە بەڵام یۆنان بووە خاڵێکی بەیەك گەیشتنی ئەم بیروڕایانە. هەرچەندە فەیلەسوفەکانی یۆنان نەیان توانی پێشکەوتنێکی ئاشکرایان چنگ بکەوێت و بیر دۆزەکانیان زۆر سودێکی وای نەبوو بەڵام شوێنەوارەکانیان بوون بە تۆمارێکی نەمر لە مێژوداو هاندەرێ بوون بۆگەران بەدوای ڕاستیەکاندا. میسری‌یەکان چەند سەدەیەك پێش زایین کارامەیی‌یەکی گەورەو شارەزایی‌یەکی سەرکەوتویان هەبووە لە دەرهێنانی کانزاکان و پیشەسازی کردنیداوە سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا لە ڕەنگ کردنی ڕوەکەیدا هەروەها لە بەرهەم هێنانی ئەو دارشتانەی کە ڕوخساری زێرو زیویان هەبوو.

کیمیای کۆن لە سەرەتادا تەنها هونەر نەبووە بەڵکو فەلسەفەیش بووە وە بناغەی ئەم فەلسەفەیش لە بیردۆزی ئەرستۆتالیس دەربارەی یەکەی ماددەی سەرەکی دەبینین کە دەڵێت ماددە ئەوەیە کە هەندێ خاسیەتی هەڵگرتووە کە

شێوەیەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ شێوەیەکی دیکە. بەم پێیە شتێکی سروشتی بووە کە بروا بەوە بکرێت هەندێ ماددەی هەرزان بەها لە شێوەیەکەوە بگۆڕێت بۆ شێوەی ماددەیەکی تری گران بەها وەك گۆڕینی قورقوشم بۆ زێر. هەروەها کیمیاییە کۆنەکان زۆر بیروڕایان بەرێگای لەیەك چوونەوە داهێنابوو وایان دەزانی کە میتاڵە کانزاییەکانی جیهان هەروەك گیان لە بەران لە دایك ئەبن و لە خۆڵ دا گەشە دەکەن.

بەرهەم هێنانی زێر بە ئامانجێکی سروشتی سەرەکی دەژمێررێت وە هەوڵی کیمیاییە کۆنەکان بریتی بووە لە گەشەکردنی میتاڵەکانی ترو گۆڕینیان بۆ زێر بەهۆی دەرمانێك یان هۆکارێکی گۆڕین کە ناویان نابوو«بەردی فەیلەسوفەکان» وە بۆ گەیشتن بەم مەبەستە کیمیاییە کۆنەکان دەستیان بەپشکنین کرد لە هەموو جیهانی سروشت دا: گیان لە بەران و روەك و کانزاکان. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کیمیای کۆن فەلسەفەیەکی تایبەتی بووە بە سروشتەوە وەبەلای زۆر لە زاناکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە وەك ئەلبیرتۆسی گەورەو رۆجەر بیکۆن کیمیا شتێك بوو پیشەکی بیری راکێشاوە بەلام زووربەی زاناکانی دیکە ئامانجیان پارە پەیدا کردن بووە.بۆیە پیشەسازی کردنی کیمیا لە سەدەکانی پازدەهەم و شازدەهەم دا کەوتە ژێر دەستی کۆمەڵێك لە پیاو خراپان و دەست برەکان تا ئەورووپا پڕ بوو لە فاڵ گرتنەوەو جادوگەریو فروفێڵ. وە ئەوەی کە پتر یارمەتی ئەم کارەی دەدا پادشاکانی ئەو سەردەمە بوون و کە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات پێویستییان بە دارایییەکی گەورە هەبوو ئەمە جگەلەو باجە زۆرەی سەپاندبوویانە سەر جوتیارەکاندا. لەو پاشایانەی هانی ئەم کارەیان دەدا کریستیانی چوارەهەم پادشای دانیمارك کە هەر لە ساڵی ١٥٨٨ تا ساڵی ١٦٤٨ پارەکەی لەو زێرە پێك هاتبوو کە جادوگەران بۆیان ئامادە دەکرد. بەهەمان شێوە فێرناردی سێهەم ئیمپراتۆری رۆمانیای پیرۆز ساڵی ١٦٣٧ تا ١٦٥٧ ئەو رێبازەی گرتبوەبەر. لە کۆتاییدا زۆر لەم جادوگەرانە درۆکانیان ئاشکرا بوو لای کۆمەڵ و سزای خۆیان وەرگرت بۆ نموومە پادشای پروسیا فریدریکی یەکەم زۆری لەم کیمیا گەرە جادوگەرانەی لە سیدارەدا.



دەربڕینێك دەخاتە روو دەربارەی جادوگەری کە مرۆڤ هەوڵی داوە بۆ جێ بە جێ کردنی گشت لایەنەکانی ژیان.

بێ گومان رواڵەتی جادوگەری لە کیمیادا تا ساڵەکانی ١٨٠٠ هەر بەردەوام بوون بۆ نموونە ئیمپراتۆری نەمساو مەجەر فرانسوا جۆزێف هەرچەندە لە سەدەی نۆزدەهەم دا ژیاوە بەلام لە ساڵی ١٨٦٧ پارەیەکی زۆری بەسەر جادوگەرەکاندا بلاوکردبوەوەو بڕوای پێیان بوو کە گوایە دەتوانن زێر لە زیوو جیوە دروست بکەن وە تا ئێستاش زۆر هەڵخەڵەتاوو ئەوانە هەن کە کار لە بواری مەسەلەکانی ناخەوە دەکەن بڕوایان بە کتێب گرتنەوەو سیحرو زۆر شتی دیکە هەیە.

بەردەوام بوونی جادوگەری لە کیمیادا بارێکی وای هێنایە کایە وەکە زۆر بیروڕا هەرچەندە سەرسوڕهێنەربوون

بەڵام لای خەڵکی زۆر بەجێبوون. لەم بیروڕایانە بیردۆزێ بوو دەربارەی (سوتاندن) کە لە ساڵی ١٧٠٠ نوشدارێکی ئەڵەمانی بەنـاوی جۆرج ئەرنست شتـاهیـل لەسـەر بناغەی بیروڕای جابری کوڕی حەیان دەربارەی نەژادی سووتاندن (گۆگرد)ی هێنـایە کایەوە. شتاهل ناوێکی نوێی بۆ ئەم نەژادە دانا کە پێی دەوت «فلۆجستۆن phlogiston » کە وشەیەکی یونانی‌یە لە کرداری فلۆجیزینەوە هاتووە (phloizein) بەمانای دەسـوتێ.

بەپـێی ئەم بیردۆزە کاتـێ ماددەیـەك دەسـوتـێـنـرێـت فلۆجستـۆنـەکـەی دەڕوات و دەچێتـە ناو هەواوە وە تەنهـا خۆڵەمێشەکەی دەمێنێتەوە کە توانای سووتاندنی نامێنی. ئەم بیردۆزە چەرخێکی نوێی هێنایەکایەوە کە پێی دەوترا چەرخی فلۆجستۆن. وە هۆی بەردەوام بوونی ئەم بیردۆزە هەڵەیە ئەوە بوو کە کیمیـا تا ئەو کاتـە زانستێکی بەئـارەزوویان نیشانە هەڵدان بووە چونکە کیمیایی‌یەکان لایان وابوو کە شێوە (نەك کێش) سیفـەتی ناسراوی ماددەکـانـە، واتە لایەنی چەندیی (هێنـدی) یان لە زانستـەکـەیـانـدا خستبوە پشت گوێ وە گرنگی‌یان نە ئەدا بە کەم بوون یان زۆر بوونی کێشی ماددەکە لە ئەنجـامی سووتـاندن دا. ئەم بیروڕایە ماوەی ١٠٠ ساڵ بەردەوام بوو تا سەردەمی (باوکی کیمیا) لافوازییە.

کە پاش دوزینەوەی ئۆکسجین لەلایەن برستلی و شیلەوە ساڵی ١٧٧٤ لێکـۆڵینـەوەیەکی نوێی بۆ سوتاندن لە هەوادا داناو کێشەی ڕاستەقینەی بەرپاکرد لەسەر ڕێبازێکی زانستی‌یانە بۆ دۆزینەوەی یەك لە دوای یەکی توخمە کیمیایی‌یەکان:-

باوکی کیمیـا ئەنتـوان لۆران لافوازییەی فەرەنسی (١٧٤٣ - ١٧٩٤) لە شاری پاریس لە خێزانێکی پایەبەرز لە دایك بوەو برێکی زۆر لە خوێنـدەواری وەرگـرتووە. یەکەم جار مۆڵەتی یاسـای وەرگـرتـوەو پاشـان خوێنـدنی دەربـارەی زانستی ئەستـێرەنـاسی‌و مێژووی سروشتی و کیمیا دەست پێکردوە. مرۆڤێکی جوان و زیرەکی‌یەکی تیژی هەبووە و ئافرەتێکی جوان و زیرەکی هێناوەو ژیانێکی بەختیاری لەگەڵدا بردوّتە سەر وئەم ئافرەتە هاندەرێکی بەهێزی مێردەکەی بووە. لەگەڵ ئەم ژیانە خۆشەیدا لافوازییە دووچاری مەترسی‌یەکی گەورەبووە ئەویش لەبـەر ئەوەی ژنـەکـەی کچی یەکێـك لە گەورە مووچـەخۆرە ڕاپـەڕێنـەکـان بووە لە «دەزگـای گشتی‌دا» کە کاروبـاریان کۆکـردنـەوەی باج ی میری بووە لە فەرمـان ڕەوایی لویسی‌ی شازدەهەم دا. وە لافوازییە خۆشی ئەندام بووە لەو دەزگایەدا جا لەبـەر ئەوەی باجـەکـان و زۆر قورس بوون لەسەر جوتیارو کارکەرەکانی چینی مام ناوەندی خەڵکی زۆر ڕقیان لەم دەزگایە هەڵسـابـوو وەهـەر کە شۆڕشی فەرەنسا دەستی پێکرد ئەم دەزگایە ئامانجێکی ئەو چینانە بوو بۆ لەناو بردنی. بەڵام پێش ئەوەی ڕۆژی لێ پرسینەوە بێت لافوازییە ٢٠ ساڵ لە زانست و تەکنۆلوجیا کاری کرد بۆیە سوودێکی گەورەی هەبوو بۆ گەلی فەرەنسـا. ئەوە بوو زۆر کەلوپەلی دۆزیەوە بۆ گەیاندنی ئاوی سازگار بۆ شاری پاریس و ڕووناك کردنەوەی شەقامەکانی لە شەودا. هەروەها یارمەتی دەرێك بووە بۆ داهێنانی ڕێبازی نوێ بۆ لێدانی ماددەی نتراتی پۆتاسیۆم (خوێی بارود کە یەکێکە لە پێکهێنـەرەکانی بارود) تاوای لێهات ناوبانگی پەیدا کردو پێش ئەوەی لێکۆڵینەوە کیمیایی‌یە سەرەکی‌یەکانی جێبەجێ بکـات لە تەمـەنی ٢٥ ساڵیـدا بوو بە ئەنـدام لە ئەکادیمی شایانەی زانیاری کە بەناوبانگترین کۆمەڵەی زانستی بووە لە فەرەنسا.

لێکـۆڵینـەوەکـانی لافوازییە بۆ دۆزینەوەی ئامێرەکانی ڕووناك کردنەوەی پاریس هانی دا کە بیر بکاتەوە لە زۆر جۆری سووتـەمـەنی چراکـان و سروشتی داگـیرسـانـدنیان وە ئەم مەسەلەیەی شیکار کرد بە ڕێبازە چەندیی‌یەکەی واتە ڕێبازی کێش و پێوانە ئەم زانا گەورەیە سەلماندی کە ڕاستە لە هەموو کارلێکردندا کیمیایی‌یەکاندا شێوازی ماددە دەگۆرێت. بەڵام کۆی کێشی هەموو ئەو ماددانە لە کردارەکەدا بەشداریان کردوە ناگۆرێت. جا ئەگەر ماددەیەك کێشی کەمی کرد یان پتر بوو ئەوا شتێکی لە هەوا یان وەرگـرتـوە یان داوێتی وە ئەمەی کرد بە یاسـایەك ناوی نا (یاسای جێگیر بوونی کێش). لافوازییە لە ئەنجـامی تاقیکـردنـەوەکـانی بیردۆزێکی نوێی دۆزیـەوە دەربـارەی سووتـاندن کە جێگای بیردۆزی فلۆجستۆنی کۆن گرتەوە بەگوێرەی ئەم بیردۆزە سووتاندنیان ڕەنگ ڕەش بوونی هەر ماددەیەك لە وەوەیەت کە لەگەڵ ئۆکسجین یەکی گرتوە وە ماددەی ئۆکسیدی دروست کردوە جا لە ساڵی ١٧٨٣ بیردۆزی

ئۆكسجـين لەسـەر سووتاندن بلاو كرايەوە لافوازييە دەست نيشانى ئەو هەوايەى كرد كە تواناى سوتاندنى هەيەو ناوى نا هايدرۆجين وە خستيە رووكە هايدرۆجين و ئۆكسجين هەردوو بەشێوەيەكى كيميايى يەك دەگرن و ئاو دروست دەكەن. ئەم بيرورا نوێيـەى لافـوازييـە بە تەواوى بيروراى يۆنـانـىيـە كۆنـەكـانى لەنـاو برد وسەلماندیان كە ئاو توخمێك نیە بەڵكو ئاوێتـەيـەكـە لە هايدرۆجين و ئۆكسجين وە هەوا تێكەڵێكە لە نايترۆجين و ئۆكسجين. بەم شێوەيە كيمياى نوێ هاتەكايەوە. لەو خزمەتە گرنگانەى لافوازييە پێشكەشى كيمياىكرد دانانى ياسايەكى نوێ بۆ ناو لێنانى ئاوێتە كيميايىيەكان. جا كاتى خۆى كيميـايىيـە جادو گەرەكان بۆ ئەوەى نەزانينى خۆيان داپۆشن ناوى شاعـيرى و ئەنـدێشـەىيان لە زۆر ماددەى كيميايى نابوو بۆ نموونە بە زێريان دەوت (رۆژ) وە بە زيويان دەوت (مانگ) وە بە جيوەكە لەراستيدا بريتى بوو لە ئاوێكى زيوى ئەمانەپێيان دەوت ئەستێرەى گەرۆك ميركورى كە عەتاردە وە بە تێكەڵى ترشى نتريك و ترشى هايدرۆكلۆريكيان دەوت (ئاوى شا) و تا ئێستاش ئەم ناوە هەر ماوە. جا ئەگەر كيميا بەو شێوە شاراوەى كيميـايىيە جادوگەرەكان تێيان دەروانى بمايەتەوە ئەوا كۆسپى گەورە گەورە پەيدا دەبوو لە رێى پێشكەوتنىدا. ئەوەبوو لە ساڵى ١٨٠٠ ئەبوايە هەموو توخمەكان ناوەكەيان بە برگەى (وم) يان (يوم) كۆتايى بهاتايەو ناتوخمەكانيش بە برگەى (ون) يان (ين) وەك يۆرانيـۆم. يان كلۆرين. لە ساڵى ١٧٨٩ لافـوازييـە يەكەم پەرتووكى دەربارەى كيميا دەركرد بەناوى «پەرتوكى كيمياى سەرەتايى» كە زووربەى بيردۆزەكانى خۆى دەربـارەى رواڵەتـەكـانـى سووتـانـدن و ناونـانى مادده كيميـايىيـەكـانى تيـا بلاوكردبۆوە. ئەم كتێبەى وەرگێرا بۆ زووربەى زمانەكانى جيهان بەلام بەداخەوە خۆى نەژيا تا كار تێكردنى گەورەى پەرتووكەكەى ببينێ لەسەر جيهان هەر لەو ساڵەى ئەم كتێبەى دەركرد (١٧٨٩) شۆرشى فەرەنسا دەستى پێكردو لە ساڵى ١٧٩٢ بەديل گيرا بەو ناوە كە گوايە باجى لە خەڵكى كۆكـردۆتەوە بەلام هەميشە بەرگرى لە خۆى دەركردو دەى وت من مرۆڤێكى زانستم جا ئەو ئەفسەرەى كە لافوازييەى كرد رووى تێ كردو ووتى «ياساى كۆمارى فەرەنسا پێويستى بە پياوانى زانست نىيە) وە لە هەمان كات دا مرۆڤێك بەناوى جان پۆل مارا كە خۆى بە زانا دەزانى رقى زۆرى لە لافوازييە بوو چونكە كاتى خۆى لافوازييە قايل نەبوو بوو كە (مارا) بە ئەنـدام وەربگيرێت لە ئەكاديمى زانستى پاشايەتى بۆيە ئەم (مارا) يە خۆى بەشدارى دادگاكەى لافوازييەى كردو فەرمانى لە سێدارەدانى درا.

هەر چەندە مارا خۆيشى كوژرا بەلام لافوازييەش لە ٢ى مارت ى ساڵى ١٧٩٤ لە سێـدارەدرا وە لە ناهـەمواريەكانى زەمانە ئەوەبو كە ١٠ حەفتە پاش لە سێدارەدانى لافوازييە ئاسايش گەڕايەوە فەرەنساو سەرەرۆكان لە دەسەلات دوورخرانەوە لە سێـدارەدانى لافـوازييـە تەنيـا هەڵەى ناهـەموارى گەورەى شۆرشى فەرەنسـا بوو چونكـە زانست و كيميـا ئەستێرەيەكى گەشيان لەناو چوو.

ئەلكتـريـك لە ساڵەكانى ١٨٠٠ دا رۆلێكى كاريگەرى بينى بۆ دۆزينەوەى زۆر لە توخمەكيميايەكان. ئەوەبوو بنيامين فرانكلين توانى ئەلەكتريكى دەست بكەوێت لە هەورێكى بارگە كراوەوە لە رێى كولارە بەنـاوبانگەكەيەوە هەروەها پێش ئەم سانـدرۆ ڤۆلتاى ئيتالى پاترى ئەلكتريكى داهێنابوو. جا بۆيە وليەم نكۆلسن و هاورێ لاوەكەى ئەنتۆنى كارلسلى لە ئينگلتەرە چەند تاقيكردنەوەيەكى كيميايىيان بەجێ هێنا بە بەكارهێنانى ئەلەكتـريـك وە توانيـان پاش نوقم كردنى دوو جەمسـەرى ئەلەكتـريكى لە ئاودا دوو گازيـان دەست بكەوێت كە بريتى بوون لە ئۆكسجين و هايدرۆجين وە سەلماندیان بۆ يەكەم جار كە دووبـەش لە هايـدرۆجين لەگەڵ بەشێك لە ئۆكسجين ئاو پێك دەهێنن. جا لێرەدا هەڵەى بيردۆزى ئەتۆمى داڵتۆن دەركەوت دەربـارەى ئاو كە دەى وت ئاو پێـك هاتـووە لە يەك ئەتـۆم هايدرۆجين و يەك ئەتۆم ئۆوكسجين وە هەر لەسەر ئەو بناغەيە زۆر لەكێشـە ئەتۆميەكان كە دەرى هێنابوو هەڵە دەرچوو وە تاقيكردنەوەى نكۆلسن و كارلسلى ئەو راستىيەيان دەرخست كە ئەلەكتـريـك دەتـوانێت ئاوێتـەى كيميـايى شىبكاتـەوە بۆ توخمـەكـانى. وە هەر لەم بوارەدا دوو پسپـۆرى كيمياى لاو حۆنسى جاكـوب بەرزيلۆسىى سويـدى (١٧٧٩ ـ ١٨٤٨)و

هامفری داڤ ئنگلیزی (١٧٧٨ ـ ١٨٢٩) رۆڵێکی گرنگیان هەبووە. بەرزیلیۆس لە منداڵیدا زۆر دووچاری ئەشکەنجەی دەستی باوە پیارە بوو بوو بەڵام هەر چۆنێك بێت لە کۆتاییدا چۆتە قوتابخانەی پزیشکیو بروانامەی هێناوە. ئەم لاوە حەزی لە خوێندنەکانی پزیشکی نەدەکرد بەڵکو پتر گرنگی دابووە تاقیکردنەوە کیمیاییەکان تا وای لێهات بوو بە گەورەترین پسپۆری کیمیا لە چەرخی خۆیدا. ئەم زانایە بووە سەرچاوەیەکی زانستی گەورە کە قوتابیان لە زووربەی ئەوروپاوە دیتنیان دەکردو بیروراکانی زۆر پیرۆزبوە لە هەموو بەشەکانی کیمیادا ئەگەر چی زۆر جاریش هەڵەی تیا بووبێت. وە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم ناونرابوو (چەرخی بەرزیلیۆس). لەو راستییە گرنگانەی ئەم زانایە دای هێنا ئەوە بوو کە توخمەکان بارگەی ئەلەکتریکی هەڵدەگرن وە لەسەر ئەم بناغەیە بیردۆزەکەی دەربارەی کارلێکردنە کیمیاییەکان دانا کە تامادەیەکی زۆر پەسەند کرا بەڵام پاش ١٠٠ ساڵ هەڵەی ئەم بیردۆزە دەرکەوت سەلماندیان کە ئەتۆمەکان بارگەی ئەلەکتریکی هەڵدەگرن نەك توخمەکان.

هامفری داڤ ئینگلیزی بۆ یەکەم جار ژیانی کارکردنی لە یەکێك لە دەرمانخانەکاندا وەك یاریدەدەرێك دەست پێکردوە هەر ئەمەش وای لێ کردوە هەستی ببزوێ بەرامبەر کیمیا بە تایبەتی پاش خوێندنەوەی پەرتووکەکەی لاڤوازییە وە لە ساڵی ١٧٩٩ کە هێشتا لە تەمەنی ٢١ ساڵیدا بوو خۆی دیتەوە لە بەردەم ناوبانگێکی زۆر گەورە بەهۆی دۆزینەوەی گازێك کە پێیان دەوت (گازی پێکەنیناوی) ئەم گازەش ئۆکسیدی نایترۆزابوو کە ئاوێتەی کیمیاییە لە دوو ئەتۆم نایترۆجین و یەك ئەتۆم ئۆکسیجین پێك هاتووە وە هەر کە دۆزیەوە روانی کە ئەوەی ئەم گازە هەڵئژێت هێزی بەسەر خۆیدا نامێنێ و ناتوانێت سۆزو ئەندێشەی کۆبکاتەوە و دەست بە پێکەنین و هاوار دەکات و چەند هەڵسوکەوتێکی نابەجێ دەنوێنێ. پاش چەند ساڵێك نوشدارەکان ئەم گازەیان وەك بێ هۆش کەرێکی سووك بەکار دەهێنا کاتی دان و دەرهێنان و نەشتەگەرییە بچووکەکاندا. ئەم زانایەتوانی توخمەکان پۆتاسیۆم سۆدیۆم جیابکاتەوە هەروەها لە ئەمەڵگەمی قسڵ و توخمی کالسیۆم و لە بارێتیا توخمی باریۆم لە مانیزا توخمی مەگنیسیۆم ی دەرهێنا وە هەمان رێبازی بەسەر کانزایەکی تریش دا جێبەجێ کردو ناوەکەی لەناوی شارێکی بچووکی سکۆتلەندەوە بۆ دانا (سترۆنشیان). ئەم توخمە نوێیە ناونرا (سترانشیوم) هەموو ئەم توخمانەی کە دۆزیەوە ئیستا ناو دەبرێن بە توخمە زەمینییە قلیەیییەکان (Alkaline Earth Metals) وە لە ساڵی ١٨١٠ داڤ چەند راپۆرتێکی خستەروو تیایا سەلماندی کە ئەو گازە سەوزیاوەی لە ترشی هایدرۆکلوریك دەردەچێت بریتییە لە گازی کلۆر.

هەوڵ و تەقەلای ئەم زانایانە رێگای رۆشن کردەوە بۆ قوتابیەکانیان کە یەك لە دوای یەك توخمە کیمیاییەکان بدۆزنەوە وە بەم شێوەیە بۆمان روون بوەوە کە چۆن زانستییە کیمیا لە جادوگەرییو نەزانینەوە کە بەشێکی زۆری لە ماوەی کیمیای کۆن داگیر کردبوو گەیشتە زانستێك بڵاونامەیەکی روونی رێك و پێکی پێشکەش بە بیری مرۆڤ کردوە دەربارەی یاساکانی یەکگرتنی کیمیایی لە سەر بناغەی هەر دوو بیردۆزی ئەتۆمی و مولکیولی دالتۆن ئەڤاگادرو وە کیمیاییەکان لە ماوەی ٢٠٠ ساڵی رابووردوو توانیان کۆمەڵێکی زۆر لەو ماددانە بهێننە بەرهەم کە سوودیان بۆ مرۆڤ هەبووە. هەرچەندە کیمیا کارگوزارییەکی مەزنی هەبووە تا ئەم رۆژە، توانای کیمیا بۆ بەشدار بوون لە حەوانەوەی مرۆڤ و بەختیاریداو لە پێشکەوتنی گشتی شارستانێتیو رۆشنبیریدا هەر بەردەوامە وە دەستکەوتەکانی کۆن تەنها شتێکی زۆر کەمە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەو دەستکەوتانەی لە پاشە رۆژدا چاوەروان دەکرێت. تەنها سەرنجێك لە هەوڵی زاناکانی کیمیا ئەوەمان بۆ دەردەخات کە مرۆڤ چەند مەزنە وە هەر لەسەر ئەم بناغەیەش پێویستی سەرشانی هەموو مرۆڤێکی خاوەن تێگەیشتن و هەستە کە ئەم دەستکەوتی زانایانە لە رێگای راستەوە بەکاربهێنێ بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی نەك بەکارهێنانێکی رووخێنەر کە ببێتە هۆی پچرپچر کردنی جیهان و توانەوەی بنچەی مرۆڤایەتی

# ووزەی گەرمی زەوی

# Geoth ermal energy

ئامادەکردنی

موزەفەر عەزیز گەلالی

زەوی کۆگایەکی مەزنی گەرمی‌یە لەئەنجامی رۆیشتنی گەرمی بەجۆرێ جولەی شلە گەرمەکانی ناخی زەوی بۆ سەرەوە ، هەندێ ناوچەی دیاری کراوی سەر زەوی لەهەندێ ناوچەی‌تر گەرمتر دەبن لەبەجێ هێنانە سەرسورهێنە رەکان و سەرنج ڕاکێشەکانی زانستی زەوی (جیۆلۆجیا) و تەکنۆلۆژیای ئەندازیاری ، بەکارهێنانی گەرمی سروشتی ناخی زەوی‌یە (ووزەی گەرمی زەوی) بۆ گەرم کردنەوەی خانووبەرەو بلەخانەو پەیداکردنی هێزی کارەبا .

هەوڵەکەی دەست بەسەرداگرتنی گەرمی زەوی و سوود وەرگرتنی شتێکی نوێ نی‌یە چونکە بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٠٤ دا ئیتالیا ووزەی گەرمی زەوی لە هەڵمی وشك بەکارهێنا لەو کاتەوە تاکو ئیمڕۆ وەك سەرچاوەیەکی ووزە زیاتر بایەخی پێ دەدرێت بەجۆرێك لەزۆر وولاتی وەکو یەکێتی سۆڤیەت و وولاتە یەك گرتووەکانی ئەمریکاو یابان و نیوزیلەندەو ئیسلەندەو مەکسیك و کالیفۆرنیا بۆ بەرهەم هێنانی ووزەی کارەبا بەکاردەهێنرێت.

ئەو برە گەرمی‌یەی کە لەزەوی دەست دەکەوێت و دەخرێتەکار، بەشێکی کەمی ئەو ووزە گشتی‌یە پێك دەهێنێت کە لەگەنجینەی گەرمی ناوەوەی زەوی بەدەست دەهێنرێت .

## جیۆلۆجیای گەرمی زەوی

لەم سەردەمەدا گەرمی زەوی بەیەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی ووزە دەژمێردرێت، بەتایبەتی لەو ماوەیەی کە نرخی سوتەمەنی‌یە بوو بەبەردەکان (Fossil Fuels)ی وەك نەوت، گازی سروشتی، خەڵوز لە هەڵکشانێکی بەردەوام دایە.

لەزۆربەی وولاتەکان دا ووزەی دەست کەوتوو لەگەرمی زەوی وەك جێگرێك یا لەجیاتی ووزەی سووتەمەنی‌یە بوو بەبە ردەکان بەکاردەهێنرێت. زاراوەی گەرمی زەوی (Geothermal ) ئاماژە بۆ ئەو گەرمی‌یە دەکات کە لە قولایی ناخی زەوی‌یەوە پەیدادەبێت.

زەوی زانەکان دەزانن گەرمی زەوی ئەو گەرمی‌یەیە کە لەتواوەی (صهیر Magma ) ناخی زەوی دەردەچێت بەرهەم هێنانی گەرمی سروشتی ناخی زەوی لەو دیاردە جیۆلۆجی‌یانەیە هێشتا کە بەتەواوی تێی نەگەیشتوون، بەلام ئەو شتەی لێ‌ی‌زانراه ئەوەیە کە هەندێك ناوچە رۆیشتنی گەرمی ناوەوەی لەهەندێ ناوچەی‌تر بەرزترە ئەو ناوچانەش بەزۆری لەگەل خولە تەکتۆنی‌یەکان دا(tectonic Cycle ) دەبن، وەکو رژێمی بەرزایی‌یەکانی زەریا (Oceanic Ridge System ) کەسنوری پلێتە لەیەك نزیك بووەوەکان (Convergent plate boundary ) وسنووری پلێتە لەیەك دوور کەوتووەکان (Divergent Plate boundary ) دەگرێتەوە.

لەئەنجامی جولەی ئەو زنجیرە چیاکان و کەوانەی دورگە بورکانی‌یەکان دروست دەبن. لەبەر ئەوەی ئەو ناوچانە (heatflow ) رۆیشتنێکی گەرمی بەرزی سروشتی‌یان هەیەو سەرچاوەی گەرمی‌یەکەیان لە رووی زەوی‌یەوە نزیکە، دەتوانرێت سوود لەبری گەرمی‌یەکەیان وەربگیرێت باشترین شوێنی سەرزەوی بۆ دۆزینەوەی گەرمی زەوی سێ ناوچەن :

١)ناوچەی کانیاوو قەڵبەزە گەرمە سروشتی یەکان (نافورە = Geysers) کە ئاماژە بۆ بوونی ناوچەی گەرمی نزیك سەرزەوی دەکەن




وێنەی ١٠، ..

هێلکاری رژێمی ئاوی گەرم

٢ـ ناوچەی چالاکی بورکانە نوێیەکان بەتایبەتیش ئەوانەی بەتـواوەی (شـلە) پر سلیـکـا (High – Silica Magma) جیـادەکرێنەوە، چونکە گەرمی‌یەکی زۆر لەنزیك رووی زەوی کۆدەکەنەوە بەجۆرێك لەوانەیە بەهەڵکەندن (حفر) بیگەنێ .

٣) هەنـدێ ناوچـەی تری گەرمی hot spots لەگـەڵ هەندێك دیاردە کە بەهۆیەکانی پشکنینی (بەدوادا گەرانی راستەوخۆ یان ناراستـەوخۆ (رێگەی جیۆفیزیایی) دەدۆزرێنەوە بەپشت بەستن بە چەند بەڵگەو دیاردەیەکی جیۆلۆجی دەتوانرێت چەند رژێمێکی گەرمی زەوی دیاری بکرێت.

لەو رژێمانەش گرنگترینیان: ١) رژێمەکانی هەڵگری ئاوی گەرم (Hydrothermal Convection Systems)

٢ـ رژێمەکانی تەنە ئاگرینی‌یە گەرمەکان(Hot Igneous Sys-tems

٣ـ رژێمەکانی پاڵەپەستۆی زەوی (Geopressure Systems) بەوپێـیەی ئەو رژێمـانـە سەرچـاوەی ووزەن هەریـەکێکیان سەرچـاوەووزەیـەکی شاراوەی جیـاوازی هەیـە والەخوارەوە بەکورتی باسی هەریەك لەو رژێمانەو رێگای سوودلێ وەرگرتنیان دەکەین:

**یەکەم: رژێمی هەڵ گری ئاوی گەرم**

ئەم رژێمـە بەبـوونی چینە کە ڤرێکی پیاهێڵەر (permeable) دەنـاسرێتـەوە ، کە برێـکـی گۆراوی ئاوی گەرمـی تێـدا دەسورێتەوە ئەمەش دوو جۆری بنەرەتی هەیە رژێمی: هەڵم و رژێمی ئاوی گەرم رژێمی هەڵی، بریێە لە کۆگای (reservoir) گەرمی زەوی تێیدا ئاوو هەڵم لە قولایی‌کی نزیك رووی زەویدا دەبن لەو بارەدا ئاوە گەرمـەکـە بۆ هەڵم دەگـۆرێت، بە هۆی راستەوخۆ ئاراستەکردنی بۆ تۆربینەوە(Turbins) دەتوانرێت بۆ بەرهـەم هێنانی ووزەی کارەبا بەکاربهێنرێت ئەم رژێمە بەوە جیـادەکرێتەوە کە بەسستی بە ئاوی ژێرزەوی باربۆدەکرێت بەشێـویـەك کەڤـرە گەرمەکان لەتواناییاندا هەیە ئاو بۆ هەڵم بگـۆرن بەدەربـرینێکی تر کەڤـرەکـان لەچـاو ئەو ئاوەی کەبـەشێـوەیـەکی سروشتی پێیـان دەدرێت گەرمی‌یـەکی زۆرتـریـان هەیـە بگـرە گەڵێ زۆرترە لەوەی بۆ هەڵماندنی ئاو پێـویستـە. ئەم رژێمە لە جیهان دا زۆر کەم هەیە، نمونەشی قەڵبـەزە گەرمـەکـانی (Geysers) کالیفـورنیـایە لەووڵاتە یەك گرتووەکانی ئەمریکا کەوا چەند سالێکە بۆپەیدا کردنی ووزەی کارەبـا بەکـاردەهێنـرێت رژێمی ئاوی گەرم لەم رژێمـەدا پشتێنێکی (ناوچەیەکی) ئاوی گەرمی سوراوی بێ هەڵم هەیە. کاتێ بەهـۆی هەڵ کەندن دەیگەنێ ئاوی گەرم بەپەستانێکی کەم بەناو بۆرییەکان دا بۆ سەرەوە هەڵ دەکێشێت.

ئەم ئاوە لەسـەر زەوی تێکـەڵێك لە ئاوو هەڵی گەرم کەپلەی گەرمی‌یەکەی لە ١٥٠ْس بەرزتر دەبێت بەدەستەوە دەدات لەو بارەدا ئەگـەر بویستـرێت هەڵەکە بۆ ئیش پێکردنی تۆربێن بەمـەبـەستی پەیداکردنی ووزەی کارەبا بەکار ببرێت ، ئەوا دەبێت ئاوەکە لە هەڵەکە جیابکرێتەوە .

ئەمـەش بە دووبـارەگـەرانـدنـەوەی (تێکـردنـەوەی) ئاوە جیاکراوەکە بۆ ناو زەوی دەبێت .

ئەم رژێمە لەزۆر شوێنی جیهان دا هەیە بەتایبەتی لە ووڵاتە یەك گرتووەکانی ئەمەریکا .

وێنە (١)

**دووەم :ـ رژێمی تەنە ئاگرینی‌یە گەرمەکان :ـ**

ئەم رژێمە بوونی شلەی تواوە (Molten Magma) لە قوڵایی‌یە جیـاوازەکـانی ناخی زەوی لەپلەی گەرمی نێـوان (٦٥٠ْ ـ ١٢٠٠ْ)س بەگـوێـرەی جۆری شلەکـە دەگـرێتەوە هەروەها بارستایی‌یەکی زلی کەڤرە ووشکەکانیش بەخۆی دەگرێت ئەم رژێمە گەرمی پاشەکەوت کراوی لەیەکەیەکی قەبارەدا لەهەموو رژێمەکانی تری گەرمی زەوی زۆرترە بەڵام ئەو برە ئاو گەرمەی تێدا نیە کە لەرژێمی هەڵ گری ئاوی گەرم دا هەیە بەنیسبەت ئەو کۆگـا گەرمی‌یـانـەی کەڤـری گەرم و ووشکیـان هەیـە ، دەتوانرێت بەهۆی هەل کەندن(بیرلێدان) موە گەرمی‌یەکەیان بخـرێتەکار. لێرەدا یەکەم جار کەڤرەکە هەڵ دەکەندرێ ئنجا بەهۆی تەقێنە رەوەکانەوە (بۆئاسان کردنی رۆیشتنی ئاوتێیدا) تێك دەشکێندرێت لە دوایی دا لەلایەك بەبۆری تایبەتی ئاوی سارد بۆ خوارەوە دەنـێردرێت لەلایەکی تریشەوە ئاوی



هێڵکاری دەست بەسەرداگرتنە ووزەی گەرمی زەوی رووت دەکاتەوە .

گەرم بەبۆری تر هەڵ دەهێنجرێت وێنەی (٢) .
ئەم سەردەمەدا گەلێ ئەزمون بۆخستنەکاری ووزەی گەرمی تەنە ئاگرینییەکان لە قولایی نێوان (٣ـ١٠) کم ئەنجام دەدرێت .

**٣ـ رژێمی پاڵەپەستۆی زەوی :ـ**

ئەم رژێمە لەو ناوچانەدا هەیە کە لەقولاییە جیاوازەکاندا چینێکی پیادا نەهێڵ (کوێر = ImpermeabLe ) یان لەقور yclay هەیە ئەم چینە وەك دابر کەرێکی باش و کاریگەر رێگای رۆیشتنی گەرمی سروشتی ناخی زەوی بۆ سەرەوە دەگرێت .
شوێنەواری گونجاو بۆ ئەو جۆرە رژێمە بەخێرانیشتنی نیشتووەکان و دابەزینێکی فراوانی زەوی (Regional Subsi- dence) دەناسرێت ئاوی ئەو کۆگایانەو ئاوی گەمارۆداوی ماددە نیشتووەکان پاڵەپەستۆیەکی ئاوی لەبارو بەجۆش بەرهەم دەهێنن ئەم رژێمە لەقولایی نێوان (٤ ـ ٧) کم و پلەی گەرمی نێوان (١٥٠ـ ٢٧٣) س دا هەیە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە
یەکەم :ـ توانای گەرم کردنی برێکی زۆری ئاوی گەرم هەیە
دووەم :ـ ووزەیەکی میکانیکی لە ئاوی پەستێوراوی تێدایە کە دەشێت بۆ بەگەرخستنی تۆربین بەنیازی پەیداکردنی وزەی کارەبا بەکاربهێنرێت .
سێیەم :ـ ئاوەکە برێکی باش گازی میثانی تواوەی (٣٠ پێ سێ جا گاز بۆ هەر بەرمیلێك ئاو) تێدایە کەوا سودێکی باشی لێ وەردەگیرێت .

**ـ دواڕۆژی ووزەی گەرمی زەوی ـ**

شتێکی روون و ئاشکرایە کە ووزەی گەرمی زەوی داهاتوویەکی پرشنگداری هەیە لە ساڵی ١٩٧٥ دا بەرهەم هێنانی ووزەی کارەبای دەست کەوتوو لە ووزەی گەرمی زەوی لە جیهان گەیشتە ..١٤ ملیۆن وات ئەمەش لەبەرهەمی دوو ئێستگەی ناوکی پەیدا کردنی ووزەی کارەبا کەمترە کەهەر یەکێکیان هەزار ملیۆن وات دەکات. بەرهەمی دەست کەوتووی قەبڵێنراو لەو سەرچاوە بێشومارەی ووزە لەم کاتەدا (بەچاوپۆشین لەتێ چوون (کلفة) لە هەردوو رژێمی هەڵ گری ئاوی گەرم و رژێمی پاڵەپەستۆی زەوی بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ دەکاتە نزیکەی بەرهەمی ١٤٠ ئێستگەی نوێی ناوکی ووزە .
ـ کاریگەری دەوروبەری پەرەسەندنی ووزەی گەرمی زەوی هەرچەندە پەرەسەندنی ووزەی گەرمی زەوی و زیاتر خستنەژێر دەستی کار لەدەوروبەر دەکات بەلام کارتێکردنەکەی لەچاو سەرچاوەکانی تری ووزە کە مەو فەرامۆش دەکرێت لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك گیروگرفتی شوێنی دەهێنێتەوە وەکو دەرپەراندنی گازو ژاوەژاو (ضوضاء) و بەجێهێشتنی پاشەرۆی پیشەسازی و هتد ... جێی خۆشحاڵیە پێشکەوتنی وزەی گەرمی زەوی پێویستی بەگوازستنەوەی کەرستەی خاوو پالاوتن نیە کەتایبەتە بەسوتەمەنییە بووبەبەردەکان (الوقود المتحجرة) سەرباری ئەوە نابێتە هۆی پەیداکردنی پیسکەرەکانی بەرگی هەوا کەوا بەزۆری لە سوتاندنی نەوت و خەلوزو ماددەکانی تر پەیدا دەبن هەروەها پاشماوەی تیشکاوەری بەجێ ناهێڵێت پەرەسەندنی گەرما ووزە بێجگە لە رژێمی هەڵمی پیس کردنی گەرمی (تلوث حراري) ئاوی پاشماوە گەرمەکان دەهێنێتەوە کەوا ئاوەکە سووریان زۆر داماڵ کەر (Corrosive) دەبێت بۆ پاك کردنەوەی ئەو جۆرە ئاوە دەبێ دووبارە لە کۆگای گەرمە ووزە بکرێتەوە شایانی باسە ئاوی تێ کراوە رژێمی دەرمزو قلیشەکان (Fracture Systems) چالاك دەکات و لەوانەیە ببێتە هۆی روودانی بوومەلەرزە. هەروەها هەڵێنجانی (ضخ) بەردەوامی شلەکانی زەوی کۆگاکان دەپەستێوی لەم بارەشدا رەنگە رۆچوون یا رووکارە دانیشتن (Surface Subsidence) روبدات دیسانەوە رۆچوون لەوانەیە لە ئەنجامی وەرگرتنی گەرمی لەکەفرەوە پەیدابێت ، چونکە کەفربە ساردبوونەوە دێتەوە یەك و بۆشاییەك لەگەڵ کەفرێکی تر بەجێ دەهێڵێت و بەوە رێگا بۆ رۆچوون خۆش دەبێت .

**سەرچاوەکان**

1- Keller , E.A. , 1985. Environmental Geology, Uth edition
2- Lutgens, F.K. , 1986. Essentials of Geology 2nd edition, ABell 8Howell Company
٣ـ جمیل، د. عادل کمال، ١٩٧٨، طاقة حرارة الارض، مجلة (العلم والشباب) عدد ٦٢

# وێنەو کاریکاتێرو تایپۆگرافیاو بڵاوکردنەوەیان لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا

نەژاد عزیز سورمێ

● بەشی دووەم ●

## ● بڵاوکردنەوەی وێنە لەنێوان ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێب دا.

باوەکو لەچۆنیەتی چاپ و بڵاوکردنەوەدا جیاوازیەکی ئەوتۆ لە نێوان بڵاوکردنەوەی وێنە لە ڕۆژنامەو بڵاوکردنەوەی لە گۆڤاردا نەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا گۆڤار (بەپێی ئەو لایەنەی تایبەتمەندی لێ وەردەگرێ) ماوەی لێخەوتانی زیاترە؛ چونکە یەکەم وەختێکی زیاتری لەپێشەو یەکی پاشیش بڵاوکردنەوەی تێدا ئاسان ترە بەوەی ئەوەندە پابەندی ئەو سنوورانە نابێ کە بۆ ڕۆژنامە کێشراون..

دیسان گۆڤار هەیە وێنە هەر بە دوایی بڵاوناکاتەوە؛ وەکو هێندێ گۆڤاری ئەدەبی، بە نموونە (نووسەری کورد) وەك لە پێشەوەیش باسمان کرد. بەڵام لە هەمان کاتیش دا گۆڤار هەیە ئەگەر لە ڕۆژنامە زیاتر وێنە بڵاونەکاتەوە کەمتر نیە، وەکو زۆربەی ئەو گۆڤارانەی تایبەتن بە منداڵان و هەندێ گۆڤاری دیکەی تەندروستیو پزیشکیو ئەوانەی تایبەتن بە لقەکانی زانست کە بەبێ وێنەی ڕوون کردنەوە تێگەیشتنیان ئاسان نیە.

وێنەیش لە گۆڤاردا تەنانەت لەڕووی قەوارەیشەوە لەگەڵ ئەوەی لە ڕۆژنامەدا بڵاودەکرێتەوە جیایە؛ بەهۆی ئەوەی ستوونەکانی ڕۆژنامە بەرتەسکترن لە هی گۆڤار، لە قەوارەی لاپەڕەکانیش دا جیاوازن. ڕۆژنامە کەمتر وێنەی ڕەنگاوڕەنگ بڵاودەکاتەوە، وەکی دی گۆڤار ئەگەر وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی هەر تێدا نەبێ بەرگەکەی ڕەنگاو ڕەنگە..

بەگوێرەی کتێب و چاپکراوی تریشەوە: هەموو کتێبێك مەرج نیە وێنەی تێدا بێ، ئەو کتێبانەی کە پێویستە وێنەیان تێدا بێ زیاتر ئەمانەی خوارەوەن:-

- کتێبەکانی خوێندن و پەروەردە.
- کتێبی تایبەت بە منداڵان.
- ئەوانەی وێنەی ڕوون کردنەوەیان دەوێ، وەك کتێبە زانستیەکان فیزیا، کیمیا، زیندەوەرزانی، ئەندازە

پزیشکیو.. تاد.

- ئەتڵەس و نەخشەکان، کە هەر خۆیان لە خودی خۆیان دا جۆری وێنەدارن.
- ئەو کتێبانەی تایبەتن بە هونەرە جوانەکان؛ تەشکیل، سینەما، شانۆ، مۆسیقاو... تاد.
- ئینسکلۆپیدیاو فەرهەنگەکانی زمان.
- ئەو باس و لێکۆڵینەوانەی لە دانشگاو لایەنی زانستی ترەوە لە شێوەی کتێب یا نامیلکە چاپ دەکرێن.
- ڤۆلدەرو نامیلکەکانی گەشت و گوزارو ئەوانەی بۆ پیشانگایان لەچاپ دەدرێن.
- ئەو بڵاوکراوانەی بە مەبەستی پیشان دانی چالاکی دەزگایەکەوە دەردەچن.
- نامیلکەو ڤۆلدەرەکانی بە مەبەستی راگەیاندن یا جاردانێکی بازرگانی یا پیشەسازی‌یەوە چاپ دەکرێن. بڕوانە وێنە (٩).



- وێنە (٩)

بەکارهێنانی وێنە (قەڵەمکێش) بە مەبەستی روونکردنەوە.

بڵاوکردنەوەی وێنە لە کتێبی کوردی‌دا سایلی رۆژنامەو گۆڤارەکانی هەمدیس رەمەکی‌و بێ پلان بووە، سوێندی کتێبەکانی قوتابخانە ناخۆم کە ئەوانیش لەسەر بناغەی کتێبە عەرەبیەکانەوە چاپ دەکرێن [٤١]، هەروەها چەند کتێبێکی دیکە کە زیاتر بە کۆشش و ماندووبوونی خاوەنەکانیانەوە بووە!

وێنە لە کتێبەکانمان دا بەزۆری نە پێرستی بۆ دەکرێ نە هێمایێکی دەبێ پێی بناسرێتەوە! ئەوە روونی‌و سافیشی لەو لاوە بوەستێ، کە هەندێ جار بڵاوکردنەوەو بڵاونەکردنەوەی وەك یەك لێ دێ!!

لەبەر ئەم چەند تاڵە رۆشنایی‌یەدا دەگەینە ئەوەی بڵێین بڵاوکردنەوەی وێنە لە رۆژنامەگەری‌و چاپکراوی کوردی‌دا هێشتا وەك پێویست بەهەند هەڵنەگیراوە، هەر چەندە هەندێ لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەم دوایی‌یە خەریکن نرخ و بایەخێك بە وێنە دەدەن، بە نموونە:ـ

رۆژنامەی (پاشکۆی عیراق) و گۆڤاری (تەندروستی‌و کۆمەڵ)و گۆڤاری (کاروان) و (رەنگین) تارادەیەك، بۆیەش دەڵێم (تارادەیەك)، چونکە زۆربەی ئەم چاپکراوانە: یەکەم پشتی تەواویان بە ئەرشیف و چاپکراوی دیکە بەستووە، دووەمیش هەندێکیان وا دەزانن بەزۆری بڵاوکردنەوەیە.. کە ئەمەش دوورە لەوەی چاپکراوێك بایەخ بە وێنە بدا، مەسەلەکە لە چەندێتی‌دا نی‌یە لەچۆنیەتی دایەو هەر ئەویشە چەندێتی دیاری دەکا.

بەم جۆرە دەگەینە ئەوەی کە وێنە رەگەزێکی بنچینەیی‌یە لە رۆژنامەو گۆڤارو کتێبیش داو ئەمرۆیش بەدەگمەن هەڵدەکەوێ چاپکراوێك وێنەی تێدا نەبێ.

## ● کورتەیەك دەربارەی گواستنەوەو لەچاپدان و گەورەو بچووك کردنەوەی وێنە ●

### ● گواستنەوەی وێنە:

جیهان ئەمڕۆ وێك هاتووەتەوە.. بچووك بووەتەوە!! شۆڕشی تەکنەلۆژی سەدەی بیستەم کە هەموو بوارێکی گرتووەتەوە لەوەندەی پێوەندی بە داهێنانەکانی سەر بە پێك

گەیشتن و ڕاگەیاندنەوە هەبێ ئەم جیهانەی پێك بەستووەتەوە: لەم سەری دونیا شتێك دەقەومێ لەوسەری دەبینرێ و لەهەمان دەقیقەدا!

لەم ڕوانگــەیەوە ڕۆژنامەگەریی سوودێکی تەواوی لەو داهێنـانــە بینیوە[٤٢]، بەتایبەتیش لە گواستنەوەی وێنەدا؛ کە ئاژانسەکانی دەنگ وباس بە چوارئێقلیمی دنیایێ دا بڵاو دەکەنەوە.

ئێستا «لەڕۆژێك دا (١٨) هەژدە ملیار وێنە دەگوێزرێتەوە[٤٣]» جا ئەگەر دوێنێ بەهۆی سەختیی دروست کردنی کەلیشەوە بڵاوکردنــەوەی وێنــە ئاسان نەبووبێ، ئەمڕۆ نەك هەر چاپ کردنی ئاســان بووە، بەدەگمــەنیش نەبێ ناوی کەلیشــە بۆ ڕۆژنـامــە لەنـاو ناوان نەماوە. هەر ئەوەش نا گواستنەوەیشی ئاسان بووە[٤٤]، بۆیە جاران کە پێشبرکێ لەسەر ناردنی هەواڵ و دەنگ وباسەوە دەکرا، ئەمڕۆ فرکێن فرکێن لەسەر ناردن و گواستنەوەیەتی.

ئێستا با بزانین وێنە چۆن دەگوازرێتەوەو چۆن دەگاتە ڕۆژنامە؟

وێنە بەم ڕێگایانەی خوارەوە دەگاتە ڕۆژنامە:

**یەکەم/** بەهۆیەکانی گواستنەوەی ئاسایی:-
- بەدەست (کە ئێستا زۆر دەگمەنە)
- بە هۆیەکانی گواستنەوەی زەمینی وەك: ئوتومبیل و شەمەندەفەر.
- بەهۆیەکانی گواستنەوەی ئاسمانی (فڕۆکە).
- بەهۆی دەریاوە، کەشتیو پاپۆڕ.

**دووەم/** بەهۆی ئاژانسەکانی دەنگ وباس، کە لقێکی تایبەتیان بۆ ناردن و وەرگرتنی وێنە تەرخان کردووە.

ئەم ئاژانسانەیش بەهۆی؛ ڕادیۆی تایبەت بە گواستنەوەی وێنە (ناردن و وەرگرتن).

گواستنەوەی وێنەیش بەڕادیۆ ئەمڕۆ بۆ ڕۆژنامەگەریی نوێ بووە بە پێویستییەکی پێویست. جێی باسە کە «شەڕی جیهــانــی دووەم کارێــکــی باشی کردەســەر گواستنــەوەو بڵاوبوونەوەی وێنە بەڕادیۆ[٤٥]».

## گواستنەوەی وێنەیش بەڕادیۆ چۆن دەبێ؟

**ساڵی ١٩٢٨** توانرا وێنە بەبێ تەل بگوێزرێتەوە، ئەویش **بەهــۆی گۆڕینی** بەهــای تیشکیی لەسێبەرو نیمچە سێبەرو **ڕوناهی** بە شەپۆلی کارەبایی کە لەگەڵ تیشکە ڕووناکییەکان دا **هاوڕێژە** بن[٤٦]

کارەکــەیش بەکـورتی بەم جۆرە ئەنجـام دەدرێ: ئەو **وێنــەی** مەبەستە بینێرن دێنن لە لوولەیێکی دەگرن کە لە **نێو ئامــێرێکی تایبــەتیدا** بە دەوری خۆیدا دەخـولێتــەوە. **هەر بەهــۆی ئەو ئامــێرەیشــەوە** وێنــەی شوێنــە سپییــەکـان بە هاوێنــەیــەکی ورد لەشێــوەی هێــڵ دا دەگــیرێ پاشان بەها تیشکییەکان دەبنە شەپۆلی کارۆموگناتیسی بۆ ئامێرێکی دیکە دێن کە بە تەل بە ئامێری یەکەمەوە بەندەو لەهەمان کاتیش دا بەو نێردانەی شەپۆلەکان بەڕەڵڵای هەوا دەکەن[٤٧]. بڕوانە وێنە (١٠)



- وێنە (١٠)

ئامێری ناردنی وێنە

ئامێری وەرگرتنی وێنە

ئامێرەکانی وەرگرتنیش هەر بەو چەشنەن بەلام بە شێوەیەکی پێچەوانەیی؛ «ئەوان شەپۆلی کارۆموگناتیسی لە رێگای تەلی هەواییەوە (ئانتێنا) وەردەگرن، تەلەکانیش بەدەوری خۆیان بە ئامێری وەرگرتنەوە (رادیۆ) پێوەندن، ئەویش بە ئامێرێکی تر کە شەپۆلی کارۆموگناتیسی دەکاتەوە بە بەها تیشکییەکان و بەم جۆرە تیشکەکانیش دێنە سەر رووبێکی هەستتدارو... تاد[48]». بڕوانە وێنە (١١)

**سێیەم/ بەهۆی تەلەفۆن**: ئەم رێگایەش زیاتر پەیامنێرەکانی رۆژنامە بۆ زووتر گەیاندنی وێنەو شتیتر بەکاری دێنن. ئامێرێکی بچووکەو لە تەلەفۆنی دەبەستن، لەوسەریشەوە رۆژنامە بەهۆی ئامێرێکی تایبەتی دیکەوە وێنەکان وەردەگرێ.

**چوارەم/ بەهۆی ئامێری تەلفۆتۆی تەماتیکی**؛ ئەم ئامێرەش لەم دوادواییانە داهێنرا؛ لەخۆرا وێنە وەردەگرێ بێ ئەوەی کەسی لەسەر بێ، بەڵکو بەپێی فەرمانەکانی ئامێری نێرەرەوە کار دەکا.

## ● چاپکردنی وێنە :

لەچاپدانی وێنە بە رێگاکانی چاپ کردنەوە بەندەو

- وێنە (١١)

تەلەستینێک کە کواستنەوەی وێنە بەهۆی رادیۆوە روون دەکاتەوە.



دەگۆرێ، **بەکورتی**: لە جۆری چاپی (لێتەرپرێس)دا، وێنەو قەڵەمکێش و نەخشەو هەرچییەك بێ لە دەقەکە ... پێویستە کەلیشە بکرێ واتە زەنگ بکرێ، لە هەندێکیان دەبێ کەلیشەکان لەداریش چەسپ بکرێن تا بگاتە ئاستی دەقە چنراوەکە

لەم جۆرەدا وێنەکە بەو تەرزە ساف و روون دەرناچێ، مەگەر چا... رێکی کارامەی لەسەر بێو چاپەکە یەکجار پاك بێ. دوای کەلیشە کردنیش ناکرێ دەسکاری بکرێو گەورەو بچووك بکرێتەوە.

بەلام لەجۆری ... چاپی ئوفسێت دەناسرێو ئەمرۆ زۆربەی چاپکراوەکانی دنیا پەیرەوی ئەم رێگایە دەکەن جگە لەوەی لە چاپ دانی ئاسانترە، لەبارترو ساف و روونتریش دەر چێ، هەر وەختێ بشمانەوێ گەورەو بچووکی دەکەینەوە...

دیسان ئەم رێگایە وەختیشی زۆر ناوێ.

چاپکردنی وێنەیش بەرێگای ئوفسێت بەم جۆرە دەبێ:

با لەوە دەست پێ بکەین کە (وێنە) دوای ئەوەی لەسەرچاوە جیاجیاکانی باسمان کردن دەگاتە رۆژنامە.. دەرهێنەر یا سکرتێری نووسین، پێش هەموو شتێك دوای ئەوەی ئەو وێنەو قەڵەمکێشانە دیاری دەکا کە بلاو دەکرێنەوە، ئەوجار فۆتۆگراف و قەڵەمکێشەکان لێك جیا دەکاتەوە، چونکە هەر وێنەیەك هێڵکار بێ (Line) لەگەل دەقە چنراوەکە وێنەی دەگیرێ، بەلام فوتۆگرافەکان لە نەخشەسازیو دەرهێنان دا تەنها پ...ەرەکانیان دەسنیشان دەکرێو لە وێنەگرتن بە کوللەیی (شبك) وێنەیان دەگیرێ[49].

دوای ئەمانە وێنەکان دەنێردرێنە (بەشی وێنەگرتن)، لەبەشی وێنەگرتن دا دوای ئە...ی وێنەی دەگیرێو لە دەرمانی بەدیارخستن و چەسپ بوون هەلدەکێشرێو لە نێگەتیفەوە دەکرێ بە پۆزەتیف، یاخود هەروا دەهێلرێتەوە (بەپێی پێویست و راسپاردنی بەشی هونەریی یا سکرتێری نووسین) وشك دەکرێتەوەو دەنێردرێتە بەشی مۆنتاژ.

لەبەشی مۆنتاژیش بەپێی پێوەری چاپکراوەکە لەگەل دەقی وێنەگیراودا رێك دەخرێو ئەوجار دەنێردرێتە بەشی




- وێنە

بچووک کردنەوەو گەورەکردنی وێنەو نەخشە

وێنـەگـرتنی سـەر پلێت (کـۆنتـاك) کە بەهۆی تیشکی ژوور ونـەوشـەییەوە وێنەی دەگرێتەوە. دواجار دەنێردرێتە بەشی چاپ و ئە نووئە (سلندەر)ی مەکینەی چاپکردن دەگیرێ و دەست بە چاپکردنی دەکرێ. لەم چەشنە چاپەدا دەتوانین تارادەی پتر لە (١٠٠) هەزاری پێ چاپ بکەین، چەندی چاپی لێتەرە توانای ئەو هەندەی نییە. بڕوانە وێنە (١٢).

● **گەورەکردن و بچووك کردنەوەی وێنە.**

هەر وێنەیەك کە دەگاتە رۆژنامە مەرج نییە بە قەوارەی خۆی بلاو بکـرێتـەوە، وێنە هەیە زیاد لە پێویست گەورەیەو بەپێچەوانەوەیش هەیە بچووکەو پێویست دەکا گەورە بکرێ؛ بۆیــە دەرهێنــەری هونــەریی ناچـار دەبێ بەپێی قەوارەی لاپــەڕەکــەو جۆرو بایــەخی وێنــەکــەو سیاسەتی دەرهێنانی چاپکراوەکە دەسکاری بکا.

ئاسـانتـرین ڕێگای گەورەکردن و بچووك کردنەوەی وێنەیش (هـەر وێنـەیـەك) بەم جۆرەیـە: ئێمـە دەزانین شێوەی وێنە لاکێشـەیی و چوارگـۆشـەیی هەیـە، جا بۆ نمـوونـە ئەگـەر وێنـەیـەکمـان هەبێ بە پانای ١٤ سم و درێژایی ٢٠ سم و ویستمان ببێ بە ١٥سم، هێڵێك لەم سەرو ئەوسەری وێنەکە دەکێشین تا ئەورەی وێنەکە پێك دەهێنێ. پاشان بەپانی ١٥سم دەپێوین و هەر لەو پنتـەیشـەوە هێڵێکی درێـژ وەردەگرین، بەرزیی ئەم هێڵە دەکاتە بەرزی وێنەکە (پانی) دوای بچووك کردنــەوەی. گەورەکــردنــیشی هەر بەو جۆرە دەبــێ، بەڵام بەپێچــەوانــەوە، ئەمجارە هێڵی ئەورە بۆ دەرەوەی وێنە درێژ دەبێتەوە[٥٠]. تەماشای وێنە (١٣) بکە.

● **نوێنشکێك لەبارەی چاپکردنی وێنەی ڕەنگاو ڕەنگ**

لەچـاپـدانی وێنــەی ڕەنگاو ڕەنگ دیاردەیەکی دیکەی پێشکــەوتنی چاپ و ڕۆژنــامــەگەرییە.. سەبارەت بەوەی کە وێنــەی ڕەنگــاورەنــگ پێـویستی بە ڕەنگ ڕێژی و تەکنیکێکی تایبەتی هەیە.

لەچـاپکردنی وێنەی ڕەنگاو ڕەنگ دا (فۆتۆگراف بێ یا تابلۆ)، هەر ڕەنــگێــك دەبێ فلیمێکی هەبێ، هەر فلیمێکیش پێویستە بەپێی ڕەنگەکەیەوە تۆنێکی تایبەتی بدرێتی، ئەمەش بە بەکـارهێنــانی فیلتــەری تایبــەتییــەوە دەبێ کە لەهاوێنە (عـدســە)ی کامـێراوە دەگـیرێ و بەم جۆرە تەنیـا ئەو ڕەنگە

- وێنە (١٢)

خوولی وێنە لەسەرچاوەوە تا چاپ و بلاوبوونەوەی لە ڕۆژنامەدا.



| رەنگی خۆی | دەپەڕێتەوە | هەڵدەمژێ |
|---|---|---|
| ڕەش | | شین+سەوز+سور |
| شین | شین | سەوز + سور |
| سەوز | سەوز | شین + سور |
| سور | سور | شین + سەوز |
| زەرد | سەوز+ سور | شین |
| مۆر | شین + سور | سەوز |
| لەیەکەبی/لازوەردی | شین + سەوز | سور |
| سپی | شین + سەوز+سور | |

- وێنە (١٤)
دەرکەوتنی وێنەو رەنگەکانی لە رەنگڕشتن دا.

تێدەپەڕێنێو ئەوانی دی هەڵدەمژێ؛ بۆ نموونە فیلتەری پرتەقاڵی رەنگی سوورو زەرد تێدەپەڕێنێو شین هەڵدەمژێ، ئیتر شوێنە شینەکانی ناو وێنەکە دەرناچن و هەر بە سپی دەمێننەوەو رەنگەکانی تریش هەر بەو چەشنە «فیلتەری سەوز بۆ ئامادەکردنی رەنگی سوورو هی بنەوشەیی بۆ رەنگی زەرد بەکار دەهێنرێ[٥١]» - بڕوانە وێنە (١٤).

واتە هەر وێنەیەکی رەنگاورەنگ چوار فلیمی دەبێ، لە هەموویان کراوەو سپی‌پات تر لە چاپ کردن دا بۆ رەنگی رەش بەکار دەهێنرێ، چونکە ئەو رەنگە لە چاپکردنی وێنەی رەنگاو رەنگ دا پتر بۆ دیاریکردنی پلەیی سێبەرو ئادگاری وێنەکەیە..

لەهەموونیش تۆختر بۆ رەنگی زەرد، چونکە زەرد هەر خۆی سپی‌پاتە، بۆیە دەبێ فلیمە تۆخەکەی بۆ بەکار بێ.

ئەم مەسەلەی رەنگ رشتنەیش بەپێی تۆنی رەنگەکانی وێنەکە دەگۆڕێو لەهەمان کاتیشدا بەپێی شارەزاییو ئەزموونی وێنەگرەکە خۆی، هەر چەندە ئێستا لەگەڵێك شوێن دا ئامێری تایبەتی ئەم کارەی ئاسان کردووە.

پاشان فلیمەکان لەبەشی مۆنتاژدا چارەسەر دەکرێن، مەبەستیشمان لە چارەسەرکردن ئەوەیە کە پێك دەگیرێن و پێوەرەکانیان دیار دەکرێ تاکو کە فلیمەکان دەخرێنە سەر پلێت رەنگەکان شوێنی خۆیان بگرن و لەسەریەك دانەکەلێن لەکاتی چاپکردن دا.

بەم پێودانگە دوای ئەوەی دەخرێتە سەر پلێت لە سلندەری چاپکردن دەگیرێو رەنگ، رەنگ، یا دوو، دوو، یا هەر چواری بەدوای یەکەوە بەپێی رادەی پێشکەوتوویی مەکینەی چاپ لەچاپ دەدرێ. دەبێ ئەوەش بزانین کە رادەی جوان دەرچوونی وێنەی رەنگاو رەنگ لەچاپ دا؛ ئەوەندەی بە چۆنیەتی رەنگڕشتن و کارامەیی کرێکاری چاپەوە بەندە ئەوەندە بە جۆری مەکینەکەوە بەند نییە، ئەگەرچی مەکینەی چاپیش گرنگ بێ.

## ● کامیرای رۆژنامەنووس یا قەڵەمی وێنەگر (دەربارەی بنەماو سیفەتی وێنەو وێنەگری رۆژنامەنووسیی)

**(دەبێ وێنە بە هەمان**
**بایەخ پێدانی لەرادەبەدەر**
**لە دەربڕین و کار تێکردن بێ**
**کە هونەرمەندە مەزنەکان بە**
**تابلۆیەکانیان داوە ..**
**مارسیل کارنێ[٥٢])**

وتمان رۆژێ (١٨) هەژدە ملیار وێنە دەگوێزرێتەوە، بەڵام داخۆ لەو (١٨) ملیارە چەند وێنە سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ؟

بێ‌گومان وەڵامی ئەم پرسیارە هەروا ئاسان نییە، دەشێ بگاتە ئەوەی پێویستی بە چەندین لێکۆڵینەوەو بەدوادا چوونی سیسیۆلۆژیو سایکۆلۆژیو تەنانەت هەندێ لێکۆڵینەوەی مەیدانیشەوە هەبێ..

لەم روانگەیەوە هەوڵ دەدەین، وەك ئەوەی سیفەتی وێنەگری رۆژنامە بخەینە روو، هەروایش بنەماو سیفەتی وێنەی رۆژنامەنووسیی دیاری بکەین، ئەوجار پێ دەکەوین داخۆ تا چ رادەیێك رۆژنامەگەریی کوردی وێنەی وەك پێویستیەکی رۆژنامەنووسییو رەگەزێکی تایپۆگرافی بەهەند هەڵگرتووە.

### ● بنەماو سیفەتەکانی وێنەی رۆژنامەنووسیی لەبڵاوکردنەوەدا

زۆر کەس کە وشەی (فۆتۆگراف) دەبیەن یەکسەر بیریان لە قاوخێکی تەسك گیر دەبێ بەوەی فۆتۆگراف لای ئەو کەسانە گواستنەوەیەکی وشکی واقیعی دەوروبەرە هیچیتر!!

ئەوەی راستە مەسەلەکە بەپێچەوانەوەیە، کە گوتراوە

وێنـەیـەك لە رۆژنـامـەدا جێگـای سەدان وشــە دەگرێتەوە بەخـۆرایی نەگوتراوە، ئەگەرچی دەگونجێ هەندێ جار دەیان وێنە جێگای وشەیەك نەگرێتەوە، کەواتە مەسەلەکە ئەوەندەی بە چۆنیـەتی‌یەوە بەندە، ئەوەندە بەند نی‌یە بە چەندیەتی‌یەوە چونکە «وێنەی فۆتۆگرافی هەرگیز رەنگدانەوەیەکی سەراپاگیرو خرگـرەوەی واقیـع نی‌یـە.. فۆتـۆگـراف دەربڕی هەڵبژاردنی کۆمەڵێك سیفەت و بنەمای فیزیکی شتە وێنەگیراوەکەیە»[٥٣].

کەواتە لێرەدا قەڵەمی وێنەگر کە کامێراکەیەتی دەوری خۆی دەبینێ، وەلێ قەڵەم نەك وەکو چیلکە داریکی رەق و لووس، قەڵەم بەو دەست و پەنجانەوە کە بیر رابەرایەتیان دەکا.

هەر لەو گۆشــە نیگـایـەوە دێـین ئادگـارو سیفـەتی وێنــەی رۆژنامەنووسیی دیاری دەکەین.

بەش بەحـــاڵ؛ بە قەد ئەو ئەزمـــوونـــۆکـــەی خۆم لە رۆژنـامـەگـەری‌دا، بنەماو سیفەتی وێنەی رۆژنامەنووسیی، ئەوەی بشێ لە بڵاوکـردنـەوەی‌دا پەیـامی خۆی بگەیێنێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەبینم:

١ـ پێـویستە روون و ساف و دەربڕ بێ، واتە لێڵ و تێکەڵ و پێکەڵ نەبێ‌و یارمەتی خوێنەر بدات بۆ تێگەیشتنی تێکستەکە نەك سەری لێ بشێوێنێ.

٢ـ مەبەستی تێکیستە نووسراوەکە بگەیێنێ، واتە هەر تیرەو لە کەنـدالێـك نەبێ، وێنــەکــە مەبــەستێـك بگـەیێنێ، تێکستە نووسراوەکەیش مەبەستێکی دی[٥٤].

٣ـ بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی نەبێ و بەس، بەڵکو وێنەکە ئەوەی دەبەردابێ ببێ بە تەواوکەری بابەتە چاپکراوەکە وەکو زۆر جار لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی خۆمان دەبینین کە تەنیا بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی‌یەو هیچیتر[٥٥]!!

٤ـ لە بابەتی دەقەکە دەرنەچێ بە شێوەیەك بیری خوێنەر لە کاتی خوێندنەوە بەلایەکی دیکەدا ببا، بەپێچەوانەوە ببێ.. بە هۆی جێگیرکردنی دەقەکە لەبیری‌دا.

٥ـ کاریگــەر بێ: بەو مانـایەی ببێتە هۆیەك بۆ خوێندنەوەی بابەتە نووسراوەکە نەك لەبەر بێزرانی.

٦ـ کەم تاکـورتێکی بەڵگـەنـامەیی بنوێنێ بەگوێرەی دەورو بەهای رووداوەکان، هەروەها بەگوێرەی ئەو شوێن و کەسانەوە کە بەشداریان لە بوونی ئەو رووداوانەدا هەیە.

٧ـ بەژیانەوە پەیوەست بێ‌و دەربڕی ژیان بێ.

٨ـ نەبێتە هۆی روشاندنی رەوشتی کەس وەك (تاقە کەس) و هەروەهـا بۆنی پیاهەڵدان و پڕوپاگەندەی بۆ کەسانی دیاری کراوەوە تێدا نەبێ.

٩ـ لەگـەڵ سیـاسـەتی رۆژنامە یا گۆڤارەکەدا بێتەوە، چونکە ئەگەر وا نەبێ خوێنەر بڕوای بە رۆژنامەکە لەق دەبێ، بەم پێ‌یە دەورێکی پاشڤەبری دەبێ‌و مەبەست ناگەیێنێ.

١٠ـ لەرووی قەوارەوە تا بکرێ گەورە بێ‌و نووسینی لەسەر نەبێ.

١١ـ لەگۆشەیەکی لەباروە گیرابێ‌و زادەی کاتی شیاوی خۆی بێ.

لەبـەر رۆشنـایی ئەم خاڵانـەدا، کەم وا رێك کەوتووە وێنەیەکی لەو شێوەو رەنگەمان لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی خۆمان دا بەرچاو کەوتبێ.

ئەگەر هەندێ وێنەو قەڵەمکێشیش لە رۆژنامە یا گۆڤارێك بڵاوکرابێتەوەو سەرنجی راکێشابێ، زیاتر بەهۆی کارامەیی‌و وەستـایی بووە لە نەخشــەسازی‌دا نەك خودی وێنەکە، وەك ئەوانــەی لە رۆژنـامـەی (هاوکاری) ساڵانی حەفتا و گۆڤاری (تــەنــدروستی‌و کۆمــەڵ)و زۆربــەی ژمـارەکـانی گۆڤـاری (کاروان[٥٦])، کە ئەوانیش زیاتر جێ پەنجەی هونەرمەند (محمد زادە) یان پێـوە دیـارە[٥٧]، ئەم هونـەرمـەنـدە بێجگـە لەوەی خۆشنـووسێکی چاکـە؛ وەك نەخشەسازێکی هەرە کارامەیش جێی خۆی لە رۆژنامەگەریی کوردی‌دا کردووەتەوەو زۆربەی رۆژنامەو کتێبە کوردی‌یەکانیش جێ پەنجەی ئەویان بەسەرەوەیە...

## ● وێنەگر

لەژیان دا هەمووشتێك شایانی وێنەگرتنە، لە سادەترین شتەوە بگرە تا دەگاتە ئاڵۆزترینی، بەڵام گرینگ ئەوەیە وێنەگری رۆژنامە (بەر ێککەوتن لەگەڵ رۆژنامەنووس) بزانێ کامێراکەی (کە بۆ ئەو وەك قەڵەمی رۆژنامەنووس وایە) چۆن بەکار دێنێ‌و رووی لە چ گۆشــەیـەك دەکاو بۆچی؟ چونکە وێنەگریش وەك رۆژنامەنووس لەبەرابەر رای گشتی‌دا بەرپرسیارە، سەرەرای

ئەوەش دەبێ وەك هونەرمەندێك كەسایەتی خۆی بچەسپێنێ، بەرادەی ئەوەی لەنێو وێنەكەیدا ببینرێتەوە، وەك چۆن نووسەر لە نووسینەكانیدا دەبینرێتەوە.

بەو پێو دانگەوە وێنەگری ڕۆژنامە دەبێ لانی كەمی ئەم سیفەتانەی خوارەوەی تێدا بێ:

١ـ ئاگاداریەكی تەواوی لە هونەری ڕۆژنامەگەریدا هەبێو لە ڕادەی مەسئوولیەتی ویژدانیو قانونی خۆی باخەبەر بێو بزانێ چ دەكا؟

٢ـ سەری تەواوی لەتەكنیكی وێنەگرتن و بەشەكانی كامیراو فلیم دەربچێو لەكاتی پێویست دا بتوانێ چاكی بكاتەوە. هەروەها لە شۆردنەوەو چاپ كردنیش بزانێ.

٣ـ لەخۆرا پێدا نەدا وێنە بگرێ؛ هەمیشە هەوڵ بدا وێنەی ئەو شتانە بگرێ خزمەتی بابەتەكەی دەكەن[٥٨]؛ نەك وێنەی سەر تۆزی بن ئالۆز، لە ڕووكەش دا ساف و ڕوون وەكی دی هیچ نەكەیێنێ.

وێنەگری ڕۆژنامە دەبێ ئەوە بزانێ كە بەوێنەكانی دەچێتە مێژووەوە.

٤ـ لانی كەمی هەستی ڕۆژنامەنووسیانەی تیا بێ، ڕێزی پیشەكەی خۆی بزانێو بگرێ. چونكە «وێنەگری بێ شعور كە ڕووداوە تراجیكۆمیدیەكانی ژیان كاری تێ ناكەن بۆ ڕۆژنامە دەست نادا![٥٩]».

٥ـ هەمیشە هەوڵ بدا لایەنی ڕاستەقینەی بابەتەكە بخاتە ڕوو چونكە «وێنە هەر چۆنێك بێ حەقیقەت تەواو دەرنابڕێ بەڵكو دەربڕی بارێكی تایبەتیە[٦٠]».

٦ـ ئەوەی تێدا بێ پێش وێنەگرتن پلانێك بۆ خۆی لەبەر چاو بگرێ، بەتایبەتیش لەو كاتەیدا دەبەردابێ وێنەی كۆنگرەیەك یاخود كۆبوونەوەیەكی گشتی بگرێ، بەڕێككەوتن لەگەڵ ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لەگەڵیدا دەبن.

٧ـ بزۆز بێو كامیراكەی هەمیشە سوار بێ.

٨ـ لەگەڵ هاورێ ڕۆژنامەنووسەكانیدا بێتەوەو پێوەندی بە بەشەكانی ڕۆژنامەكەیەوە پتەو بێ، بەتایبەتیش بەشی وێنەگرتن لە چاپخانەداو هەروەها بەشی مۆنتاژ.

٩ـ لەوە ئاگادار بێ ئەو وێنەی دەیگرێ نەچێتە قاوخی پروپاگەندەی تایبەتیەوە بۆ كەسێك یا كۆمپانیایەك و... تاد.

- دواجار «كارامەیی وێنەگر تەنیا لە دەرك كردنی نیەو بەوەی بینراوان تۆمار دەكاو بەس، بەڵكو لە حەقیقەتی دەربڕینی هەڵویستێكە، ئاخر وێنەگریش وەكو نیگاركێش و شاعیر پرسیاری هەیە...![٦١]».

## ● لە نێوان لاساییكردنەوەو داهێنان دا (پێوەندی وێنە بە دەرهێنانی ڕۆژنامەنووسیەوە)

بەلای منەوە ناوەروكی ڕۆژنامەو گۆڤارو چاپكراوی دیكە هەمیشە لە ڕواڵەتی گرینگ ترو لەپێش ترە، بەڵام ئەمە وا ناگەیێنێ لە سەردەمی شۆڕشی تەكنەلۆژیای تیژڕۆو داهاتنی چەندین هۆی پێك گەیشتن و ڕاگەیاندنی دیكە كە تەنانەت گەڤ لە ڕۆژنامەگەری هەرە پێشكەوتوویش كردووە چ جای ڕۆژنامەگەریی كوردی كە لە زۆر ڕووەوە هەژارە، ئا لەم سەردەمەدا نەخشەسازیو دەرهێنانی هونەری ڕۆژنامەیش لەپاڵ ناوەرۆك دا بایەخی خۆی دەسەپێنێ، كە لەمەشدا كەرەستەكانی دەرهێنان لە وێنەوە تاكو تایپۆگرافیاو هۆیەكانی لێك جوداكردنەوەی تێكستەكان و دەرخستنیان لەسەر ڕووپەری ماكێتی ڕۆژنامە دەورێكی باڵا دەبینن.

ئەگەر بەخێرایش بێ چاوێك بەو ڕۆژنامەو گۆڤارە كوردیانەدا بگێرین دەبینین لەڕووی دەرهێنانەوە بەگوێرەی ڕۆژنامەگەری ناوچەكە لاواز بوون، ئەوەش بێگومان بەهۆی بارودۆخی ئەوسای كورد خۆی بووە...

زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەكانی بەرایێمان لەلایەنی دەرهێنانی ڕۆژنامەنووسیەوە زیاتر لە دەرهێنانی كتێبەوە نزیك بوون لەوەی لە هی ڕۆژنامە، ئەوەش بەهۆی هەژاریان لە بەكارهێنانی ئەو كەرەستانەی لە پێشدا باسمان كردن، لەگەڵ ئەوەی هەندێكیان سیستەمی ستوونیشیان بەكار هێناوە كە زۆر كەم لە كتێبان دا بەكار دێ لەوانەیش یەكەمین ڕۆژنامەی كوردی؛ (كوردستان ـ ١٨٩٨)و گۆڤاری وەكو (ڕوژ كرد ـ ١٩١٣) و (ڕۆژ كردستان ٩٢٢)

ئێمە لێرەدا زیاتر مەبەستمان لە پێوەندی وێنەیە

(فـۆتـۆگـراف و قەڵەمكێش) بە دەرهێنانی ڕۆژنامەوە هاوڕێ لەگەڵ ئەوەشدا بەكورتی لە خودی دەرهێنانیش دەدوێین.

وێنە وەكو ڕەگەزێكی پێویست بۆ ڕۆژنامە لەپاڵ مانشێت و ناونیشـان و تێكستی چاپكراوو كەرەستەكانی تایپۆگرافیاو بۆشایی نێوانیان لە دەق بترازێ دەوری لە هەمووان لەپێشترە، ئەگـەرچـی دەقـی نووسراویش زۆرجـار بەبـێ وێـنـە ئەو كاریگەرییەی نابێ وەك ئەوەی لەگەڵ وێنەدا دەیبێ.

ئەگـەر خوێنـەر یان بخـوێن ڕۆژنـامـە هەمـووی نەشخـوێنێتـەوە، چاو بە مانشێت و تایتلەكـانی‌دا دەگێڕێو وێنـەكانیشی دەبینێ... بۆیە هەڵبژاردنی لەبارو ڕێكخستن و هونەركاری لە بڵاوكردنەوەی وێنە خزمەتێكی بەرچاوی ڕۆژنامە دەكـەن و سەرنجیشی زیـاتـر بۆ ڕادەكێشن، دیسـان وێنەی ڕۆژنامەنووسیی دەورێكی چاكیش لە دروست بوون و پێكهاتنی هارمۆنیای لاپەڕەكانی ڕۆژنامەدا دەبێ.

دەرهێنانی هونەریی ڕۆژنامە بە شێوەی چاپەوە بەندە، لەچاپی لیتەرەوە تا بە ئێستارا دەگا كە ئۆفسێتە.

جاران سكـرتـێری نووسـین هەر خۆیشی دەرهێنـەر بوو، لەم ڕووەوەیش كرێكـارانی چاپخـانـە یارمـەتی‌یان دەدا. ئێستا ڕۆژنـامـەكـان هونـەركـاری تایبەتیان هەیەو لەو سەریشەوە هۆیەكانی چاپ كردن دەرهێنانی ڕۆژنامەیان ئاسانتر كردووە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕۆژنامەو گۆڤارەكانمان باوەكو لەم بارەیەوە جۆرە پێشكـەوتنێكیـان پێوە دیار بێ نەیان توانیوە خۆیان لە لاسایی كردنەوەی ڕۆژنامەو چاپەمەنی‌یە عەرەبی‌یەكان ڕزگار بكـەن، تەنانەت هەندێ لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە بایەخیش بەم مەسەلەیە نادەن!!

لەوانـەیـە وەستـایی‌و دەست ڕەنگینی نەخشـەسـاز سەرنجی خوێنـەر بۆ نووسینێكی بێ‌پێـزیش ڕابكێشێ، بەڵام گومانی تێدا نی‌یە دەقی بەپێزو بە بڕشت بە دەرهێنانی هونەری ڕەونەقدارتر دەبێ.

یەكێـك لەو خاڵانـەی كە پێم وایـە تایبەتمەندی‌یەك لە ڕووی دەرهێنانی هونەریی‌یەوە بۆ ڕۆژنامەگەریی كوردی پێك دێنێ چۆنیـەتی بڵاوكردنەوەی وێنەیە، بەتایبەتیش كە بواری ئەوەی تێدا هەیە شان بەشانی نووسین بڵاو بكرێتەوە.

دەرهێنـەر دەتـوانێ زۆر شێـوە بە وێنـە بدا لەگـەڵ ڕەچاوكردنی سیاسەتی ڕۆژنامە[١٢]، هەر بە نموونە:

★ **شێوەی ڕاست و چەپ (لاونیو)**: وێنە كە بە قەوارەی یەك ستوون بڵاو بكرێتەوە ئەم شێوەیەی بدرێتێ باشە، وەك. ئەو وێنانەی لەگەڵ كورتە هەواڵ دا بڵاو دەكرێنەوە (كە زیاتریش لە ئەرشیفـەوە دێن)، یان هەنـدێ لەو وێنـانـەی لە لاپـەڕەی هەمەڕەنگ یا دوا لاپەڕە بڵاو دەكرێنەوە ـ بڕوانە وێنە (١٥).

★ **شێوەی دەرخستن (إبراز)**: ئەم شێوە بڵاو كردنەوەیە بە زۆر بارو لە زۆربـەی لاپـەڕەكـانیش دا جێبـەجێ دەبێ بەتایبەتیش لە لاپەڕەی یەكەم و دوا لاپەڕە و لاپەڕەی ڕیپۆرتاژدا.

دەرخستنیش لەم چەند شێوەی خوارەوەدا خۆی دەنوێنێ[١٣]:

ـ بڵاوكردنەوەی بە پانایی ٣ تا ٤ ستوون هەندێ جار دەگاتە ٦ ستوونیش.

ـ بە دووبارەكردنەوەی؛ واتە دووبارە كردنەوەی هەمان وێنە (جا چ شێـوەی ئاسـایی وەربگرێ یا بەپێچەوانە وەبێ)، ئەمەش زیاتر لە چاوپێكەوتن و ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسیی‌دا دەبێ.

ـ بە كۆكردنەوەی نێگەتیف و پۆزەتیفی وێنەكە لە یەك وێنەدا

ـ بە لێك دابڕاندنی.

ـ بە هێنـانـەپێشـەوەی بەشێكی وێنـەكە، بە نموونە سیمای پیرەمـێردێكی مانـدوو زۆر شت دەگـەیێنێ ئەگـەر دەرهێنەر بەوەستایی دەری بخا.

ـ بە دانانی هەروایی (واتە بە پەرش و بڵاوی)، لەم كاتەدا دەبێ ستـوونەكانی دەوروبەری وێنەی لەو جۆرەو ناونیشانەكان و وێنەكانی تر بە ڕێك وپێكی دابنرێن.

ـ بە دانانی دوو قەوارەی جیاوازی هەمان وێنە لەتەك یەك دا.

ـ بە كێشانی هێڵێك بەدەوری وێنەكە.



ـ وێنە (١٥)
بڵاوكردنەوەی وێنە لەگەڵ هەواڵ دا بەشێوەی لاونیو بە پانی نیو ستوون.



- وێنە (١٦)
وێنەیەکی فۆتۆگرافی بەڕێگای کۆلاژ بۆ ڕوونکردنەوە یا جاردان.

- بەهۆی هونەری کۆلاژەوە ـ بڕوانە وێنە (١٦).
- بە بەکارهێنانی ڕەنگ.
- بە بەکارهێنانی کوللەیی (شبك).

★ **شێوەی ئاسایی:** دەرهێنەر بەشێوەی ئاسایی دەتوانێ کەسایەتیەکی لێوەشاوە بە لاپەڕەکان بداو بیانرازێنێتەوە بەتایبەتی ئەگەر لە پاڵ ئەوەشدا هەوڵ بدا هێمنی لاپەڕەکە بپارێزێ.

لە شێوەی ئاساییدا، دەرهێنەری ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی دەبێ ئەوەی لەبیر بێ کە چونکە بە تیپی عەرەبی چاپ دەکرێ، ئینجا بەپێی دەقی چاپکراو خوێنەر کە تەماشای ڕۆژنامە دەکا یەکسەر لەڕاستەوە بۆ چەپ پێ دادێ، بە پێچەوانەی ئەو ڕۆژنامانەی بە تیپی لاتینی چاپ دەکرێن کە لە چەپەوە بۆ ڕاستە.

ئینجا لە دانانی وێنەدا دەرهێنەر یا نەخشەساز پێویستە ئەوەی لەبەرچاو بێ.

نەخشەساز دەتوانێ سوود لە ڕێبازە هونەرییەکانیش وەربگرێ کە بێگومان کاریان کردووەتە سەر هونەری دەرهێنانی ڕۆژنامەنووسیش، هەروەها دەتوانێ سوود لە هونەری پۆستەرو (جاردان)یش وەربگرێ لە دانانی وێنەدا. بڕوانە وێنە (١٧)، پێویستە هاوئاهەنگییەك بۆ هەموو بابەتەکان پێك بهێنێ، لە هەمان کاتیش دا چەشەی گشتیی‌و پەیامی پیرۆزی ڕۆژنامەنووسی لەبەرچاو بێ، بەتایبەتیش کە ئێستاکە بەهۆی پێشکەوتنی ڕێگاکانی چاپ ئیشەکەی لەجاران ئاسانتر بووە. دەبێ ئاگاداری ئەوەش بێ کە:-

١- هەوڵ بدا هەمیشە دەقەکە لەگەڵ وێنەدا بگونجێنێ نەك بەپێچەوانەوە، چونکە نووسین دەتوانرێ پاشماوەی هەبێ ئاشکرایە کە لە وێنەدا ئەمە ناکرێ.

٢- ئەو وێنانەی بڕیاریان لەسەر دەدرێ بڵاو بکرێنەوە، هەوڵ بدا هەموویان بڵاو بکاتەوە، کە گەیشتە باری ناچاریش چەند وێنەیەك وەلا بنێ؛ پێویستە لەو وێنانەوە دەست پێ بکا کەمترین بایەخیان هەیە[١٤]، باشتریش وایە لەو حاڵەتانەدا بەهۆی بچووك کردنەوەی چەند وێنەیەك جێیان بکاتەوە لەوەی وەلایان بنێ.

٣- دەبێ ئەوە بزانێ کە هەرگیز وێنە لەگەڵ پاشماوەی دەق دا نابێ.

٤- لەهەڵبژاردنی وێنەدا (کە زۆر جار نەخشەساز خۆی وێنەی بۆ هەڵدەبژێرێ) هەوڵ بدا ئەو وێنانە دابنێ کە دەبن بەهۆی زیاتر ڕوون کردنەوەی دەق و پێدانی مەودایەك و خۆی لەو وێنانە بپارێزێ کە پێویست نین و خوێنەر هەمیشە لەبەرچاوینی؛ بۆ نموونە لە باسێکی زانستیدا کەناوی پیاز یا تەماتەی تیا هاتووە پێویست ناکا وێنەکەی دابنێ چونکە هەموو کەس ڕەنگ و شێوەی تەماتەو پیازی لەکاتی خوێندنەوەدا دێتەوە بەرچاو.

٥- کەمی بەسوود بە زۆری بێ فایدە نەدا، چونکە بەقەد ئەوەی هاوسەنگی لاپەڕەکانی ڕۆژنامە سەرنج ڕادەکێشێ، هەرگیز بڵاو کردنەوەی وێنەی زۆر سەرنجی خوێنەر ڕاناکێشێ.

٦- هەوڵ بدا وێنەکان نەکەونە ڕاستی ئەو شوێنەی ڕۆژنامەی لێ دەنوشترێتەوە.

- وێنە (١٧)
بەکارهێنانی وێنە لە جارلێداندا بۆ خواردنەوەو کەل وپەل.



لێرەدا دەبینین پێوەندی وێنە بە دەرهێنانی رۆژنامەنووسی‌یەوە پێوەندی گیان بەلەشە کە هەندێ جار جێگایشیان دەگۆڕنەوە ئەمیان دەبێ بەلەش و ئەوەکەی‌تر بەگیان!!

دەوری نەخشەسازیش کەم نی‌یە، تەنانەت مەسئولیەتی نەخشەسازیش لەلایەنی هونەری‌یەوە ئەگەر بەقەد مەسئولیەتی سکرتێری نووسین نەبێ کەمتر نی‌یە.

**● فەلسەفەی بڵاوکردنەوەی وێنە**

**«ئەگەر سی (٣٠) ساڵ**
**لەمەو پێش کامیرا داهێنرابووایە**
**لەوانە بوو ژیانم بە پیت تر دەبوو**
**دیلاکروا[٦٥]»**

بوونی وێنە لە رۆژنامەدا بەهایەکی ئیستاتیکی دەداتێ‌و چالاکی وەبەر لاپەرەکانی دەنێ... ناوەرۆکی دەقە بڵاوکراوەکان لەبال خوێنەر دەکا، رای دەگرێ، پرسیاری دەخاتە پێش..
حەقیقەتە راستی‌یەکانی بۆ یەکالا دەکاتەوەو پەیامی‌ی دەگەیێنێ‌و سەودایێکی دیکە بە تێکستەکانی داهێنان دەداو براقێکی ئاهەنگدارتری پێ دەبەخشێ.
زەمەن دا دەکا..
تۆمارێکی مێژوویی‌یەو دەچێتەوە نێو مێژووەوە... بەڵگەنامەیە.
زەمانێکی سەرتاپاگیرە، هەموو تێ‌ی دەگەن. پرۆسیسی راگەیاندن تیژرۆتر دەکاو کاری پێکگەیشتن و تێگەیشتن خێراتر.
«پێویستی‌یەکی سایکۆلۆژی بۆ ئادەمیزاد زامن دەکاو پێداویستی‌یە عەقڵی‌و ئاوەزی‌یەکانی بۆ جێ‌بەجێ دەکا.. (تا رادەی ئەوەی) دەروونناسەکان لەو باوەڕەدان کە ئێمە بەوێنەیەکی عەقڵئامێز بیر دەکەینەوە..[٦٦]»
وێنە لەبەرابەر لێشاوی بێ‌ئامانی سینەماو تەلەفزیۆنیشەوە وەستاوە، لێیان دەسەنگرێتەوەو تەواویشیان دەکا..
خۆڕایی نەبووە حەکیمێکی وەکو کۆنفۆشیۆس (٥٥١ _ ٤٧٩ پ.ز) بلێ:
**هەزار وشە ناتوانێ بەرەوانی وێنەیەک بێتەگۆ!**
بەڵام بڵاوکردنەوەی وێنە چەکێکی دووسەرەیە.. خەنجەرە! رای گشتی لەبال یەک دەردێنێ.. راستی‌یەکان دەخاتە روو لەهەمان کاتیش دا دەبێتە هۆی شێواندنیشیان... چەواشەکردن! گەلۆ! تۆ بڵێی رۆژنامەنووسەکانمان لەم حەقیقەتە گەیشتبن؟
من پێم وایە فەلسەفەی بڵاوکردنەوەی وێنە بەمانا خرگرەوەکەی لە چوارچێوەو سنووری ئەو خەونانە دایە..

# دووەم : کاریکاتێر[٧]

## ● کاریکاتێر چی‌یە ؟

**(پەنجەنمایێکی مێژوویی)**
وەهام دێتە بەرچاو کە هەر لە کۆنی کۆنەوە، ئەگەر لە شێوەی ئێستایشی‌دا نەبووبێ کاریکاتێر هەبووە، چونکە هەمیشە کاریکاتێر چ بەقەڵەم و چ بە وێنە چەکێکی تیژئامێزی بێ‌هێزو ستەم لەسەر بووە بەرامبەر هێزی ستەمکار!...
لە گەلێك رووی ژیانی ئەو کۆنی کۆنەی مرۆڤیش کەش و هەوای ئەو تیژ پێ کردنە هەست پێ دەکەین چ وەك نووسین یا لە کارە هونەری‌یەکان، بەتایبەتیش لە هونەری سەنگتراشی (نحت)دا، ئەوەی تا ئێستاش بەدەست کەوتبێ وەك تێکستی کاریکاتێری زیاتر بەسەر زمانی گیاندارانەوە بووە، بەڵام بەدەریش نەبووە لە باسکردنی مرۆڤ. وەرە با پێکەوە ئەم یەك دوو تێکستە بخوێنینەوە کە هی وەختی سۆمەری‌یەکانە نزیکەی سێ هەزار ساڵ پێش زایین بەڵکو زیاتریش:

**«جارێکیان فیلێك بەرێکاوە بوو مێشوولەیەك چووە سەر پشتی‌و پەی‌ی وت: ئەرێ برا خۆ گرانم نەکردووی؟ ئەگەر گرانم کردووی**

- وێنە (١٨)



هونەری کۆنی هندییە سوورەکان.

خومبابا

زۆر نامێنمەوە لە سەرچاوەکە دادەبەزم..

فیل وەڵامی دایەوە، تۆ کێیت؟ چما ئەمن هەستم کردووە کە لەسەر پشتمی تا کە دابەزی هەستت پێ بکەم؟!![٦٧]»

یان:

«لە نامـەی مەیموونێك دا کە بۆ دایکی ناردووەو باسی ئەو ئەشکەنجەیە دەکا کە لە هەردوو شاری (ئور) و (ئەریدۆ) دووچاری بوون هاتووە:

بۆ (لودی ـ لودی) دایکم، پێی بڵێ (ئوکو ـ دل بی) دەڵێ: ئور شاری شادیو خۆشیان و (ئەریدۆ)ی شاری ئاسودەیی... لەگەڵ ئەوەشدا من لە پشت دەرگـای هۆڵی مۆسیقـادا پاشمـاوان دەخـۆم و هەر خواخـوامـە لە برسـان نەمـرم، نە نان و نە بیرەم تام نەکـردووە، بەزوویی کەسێکم بۆ بنێرە.[٦٨]».

یان:

«ریوی یەك جارێ میزی بە دەریادا دەکرد، پاشان بە فیزێکەوە تەماشای دەکرد بەسەر سورمانەوە دەیگوت، عەجەب ئەو هەموو دەریایە لە میزی منە؟[٦٩]»

هەر چەندە ئەم نموونانە مشتی خەروارن، بەلام خەونە مۆرکراوەکان دەبینرێن و شێوەی کاریکاتێر ئامێز دەردەکەوێ.

ئەم مێخ نووسە کاریکاتێریانە لە تێکستە سۆمەریەکانت زێتر بووە لە کاری هونەری‌شدا هەر بەو شێوەیە بووە، هێزی شەرو ستـەمکـار، باوەکـو وێنەشیان کێشرا بێ یا تراشرابێ، بەدرێژایی مێژوو هونەرمەندی دێرین بەپێی هوشیاری هەل و مەرجی ئەوسـا وێنـەی کێشـاوە یا لە بەردی تراشیـوە، هەر بەنمـوونـە وێنەی شەیتان یاخود وێنەی خومباباو... هیتر ـ بروانە وێنە (١٨)

لە میسری کۆنیشدا هەر بەو چەشنە بووە، کاریکاتێر لە میسردا ئەو کاتە زیاتر بەدیار کەوت کە فیرعەونەکان دەستیان دایـە داگـیرکـردنی ولاتـانیتـرو گەلێکیـان لێ بە دیل گرتن؛ هونـەرمـەنـدی میسری تەمـاشـای کرد ئەو دیـلانـە نە لە فیرعـەونەکانن و نە لە کاهینەکان و نە نەجیم زادەشن، بەڵکو تەنها پیاون!!، بە تەنیا دیلن، بۆیە نەیدەتوانی بەبێ ترس و بە سەربەستی تێیانەوە رامێنێ!! لێرەدا بواری ئەوەی بۆ رەخسا بە کاریکـاتێر بیانبینێ ئیتر هات (بۆ نموونە) ئەو دیلانەی لە شێـوەی دەسکـە پیـازێـك کۆدەکـردەوەو کەزیـان بەدەستی فیرعەونەوە بوو، دەستەکەی تریشی بە شوارکێکەوەیەو بەریان بووەتی[٧٠]!!

لە ولاتی گریکیش دا ئەرستـۆ باسی کابرایەك دەکا ناو (بـۆسـۆن) کە بەوێنـە تیـزی بەخـەڵکی کردووەو بەوهۆیەوە ئازارێکی زۆریان داوە تا مردووە.

هونەرمەندانی مەزن (داڤنیشی) و (گۆیا) و (دۆمێ)ش ئەو جۆرە وێنانەیان کردووە.

بەلام ئەمـرۆ کاریکـاتێر مەودایێکی دیکەی وەرگرتووەو پەیامێکی سیاسیو کۆمەلایەتی پێیەو بەتەنها ئەوە نییە هەر هێلکاری‌یەکی شێوێنراو بێ وەك هەندێ دەستیان داوەتێ‌وای تێ دەگەن!!

بەلام با بێین بزانین وشەی کاریکاتێر چییەو چی دەگەیێنێ؟

لە بنەرەتدا کاریکاتێر وشەیەکی ئیتالی‌یە؛ (کاریکاتۆرا ـ Caricatura)

بەواتا ئەو وێنانەی زیادەرۆیی لە کێشانیدا کراوە[٧١]. لە فەرهەنگی (الفرید)ی (ئیتالی ـ عەرەبی)یشدا بە (رەسمێکی گاڵتەئامێز) هاتووە[٧٢].

هەرچی چۆنێکـە، من پێم وایـە وێنەی کاریکاتێری لەو مانایە گەورەترە کە لە قامووس و فەرهەنگان دا پێی دەناسرێ، مادەم لە بنەڕەتدا بابەتی جیددیی و ئادەمیانە دەردەبڕێ و مادەم گیانی ڕەخنەی بنیاتنەری لەبەرە.

کاریکاتێر ئەگەر هێلکارییەکی گاڵتەئامێزیش بێ و هونەرمەند زیـادەڕۆیش لە کێشـانیدا بکـا؛ ڕەنگـدانـەوەی واقیـع و شلەقـانـدنی وەستـاویی و جۆشدانی بزاڤی پێوەند بەژیانە.. هاوارێکە بەڕووی کپی و خامۆشی و تێوەرامانێکی تیژئامێزیشە بەڕووی هاوارە قیژاوییەکان!

هەر لەبەر ئەوەیشە کە لە هەموو هونەران زیاتر مەیانەی لەگەڵ کاری سیـاسیدا هەیـە، بەوەی بیرو بۆچـوون و هەڵوێست لەوێنەدا دەتوێنێتەوە بەو ڕادەیەی زۆر جار نەخوێندەواریش تێی دەگا.

کاریکاتێر بابەتەکانی بە جۆرێك فراوان بووە کە زۆر لە ئادگارو خاسیەتی قوتابخانە تەشکیلییەکانی تێدا دەبینرێتەوە.

پەراوێز :-

(٤١) بەڵام چ چاپێك هەر خوا بە خۆی بزانێ چەند بێ‌قەیزو شەپرێون.

(٤٢) ئێمە کە دەڵێین ڕۆژنامەگەری سوودی لە داهێنانەکانی تەکنەلۆژیاوە بینیوە، نابێ ئەوەیش فەرامۆش بکەین کە (ئەم سوودە) نە هەموو ڕۆژنامەگەرییەکی گرتووەتەوە، نە ئەوانەی توانیویانە سوود وەربگرن مەرجە بیان توانیبێ بیگەیێنن!! ئەمەش سەبارەت بە زۆر ئەگەران بووە، سەرەڕای بارو بۆچوون و جۆری ڕژیمی ئەو وڵاتە.

(٤٣) محمد رشاد ـ التصوير الضوئي ـ گۆڤاری المصور العربي ـ ژمارە (٥) ل ١٥

(٤٤) ڕۆژنامەگەری کوردی لە عیراق دا تاکە سەرچاوەی بۆ وێنە، ئاژانسی دەنگ و باسی عیراقی و ڕۆژنـامـەو گۆڤـارو چاپەمەنی دیکەی بێگانەیەو هیچ ڕۆژنامەیەکمان تا حاڵی حازریش نییە کە پێوەندی ڕاستەوخۆی بە ئاژانسێکەوە هەبێ جگە لە (ئا. د. ع).

(٤٥) بڕوانە: د. ابراهيم امام ـ دراسات في الفن الصحفي ـ ل ٢٩١

(٤٦) بڕوانە: محمد محمود شلبي و د. ابراهيم امام ـ فن التصوير الضوئي ـ ل ٢٥١.

(٤٧) عبدالجبار محمود علي ـ التصوير الصحفي ـ ل ٣٦.

(٤٨) هەر ئەو سەرچاوەیە.

(٤٩) جاری وایە هێڵکـاریش بەتـەنێ وێنـەی دەگـیرێ، ئەمەش ئەو کاتە دەبێ کە قەڵەمکێشەکە گەورەکردن و بچووك کردنەوەی بوێت.

(٥٠) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: سمير صبحي كامل ـ صحافة تحت الطبع ـ دار المعارف ـ قاهیرە ١٩٧٤ ل ١٧٤.

(٥١) د. سنـان سعيـد ـ الاخراج الصحفي ـ چەند محازەرەیەك بۆ قوتابیانی بەشی ڕاگەیاندنی سەر بە کۆلێژی ئەدەبیاتی دانشگای بەغدا.

(٥٢) لوی دی جانيتي ـ فهم السينما ـ وەرگێڕانی: جعفر علي ـ دار الرشيد ـ بەغدا ١٩٨١ ل ٧٥.

(٥٣) هەر ئەو سەرچاوەیە ل ١٥.

(٥٤) هەندێ جار ئەمە بەهۆی هەڵەی چاپ ڕوودەدا، بەوەی دەبینی وێنەکان جێیان دەگۆڕێ، ئەم هەڵەیەش زیاتر لەبەشی (ڕاپەڕاندن) و (مۆنتاژ)دا دەکرێ.

(٥٥) هەر بە نمـوونـە بڕوانـە زۆربەی ژمارەکانی ڕۆژنامەی (هاوکاری) و (پاشکۆی عیراق)و گۆڤاری (ڕەنگین).

(٥٦) ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ گۆڤاری (کاروان) تا ئێستا نەیکردووە بەعادەت ئەگەر نووسینەکە خۆی وێنەو قەڵەمکێشی لەگەڵ دا نەبێ، وێنەی ئەگەر لە ئەرشیفیش بێ بۆ پەیدا بکا، هەر چەندە جاروبار مۆنتیفی بۆ هەندێ دەقی ئەدەبی کردووە. بەڵام (کاروان) سیفـەتێکی باشی هەیـە بەوەی ئەو وێنـانەی لەگەڵ نووسینەکان دێن هەموویان بڵاو دەکاتەوە، وەکی دی (تەندروستی و کۆمەڵ) بە پێچەوانەوەیە ئەگەرچی پشتی تەواویان بە ئەرشیف بەستووە.

(٥٧) محمـد عثمـان زادە ـ ساڵی ١٩٤٦ لە هەولێر لەدایك بووە، دەرچووی کۆلیجی ئەدەبیـاتی دانشگـای بەغـدایـە/ بەشی کوردی، لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٠)وە وەك نەخشەسازو خۆشنووس لەڕۆژنامەگەریی کوردیدا کار دەکات.

ئێستا بەڕێوەبەری هونەری هەردوو گۆڤاری (کاروان) و (تەندروستی و کۆمەڵ)ە.

(٥٨) هەنـدێ جار وێنـەگر هەر خۆی هەواڵێك بە زنجیرە وێنەیەکی یەك بەدوای یەك دەگەیێنێ بێ ئەوەی نووسینی لەگەڵ دا بێ.

(٥٩) د. ابراهيم امام ـ دراسات في الفن الصحفي ـ ل ٣٠٥.

(٦٠) د. محمو ادهم ـ الصورة الصحفية، دراسة في المصادر والمؤثرات ـ چاپخانەکانی ادار البيضاء ـ قاهیرە ١٩٨٨ ل ١٣٣.

(٦١) عادل كامـل ـ افكـار حول الفوتوغراف ـ گۆڤاری (المصور العربي) ژمارە (٤) ئەیلولی ١٩٨٥ ل ١٤.

(٦٢) سیاسەتی ڕۆژنامە، لە زۆر شوێنی ئەم نووسینەمان دا هاتووە؛ لێرەدا پێویستە بڵێـین کە ئێمـە مەبـەستمان لە سیاسەتی ڕۆژنامە کۆمەڵێك بنەماو ڕێڕەوەو سازاندنە ڕۆژنامە لە وەڵامی ئەوەی چی بڵاو بکاتەوەو چۆنی بڵاو بکاتەوە پێوەی بەند دەبێ.

(٦٣) لەهەر حاڵەتێکیش دا بێ دەرهێنەر نابێ ئەوەی لەبیر بچێ کە دەرخستنی وێنە پێویستە لەگەڵ ناوەڕۆکی دەقەکەدا بێتەوە ئەگینا کارەکەی بە پێچەوانەوە دەکەوێتەوە.

(٦٤) ئەوەی جێی داخە هەندێ لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانمان نەك هەر وێنە کەم بایەخەکە وەلادەنێن، بەڵکو ئەو وێنانەیش بڵاو ناکەنەوە کە نووسەر خۆی دەینێرێ، بەتایبەتیش ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ئەوە بێجگە لەوەی هەمیشە وێنە لەگەڵ دەق دەگونجێنن، جا بە بچووك کردنەوەی لەڕادە بەدەر بێ یا بە بڕین!!

(٦٥) بڕوانە: نوری الراوي ـ نبؤات لمستقبل آلة التصوير ـ گۆڤاری (المصور العربي) ژمارە (٥) تەموزی ١٩٨٦ ل ٢٧.

(٦٦) محمود علم الدين ـ الصور الفوتوغرافية في مجالات الاعلام ـ ل ٣٤.

(٦٧) طه باقر ـ مقدمة في أدب العراق القديم ـ بەغدا ١٩٧٦ ل ١٨٢

(٦٨) هەر ئەو سەرچاوەیە.

(٦٩) هەر ئەو سەرچاوەیە.

(٧٠) سمير صبحي كامل ـ صحافة تحت الطبع ـ قاهیرە ١٩٧٤ ل ١١٧.

(٧١) هەر ئەو سەرچاوەیە.

(٧٢) بڕوانە: رياض جيد ـ القاموس الفريد ـ (ايطالي ـ عربي) ـ دار الجيل ـ بێرووت ١٩٧٥ ل ١٠١

# تەنبوور...
# عوودی دەسك دریژ لە عیراقدا

ئازاد عبدالواحد

کردوویە بە کوردیو
پێشەکیو پەراویزی بۆ نووسیوە

## بەشی دووەم و کۆتایی

### بەکار هێنانی ژێیەکان

هەندێك لەو ئامێرانەی ژێیەکانی لە ٢ + ١ ژێ پێکهاتووەو ژمارەی کلیلەکـانی ئەوەمـان بۆ دەردەخـات، هەروەها ئەو زمانەیەش کە لەسەر (جسر)ەکـە دایـە. زمـانـەکـەی خوارەوەش کە لەسـەر ژێیـەکـانـەوە دەبـەسـتـرێن[*] ئـەوەش لە بنچینەدا بۆ ئەوە دروست کراوە تاکو ٢+٢ ژێبێ. یان دەتـوانـرێ بەوشێـوەیە سوودی لێ وەردەگیرێ. هەندێ لە ئامێرژەنەکان بوونیﻳەك ژێ بۆ جەواب بەوە لێك دەدەنەوە کە ئەمە هەر لەبنـەرەتـەوە دوانی بووە لە بەر ئەوەی ئەو ژێیـە بۆ لەرینـەوە (رنـة) بەکاردێت، بۆیە بەئاسانی دەپچرێت. هەرچی ژێی جەوابە یان ژێی ژەنین، ئەوە هەمیشە ژێی دوانەیی دەبن ، ئەمەش رەنجی ئامێرژەن بە فیرۆنادات و بەردەوامی زیـاتـر دەداتـە دەنگـەکـەو دەنگە بنچینەییەکە بەجوانی دەردەخات. لە ئامێری تەقلیدیدا بەهۆی ژێی دوانەیی جەوابەوە، ئامێرەکە دەژەنرێ. ژێی قەراریی تاکیش بەکارنایێت، تەنیا لەوبارە دیاریکراوانەدا دەبێ.

١ ـ لە حاڵەتی ژەنینی پارچەیێکی کلاسیکی وەکو مەقام کە مەودای دەنگی پارچە مۆسیقاکە پێویستی بەوە هەیە لەژێی قەراردا بە دوای دەنگی تردا بگـەرێ، لەو حالەتـەشـدا بەکار هێنانەکە تەنیا بەشی سەرەوەی ژێی ناوبـراو دەگـرێتـەوە، هەرچی ژێی قەرارە ئەوە بەخاوی دەناسرێ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی قورسی ژەنین لە بەشی خوارەوەیدا[*].

٢ ـ کاتێ ئامێرەکە بۆ هاوبەشی کردنی گۆرانی و بەستەو هەندێ شیعری ستایش بەکاردێ ـ ئەمەش بەشێوەییێکی گشتی ئەو میانەیە تێپەرناکات کە توانای یەك ژێ دەیرەخسێنێ ـ ژێی قەرار لەسەر رەها ء مطلق ـ بەکار دەهێنرێ[*]، ئەمەش بۆ مەبەستی لەرینەوە کە هەندێ مۆسیقا شوناس پێی دەڵێن (لەرینەوە، رنە) کە ئامێرژەن بەیەك جوڵانەوە کە لەهەردوو ژێی قەرارو جەواب دەدات و بەهۆی دەستەراستی سەر پەردەکان دەجووڵێنرێتەوە.

٣ ـ ئەو ژێیە بۆ مەبەستی جوانی و زەخرەفە بەکاردێ.

٢ـ٣ رێگای ژەنین.

دوو رێگا بۆ تەنبوور ژەنین هەیە:

١ ـ دەستی رووت، یا بەکـارهێنـانی پەنجـە، ئەمەش ئەو رێگایەیە کە یەزیدییەکانی ناوچەی شاخی شەنگار پەیرەوی دەکەن.

٢ ـ بەکارهێنانی ریشە، ریشەش دەکرێ پەرەمووچی باڵندەبێ، یا پارچە گوێزانێ، پارچە پلاستیکێ، یا شانەیەك بێ. هەروەها ئامێرژەن دەتوانێ هەرجارەی یەکێ لەو دووریگایە بەکار بهێنێ.

ئەوەی سەرنج رادەکێشێ نزیك بوونەوەی دەست یان ریشە لە ئامێرەکە کار دەکـاتـە سەر زیاد کردنی ناسکی دەنگەکە بە هەمان شێوەش درێژی ریشەکە کار دەکاتە سەر ئەنجامی دەنگەکە.

گرتنی ئامێرکە.

هەر وەك چۆن جیـاوازی گەو رە لە هەمـوو ئەو بەشـانەدا دەبینین کە پەیوەندی بە ئامێرەکەوە هەیە، هەر بەم جۆرەش جیاوازی بەدی دەکەین لە جۆری گرتنی ئامێـرەکـە لە لایـەن ئامـێر ژەنەکەوە لەکاتی ژەنیندا. دەتوانرێ بە پێوە ئامێرەکە بژەنرێ، یان بە پێوە بێو یەکێ لە قاچەکانی بخاتە سەر شوێنێکی بەرز، یان بە دانیشتنەوە، جۆری دانیشتنەکەش زۆرە، دەتوانرێ لەسەر عارد یا لە سەر قەنەفە یا کورسی یا هەر شوێنێکی بەرزی دی دابنیشێ چۆنیەتی گرتنی ئامێرەکەش بەپێی جۆری دانیشتنی ئامێر ژەنەکان دەگۆرێ. هەروەك چۆن لەکاتی ژەنیندا پشت بە هەڵچوون و خرۆشانی ئامێر ژەنەکە دەبەستێ.

بە شێـوەیێکی گشتی سەری تەنبـوورەکـە دەخرێنە سەر رانی چەپ، بەلاری دەسکەکە بەرز دەکرێتەوە تاکو لەسەر دەستی چەپ دابنرێ واتە

دەکرێ تەنبوورەکە بەڕێگایێکی شێوە شاقووڵی بژەنرێت، کە دەسکەکە لە ئاستی سنـووقـەکەدا بێت. ڕادەی چەمانەوە بۆ گرتنی ئامێرەکە بەپێی درێژیی دەسکەکە وە دەبێ. چەمینەوەی ئامێر ژەنیش بەسەر ئامێرەکەیدا لە یەکێکـەوە بۆ یەکێکی دی دەگـۆڕێ، ئامێر ژەن لە کاتی هەڵچوون و خرۆشانیدا قۆڵی خۆی زۆر لە ئامێرەکەوە نزیك دەخاتەوەو دەچێتە باری لە باوەش گرتنی ئامێرەکە.

ڕۆڵی کۆمەلایەتی تەنبوو.

تەنبوور لەو ئامێرانەیە کە بۆ زۆر مەبەستی جۆراو جۆر بەکار دێت لەبەر ئەوەی!

١ ـ ئامێرێکی پیرۆزە لەناو هەندێ ڕێو ڕەسمی ئایینی ڕێبازە (باطنیيەکان)[*].

٢ ـ ئامێرێکی دنیاییيەو دەچێتە ناو بواری ئاهەنگی ئایینیيەوە.

٣ ـ ئامێرێکی دنیاییيەو نا هێلرێ بچێتە ناو بواری ئاهەنگی ئاینیيەوە.

١ ـ دەروێشـەکـانی سەر بەر ڕێبازە باطنیەکان تەنبوور وەك ئامێرێکی ئایینی لەو ناوچانەی دەکشێن بەرەو توورکیاو ناوچەی ڕۆژئاوای ئێران و باکووری عیراق بەکار دەهێنرێ.

لە تورکیادا تاکو ئێستاش کوردەکانی دێرسم[*]، بەکاری دەهێنن شان بەشانی ئەو شیعرانەی لەپایەی ئیمامی عەلی کوری ئەبی تالیب (خوالێی ڕازی بێ) دە دوێ. هەروەها کارەساتی بنەماڵەی پێغەمبەر دەگێڕێتەوە (مـوکـری: ١٩٦٨) دەربـارەی بەکـار هێنـانی لە ڕێو ڕەسمی ئایینی کوردەکـانی ڕۆژئـاوای ئێران قسـە دەکات. تا ماوەیەکیش پێش ئێستا دەروێشـەکـانی (بەکتاش) لەشاری تەلەعفەردا داب و نەریتی ئایینی خۆیـان ساز دەداو ئەو شیعـرانەیان بە ئامێری تەنبوورەوە دەووت کە ستایشی دوانزە ئیمامەکە بوون.

جا نازانین ئەو نەریتە ئایینییانە تاکو ئێستا لە ناوچەی تەلەعفەرو شاخی شەنگار ماوە یانە...؟ بەلام ئێمە لە ساڵی ١٩٧١دا لەو گوندانەی سەر بە پارێـزگای نینەوان لە ڕۆژهەلاتی شاری موصل دا توانیمان چاومان بە هەنـدێ کەس بکـەوێ کەسـەر بە عەشایەری (شەبەك) و (صارلی) و (کاکەیی) بوون، هەروەها چاومان بەو دەروێشانە کەوت کە ئامێری تەنبور دەژەنن بۆ بەشدار بوون لە ستایشە ئایینییەکان. (ئەرشیف: م.ك).

لەوانەشە هەر ئەو بۆ چوونە ئایینیيە وای لە هەندێ دەروێش کر بێ ناوی (خوا لەسەر ئامێرەکانیان بنوسن (تەلەعفەری، ١٩٧٤: ١٥٣).

لە ڕووی ئایینی یەو دوو ڕێگـا هەیە بۆ بەکار هێنانی تەنبوور. دەکرێ ئامێرەکە بەشێوەیەکی ئاشکراو لە بەردەم خەڵکێکی زۆر بەکار بهێزێ، یان لەناو ئاهەنگێکی ئایینی داخراودا بەکار بهێزێ و تەنیا پیاوە ئایینییەکانی تێـدا بەشـدار بن. وەکـو ئاهـەنگەکانی سەری ساڵ و ((تعاذر) لەلای شەبەکەکان. (ئەحمەد حامید ئەلسەراف: ١٩٥٤).

تەنبـور لە هەنـدێ ئاهـەنگی ئاینیدا بەکار دێت وەکو ئەوەی یەزیـد یـەکان دەیکەن کە جەژنەکانی (تەوافەیە) و تیایدا لە ڕۆژانی دیـاریکراودا لە دۆڵی لالشی پیرۆز یەك دەگرنەوە. لەم ئاهەنگە پیرۆزانەش دا بە هیچ جۆرێ نابێ دەهۆڵ و زورنای تێ بکەوێ. ئەمە لە کاتێکدا پیاوانی ئاینی ڕێگەی بردنە ژوورەوەی هەندێ ئامێری ئایینی دەدەن، لەوانەش تەنبور دەچێتە دۆڵی پیرۆزەوە، لەو حاڵەتـەش دا تەنـبـور بە ئامـێرێـکـی پیرۆز نازمێردرێ، ناشتوانرێ بۆ نموونە ببرێتە سەر مەرقەدی (عدی) بەڵکـو ڕێگەی دراوەتێ لە دەرەوەی مەرقەدەکەدا و لە هەموو لایێکی دۆڵە پیرۆزەکەوە بەکار بهێزێ کە ئامێر ژەنی تێدا بلاو دەبنەوە.

٣ ـ بەلام هەرچی بەکار هێنانی یەتی بۆ لایەنە دنیاییيەکە ئەوە تەنبور دەبێتە ئەو ئامێرە بنچینەییيە کە کۆمەڵێ هاورێیان لە ئێـواران دا، لە ناو مالان بێ، یا لە هەنـدێ چایخـانەدا، لە دانیشتنی خۆشـەویستیو شادمانی لە دەورەیدا کۆدەبنەوە، ئەو جۆرە دانیشتنانە لە شارو لادێکانی باکوور زۆر بلاون. کەلەپـاش ئیش و کاری سەختی ڕۆژ بۆ حەسـانـەوەو خەم ڕەوانـدنەوەو بینینی برادەران ساز دەکرێ، بابەتی سەرەکی ئەم جۆرە یەکتر بینینانەش (عیشقە) لەوانەیە ئەو دانیشتنانە لە هەنـدێ بۆنـەی دیکـەدا بسـازێ کە پەیـوەندیی بەژیانی کەسێکەوە هەیە. وەکو ژن هێنان و خەتەنە کردن. کە تەنبوری تێدا دەژەنرێ. سا ئەگەر ئاهەنگەکە کە سانێکی کەمی خزم و خوێشیيێـك هاتبێ یان بریتی بێ لە کۆمـەڵێ ئاهەنگێر کە لەو کاتەدا دەوری ئامێرژەنەکە دەدەن. تەنبور دەتوانێ لە شایی و بۆنـە خۆشـە کۆمـەلایەتییەکانی تریشدا بەشدار ببێ. وەکو دەگێڕنەوە دەتوانرێ شایی تەواو لەسەر ئاوازەکەی گەرم بکرێ، چونکە بەسەر جولانەوەی شایی کەرەکاندا زاڵ دەبێت، ئەمەش بە هۆی ئەو ئاوازە سوکـە لانەوە کە ناونراوە بە (هیلال) یان (صولۆ) وە دەبێ. واتە ڕێو شوێنی شایی. (عەلی ئەلتەعفەری: ١٩٧٤: ١٥٣) ئەم ئەرکەی دواییيان واتە بەکار هێنانی تەنبور بۆ بەشدار بوون لە شاییدا بەتەبیعەتی حاڵ ئەرکێکی سەرەکی نییە بۆ ئامێرەکە. بەپێی ئەو دەنگەی هەیەتی ناتوانین بڵێین ئەمـەیـان زۆر بلاوە، بۆی هەیـە زیـاتـر تەنبور بەو شێوەیە

بەکاربێت ئەگەر دەهۆڵ و زوورنا ژمن لەوێ نەبن. یان لەو کاتەدا کە ناوبانگی یەکێ لە تەنبور ژمنەکان یا گۆرانی بێژەکان بڵاو دەبێتە. بەشێوەیەکی شەخسی داوایان لێ دەکریت ئاهەنگێ ساز بکەن تەنبوریش بە تەنیا بۆ بۆنە خۆشەکان بەکار نایێ، ئینجا ئەو بۆنانە پەیوەندی بە تاکە کەسێکەوە هەبێ، یان بەکۆمەڵەوە، بەڵکو ئامێرێکی سەرەکی‌یە بۆ تەعبیر کردن لە ویژدانی مۆسیقایی ناوچەکە. ئینجا ئەو تەعبیر کردنە خۆشی بێت یان ناخۆشی لە کاتی گەرانمان دا بۆ ناوچەی شاخی شەنگار لەهەر دوو شاری تەلەعفەرو شەنگار دا، سەرنجی ئەوەمان دا ئەو ئامێرە بەشدار دەبێ لەگەڵ ئەو دەقە تراژیدیانەی کە لەوانەیە. فرمێسک دابارینیشی بە دواوەبێت لە هەندێ بارودۆخ دا دەگاتە ئەوەی لە لاوانەوەی مردوودا بەکار بێت دانیشتوانی شاری تەلەعفەر ئەوەیان بۆ گێرایینەوە کە چۆن یەکێ لە ئامێر ژمنەکانی شارەکەیان، زۆر بە سۆزو بەکوڵ، بە تەنبور بۆ کۆچی خوشکەکەی لاواندوویەتی‌وە. هەر چەندە ئەم پەیرەوە زۆر بڵاو نەبووەتەوە، بەڵام پەیرەو کردنی ئەوە دەسەلمێنێ کە کۆمەڵ وەك ئامێرکی ئاسایی تەماشای ناکات وەك چۆن تەماشای دنبك و دەف دەکرێ کەوا تەنیا لەبۆنەی خۆشی‌دا لەلای کۆمەڵ بەکاربێت و بەس، بەرانبەر بەو رێگا پێدان و چاولێ پۆشینە تەواوە لەبەکار هێنانی ئەو ئامێرەدا، هەندێ بارو دۆخی دی هەیە قەدەغەی دەکات، کە ئەو قەدەغە کردنەش تەنیا ئامێری تەنبور ناگرێتەوە، بەڵکو هەموو ئامێرەکانی دیکەش دەگرێتەوە هورمز یوحنا لەگەشتە مەیدانی‌یەکەی‌دا کە چوە دێی (مانگێش، ی سەر بەپارێزگای دهۆك لە ١٥/٤/١٩٧٢ دا لەکاتی رووداوی مردن و کارەساتی جەرگ بردا قەدەغەکردنی بەکار هێنانی ئەو ئامێرەی بینی. خۆ ئەگەر لەو کاتەدا دێیەکە ناچار بوو ئامێرەکە بەکاربهێنن. بەهۆی بوونی بۆ نەیەنێك لەلای یەکێکیاندا. ئەوە پێویست دەکات، بۆ ئەو مەبەستە رەزامەندیی سەرۆکی هۆزەکە وەربگرن. لە گەشتێکی مەیدانیی دیکەدا کە هەمان کۆکەرەوە. کۆلێکتەر. لە ٢١/٤/١٩٧٢ بۆ ناوچەی (تلکێف) کردوویەتی، بۆی دەرکەوتووە کەوا بەکار هێنانی تەنبور نزیکی شوێنە پیرۆزەکان قەدەغەیە.

### ٢ـ٣ شوێنی بەکار هێنانی ئامێری تەنبور

ئامێری تەنبوور لە شوێنە داخراوەکان دا؛ لەماڵ و چایخانەو ماڵی شێخی تەریقەتەکان بەکار دێت. تەنبور بەهۆی سروشتی دەنگەکەیەوە، دەگونجێ لە شوێنی داخراو دا بە کار بێت، بەڵام لەپاڵ ئەوەشەوە دەتوانرێ لە دەشت و دەریش دا بەکار بێت. لەو حاڵەتەش دا ئامێرەکە بەکۆمەڵ بەکار دێت وەکو لە کەرکوك دا دەبینرێ، کە ئامێرەکان روویێکی داخراویان هەیە لەوانەشە کونەکەی بکرێتەوەو بەیەکجاری تۆرە ئەستێرەیی‌یەکەی لەسەر لاببرێ، ئەوەشمان لەجەژنە یەکۆمەڵی‌یەکاندا بینی، وەکو ئاهەنگەکانی دۆڵی (لالتس) نزیك مەرقەدی شێخ (عدی کوری مسافر).

### ٣ـ٣ شوێنی بەکار هێنانی ئامێرەکە.

ئامێری تەنبور وەکو باوە بەتنیا شان بەشانی گۆرانی بێژ بەکار دەهێنرێ واتە بەکار هێنانە تەقلیدی‌یەکەی پەیوەندیێکی پتەوی بە دەنگی ئادەمزادەوە هەیە. هەر ئەو پەیوەندی‌یەش کارێکی وای کردووە. ئامێرژمنەکە ببێتە گۆرانی بێژو بە ئامێرەکەی خۆی گۆرانی بڵێ. ئامێری تەنبوور بەجیا بۆ بەشدار بوون لە هەندێ سەمای تاکە کەسی. لەناو ماڵاندا، یا لەشایی بەکۆمەڵ لێد رێ، لە هەندێ بۆنەی دیاریکراودا دەتوانرێ هەندێ ئامێری ئیقاعی وەکو دەف و دنبك شان بەشانی تەنبوور بەشداربن، لەو دەساڵەی دواییش دا ئامێرەکە سەر لەنوێ لەنێو لاوەکان دا کەوتەوە ئەمجارەیان ئەرك و دەوری نوێی پێ بەخشراوە، وەکو چونە ناو هەندێ تیپ کە تازە دروست کراون و لە شاری کەرکوك و هەولێردا بڵاو بونەتەوە، کە دەتوانرێ ئەم تیپانەش بەوجۆرە دابەش بکەین:

١ ـ تیپە فۆلکلۆریەکان کە تیایان دا کۆمەڵێ ئامێری ساز، تەنبوری تێدا بەکاردێت، شان بەشان هەندێ ئامێری ئیقاعی ناوچەیی وەکو (دنبك) و (دەف) و کەوچکی دار ئەو تیپانەش لە کەرکوك دا بە تیپی (باغلما) ناو دەبرێن ئەو ناوەش بۆ قەبارەی ناوەنجی ئامێرەکە دەگەرێتەوە. لەگەڵ بوونی ئەو ئامێرانە لەناو کەلەپوردا بەڵام کۆکردنەوەمیان لە چوار چێوەی یەك تیپ دا ئەوە جۆرێکە لە نوێ کردنەوە، کە ئەو تیپەش بۆ بەشدار بوون لەگەڵ گۆرانی‌یە فۆلکلۆری‌یەکانی ناوچەکە دێتە دی.

٢ ـ جۆری دووهەمیشیان سەر بەو تیپانەن کە دەچنە ژێر ناوی (تیپی رۆژهەڵاتی)، ئەمەش لەو تیپە دوو رەگانەیە کە ئامێرە رۆژ ئاواییەکانی وەك کەمان و چەلۆو کۆنترباص و هەندێ جۆرە ئامێری و هەندێ ئامێری ئیقاعی تیایە لەگەڵ عودو نایو قانونو ئۆکۆردیۆن و جونبش و ساز، ئەوەی لای هەموانیش زانراو بێت ئەوەیە کەئەو جۆرە تیپانە گەورەن بەڵام دەکرێ بە قەوارەی بچوکیش ساز بدرێن، ئەگەر پێویستی بەوە کرد، وەکو ئەو تیپانەی کە لە (تلکێف) دا بینیمانن کە لە تەنبوورو عودو گیتارو دنبك و کەمان پێك هاتبوو.

لە راستیدا جۆری پێك هاتنی ئەو تیپانە جێگیر نیەو دەتوانرێ چەندان شێوەی جۆراو جۆر وەربگرن، بەڵام بەکار هێنانی ئامێری تەنبوور بەو شێوە نوێیە، ئەوە چوونی ئامێرەکەیە بۆ ناو ئێزگەو تەلەفیزیۆن وەکو ئامێرێکی سەر بەخۆو لەهەمان کات دا وە زیفەی بوزوق ژەنیش هاتووەتە پێشێ، ئەمەش بە تەواوی وێنەیێکی سەر بە خۆی ئەو ئامێرەیە، ئەمەو سەرباری بەشدار بوونی لەگەڵ تیپەکان دا.

### ٣ـ٤ روانینی کۆمەڵەیەتی بۆ ئامێری تەنبوور

تەنبوور لەو ئامێرانەیە کە خاوەنەکەی تارادەی عیشق شانازی پێوە دەکات، چونکە وەکو یەکێکیان دەڵێ بە بیستنی ئەو ئامێرە غەمی بەبا دەروات، (یونس وەیس)ی ئامێرژەن کە خەڵکی تەلەعفەرە دەڵێ کاتێ تەنبوورێکی دەدەمێ «وەك بڵێی موڵکی دنیای درابێتی» خاوەنی تەنبوورەکانیش لەشکانی ئامێرەکانیان دەترسن، بۆیە لە شوێنی دوورە دەست دەیپارێزن خاوەنی تەنبوور لە جوان کردنی ئامێرەکەی‌دا دەست رەنگینی دەنوێنێ. ئەمەش بەوەی هەندێ نەخش و نیگاری لەسەر دەنەخشێنێ، دەتوانرێ هەندێ لەو نەخشانە بینە بەشی لە دروست کردنی ئامێرەکە، ئەو کارەش بە زۆری لەسەر روو، یا دەسکی ئامێرەکەوە دەبێ، کەشێوەی ئەندازەیی جیاواز وەر دەگرێ، بەرەنگی دارەکەوە بێت.

یان رەنگ بکرێت. هەندێ جاریش دیوی دەرەوەی ئامێرەکە دەرازێنرێتەوە، لەو حاڵەتەش دا شوێنی گونجاوی ئەو نەخش و نیگارانە، خانەی کیلەکانە. (عەلی ئەلتەعفەری: ١٩٧٤: ١٥٢). دەشتوانرێ بە نوسینی ئەم لاو ئەو لای جوان بکرێ. هەندێ ئامێری تەنبور. وەکو رووبابەو تەنبوورەی باشوور ناوی تایبەت بەو ئامێرەیان هەیە. دەکرێ ناوی تەنبوورەیێکی دیاریکراو بە ناوی وەستاکەیەوە بنوسێ، ئەوسا کە دەڵێن تەنبورەکە لە دەست کردنی فلانە کەسە (هەمان سەر چاوەی پێشوو) ئەمەش بۆ خۆی لەلایێکەوە جۆرە نرخ دانانێکە بە چاکی ئامێرەکەو وەستاکەی، لە لایەکی دیکەوە دانای ناوی وەستاکەی دروستی کردووە مانای ئەو دەبەخشێ کە هەر وەستایێك شێوازو جێ پەنجەی خۆی هەیە. یان لەوانەیە تەنبوورەکە ناوی یەکێك لە (عاشقە) بە ناوبانگەکان یان مردووەکانی پێوەبێ. (ئەلتەعفەری: ١٩٧٤: ١٥٣) لەبەر چاوگرتنی هەموو ئەو بارانەش بەندە بەو ناوچە کۆن و ناسراوانەی ئەو ئامێرەی تێدا دروست دەکرێت کە هەرگیز نەلە دهۆك و نە لە زاخۆدا ناسراو نییە، چونکە زۆر لە مێژنییە ئەو ئامێرە چووتە ئەوێوە.

### ٣ ـ ٥ کاتی ژەنین

لە بەرئەوەی یەکەم شێوەی بەکار هێنانی ئەو ئامێرە پەیوەندی بە دانیشتنی برادەرانەوە هەیە. بۆیە دەربارەی دەڵێن، بەکار هێنانی بۆشەو دەست دەدات و نابێ بە رۆژ بەکار بهێنرێ چونکە ئەوەیە «عەیبە» هۆی بنچینەیی ئەو عەیبە کۆمەڵایەتییە ئەوەیە کە ئامێر ژەنەکە ئارەزووەمەندەو بە یەکجاری خۆی بۆ ئەو تەرخان نەکردووە واتە لە ماوەی کاتی رۆژدا خەریکی پیشەیەکە. بۆیە ئامێر ژەنین لەکاتی ئیش کردن دا لەبەر هۆی عەمەلی دروست نییەو ناگونجی، ئەگینا ئامێرژەن بە کەسێکی شایانی هەڵگرتنی لێپرسینەوە دانانرێ و بەبێ باك دادەنرێت. ئامێریش لەلای ئارەزوو مەندەکان دەتوانرێ تەنیا بە ئامانجی کات بە سەربردن و خۆشی خۆیان لە کاتی شەودا بەکار دەهێنرێ. بەڵام ئەگەر کۆمەڵ بۆ نەیەکی گشتی دیاری کرد وەکو زەماوەند. ئەو کاتە چەمکی عەیبە.

کۆمەڵایەتییەکە نامێنێو دەرگا لە بەردەم ئارەزوو مەندەکە دەکرێتەوە، تاکو بە رۆژ ئامێر بژەنێ.

### ٣ـ٦ (مۆسیقای ئامێرو شێوازەکانیو بابەتەکانی گۆرانی)

بەکار هێنانی تەقلیدیانەی ئامێر، واتە لەگەڵ گۆرانیدا بێت، سێ

[...]ەندێ لەو زاراوە ناوچەییانەی لەناوانی بەشەکانی ئامێری تەنبووردا بەکاردێن

| [...] ئامێر | کەرکووک ـ تورکمان ـ | زاخۆ کوردی بادینان | دهۆك کوردی بادینان | باکوری سووریا ئاسوورییەکان | شەنگار یەزیدی | تەلەعفەر تورکمان | لە عەرەب |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [...]وی [...]عرفی | صندوق | کورد ـ سماعة | کوردی بادینان | بارسۆی | کورە | طاس | سندوق |
| [...]سروق | تیغ اور | وجه رێ سووری | قەپەغ | باشە | | | قپنی وجو |
| [...]ع | قول | زند دەستە | دەستك | ایزە | دەسته | زند ذراع | ید، زند |
| [...]وسی الیاخ | جلیجە | کلیل | کلیل | کێزی یانە | | کلید کلیدئاوی | |
| [...]سێن | بردە زلی | پەردە | پەردە | | | | |
| [...]تار | تێری | تێل | تێل | سیلا | | | أوتار |
| [...]الە | جسەرلی جوربلی | جسەربلیل | جحل | | | مخدة الأوتار | غزالة |
| [...]ێشە | پرێشە | پرێشە | پرێشە | | | | ریشة |
| [...]سط | | | | | | ئاشوخ | |

شێوەی هەیە!

١ ـ شێوازی مەقام. که تیایدا ئامێرەکه شان به شانی وتنی مەقامەکه دەڕوات و ئەو پارچانەش نەختێ درێژن، کێشێکی سەر بەستی هەیە پێویستی به مەودای دەنگێکی بەرین هەیە. ئەوەش بەسەر گۆرانی بێژ دەسەپێنی تاکو زانیاری تەواوی هەبێ له گوێزانەوەی ئاوازەکان و به باشی ئا[...] [...] ژەنێ، لەم جۆرە شێوازەی گۆرانی گووتنیشدا دەتوانرێ [...]ێرەکه بەکار بهێنرێ بۆ ئەوە به بەردەوامی له گەلیدا براوات.

هەروەها دەشتوانرێ چەند کۆپلەیەك به هۆی دەنگی ئادەمزادەوە بگووترێ، بەبێ ئەوەی تەنبووری لەگەڵدا بێت.

٢ ـ شێوازی گۆرانی داستانی، که له ناوچە کوردیو تورکمانییەکاندا بڵاوەو گۆرانی بێژ تیایدا به شێوەی (گێرانەوە) چیرۆکێ دەگێرێتەوە. لەو حاڵەتەشدا تەنبوور له شوێنی دیاریکراوی گۆرانییەکەدا بەکار دەهێنرێ به تایبەتی دوای گوتنی کۆپلەیێکی درێژ که مۆسیقاکەی تێدا تەواو دەبێت.

٣ ـ شێوازی بەستە، که لێرەدا ئامێرەکه بەکار دەهێنرێ بۆ بەشداربوون لەگەڵ ئەو گۆرانییە سووکەڵەو خاوەن کێشانەی کەوا به بەردەوام ئیقاع (بێژەن)(*) پاڵپشتی دەکات. بابەتەکانی گۆرانی که تەنبوور لەگەڵی لێ دەدرێ جۆراو جۆرن: گۆرانی داستانی، که چیرۆکی جەنگ و پاڵەوانبازیو رووداوە مێژووییەکانو رووداوەکانی ناوچەکه دەگێرێتەوە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا تۆمارێکی مێژووییە بۆ ناوچەکە، گێرانەوی چیرۆك و حەکایەتەکانیش دەچنە ئەو تۆمارەوە.

لەولا بابەتی ئاینیش هەیە کەوا کارەساتی بنەماڵەی پێغەمبەر دەگێرێتەوە، به تایبەتیش کارەساتی (کەربەلا). هەروەها ژیننامەی پێغەمبەر (د.خ)، دەگێرێتەوە. ئەوە بێجگە له بابەتی سۆفیانەو گۆرانی عیشق و دەست لێك بەردان و حەسرەت و سکاڵای دەردی دڵ. ئەو جۆرە گۆرانییەش بەسەر جۆرەکانی دیکەی گۆرانیدا زاڵە. تێکستەکانی گۆرانیش بەپێی بۆنەکه دەگۆرێت، گۆرانی دیاریکراو هەیە له ژن هێنان و خەتەنەو [...]و تاد.... بەکار دێن. هەروەها تەنبور شان به شانی مە[...]ات و قۆریات لێ دەدرێ، ئەمانەش بابەتەکانیان زۆرو جیاوازن له یەکتر.

## ٤ ـ ١ گۆرانی بێژ

ئەوەی باوەی پێویستە تەنبوور ژەن گۆرانی بێژ بێت، هەر چەندە هەندێ له گۆرانی بێژەکان ناتوانن ئەو ئامێرە بژەنن، بەڵام بوونی کەسێك ئامێر بژەنێو گۆرانی بێژ نەبێت حاڵەتێکی زۆر دەگمەنە. لەوانەیە لەپاڵ ئامێر ژەنین و گۆرانی گوتندا توانای دیکەیشی بێتە سەر وەکو دروست کردنی ئامێرەکه، یان دانانی شیعری گۆرانییەکان، (یونس وەیس قەساب) له تەلەعفەردا ئامێرەکه دەژەنێو گۆرانی دەڵێو ئامێرەکەش دروست دەکات و شیعریش دادەنێ، ئەوە سەر باری ئەو شیعرانەش که ئەز بەری کردووە.

ئەمەیان بۆ ئەو ناوچە دێرین و کۆنانەی کەوا تەنبووری تێدا بەکار دەهێنن، بەڵام هەرچی ئەو ناوچانەن کەوا بەم دواییە ئەو ئامێرەی تێ چووە: وەکو پارێزگای دهۆك، ئەوە گەنجەکانیان کەوتنە ژێر کار تێکردنی چەمکی دابەش کردنی ئیش و کاری

نزیکە، ئەو دوو قوڵییەی کە لە نێوان گۆرانی بێژو ئامێر ژەنی کۆندا هەبوو ئێستاکە رووی کردۆتە کز بوون. ئەوەی ئەمڕۆکە زیاتر باوە ئەوە دوو قوڵی نێوان ئامێر سازو ئامێر ژەنە.

ئەو ئامێر ژەنانەش کەوتنە دەرکەوتن کە هیچ پێوست بەوە نەکات گۆرانی بێژیان ئامێر ساز بن.

ئامێر ژەنی کۆنی تەنبوور بە (عاشق) ناو دەبرێ، کە ئەو ناونانەش لە دەروێشەکانی تەریقەتی سوفیزمی وەرگیراوە، چونکە دەروێشەکانی ئەو تەریقەتانە، ئامێرەکە بە مەبەستی ئایینی بەکار دەهێنن. بۆی هەیە کۆنی ئەو بەکار هێنانە وای کردبێ ئەو ناونانە بەسەر ئامێر ژەنی دنیاییشدا سەپابێ.

جاران عاشق کە سایەتییەکی زۆر بایەخدار بوو لە کۆمەڵگەیدا، ئەو مامۆستای گەل بوو، چونکە داب و نەریتی ئایینی و دنیایی کۆن و نوێ دەپارێزیٚ و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی دەیگوێزێتەوە. خاوەنی زەین و بیرێکی تیژی ئەو تۆیە کە یارمەتی دەدات بۆ ئەزبەر کردنی شیعرو پاراستنی بیرۆزی گەلی (عاشق) نرخی زیاتر دەبێ ئەگەر سەلیقەی شیعر نووسینی هەبێ یا شایەر بێ و دەم و دەست لە دەمی بێتە دەرێ. لە لایەنی مۆسیقاشەوە عاشق توانای تەنبوور ژەنینی هەیە، مەرجیشە دەنگی بەهێز بێت بۆ گۆرانی گوتن.

لە ناو ئەو کۆمەڵگایەشدا کە توانای خوێندنەوەونوسینیان نەبێت عاشق دەوری رۆژ نامەیەکی رۆژانە دەگێرێ، هەواڵ دەگوێزێتەوەو رووداوە گرنگەکان تۆمار دەکات، عاشقی کۆنیش پێویستە ژیانی خۆی بۆ ئیشەکەی تەرخان بکات، واتە ئەوەی کردووە بە پیشەی خۆی و لە دێهات و شارەکاندا دەسورێتەوە، ئەوەش نزیکە لە دەوری ئەو شاعیرە کۆچەرییەی کە رووبابە لێ دەدات، یان ئەوەی لە بۆنەکاندا شیعر رێك دەخات، هەر دوو کیشان دەوردەکەیان تەنیا لەسەر مۆسیقا ناگیرسێتەوە، بەڵکو لە باڵ ئەوەشەوە پەل بۆ لایەنی ئەدەبیش دەهاوێ.

عاشقیش (ئامێر ژەن - گۆرانی بێژ) بە مانایە ئایینییەکەی ئێستاش لە ناوچەی باکووری عیراقدا کوردستاندا هەن. لەو گەشتە مەیدانییەی لە ساڵی (١٩٧١) دا کردمان بۆ (مەڵبەندی کەلەپووری مۆسیقایی) توانیمان چاومان بە هەندێ لەو

## ژێ و کلیل و پەردەکان

| | | ژمارەی ژێیەکان | کەرەستەی ژێیەکان | ژمارەی کلیلەکان | ژمارەی پەردەکان | کەرەستەی پەردەکان | سەرچاوەی ئامێرەکە | لە کوێیە لە ئامێری | [illegible] |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | شانی شەنگار | ٢ + ١ | دوان لە کانزا یەکی لە پەڕۆ لە | ٢ | ١٢ | نایلۆن | سکینەی زوورووشەنگار | سەلتەنەی فۆلکلۆری | [illegible] |
| ٢ | جزیریەکان تورکمانەکان | ٢ + ١ | کانزا | ٤ | ١٢ | پەڕۆ یان داوی شەتی لار | تەلەعفەر | سەلتەنەی کەلەپووری مۆسیقایی | [illegible] |
| ٣ | کوردەکانی بادینان | ٢ + ٢ | کانزا | ٨ | ١٤ | نایلۆن | زاخۆ | م.ل | [illegible] |
| ٤ | | ٢ + ٢ + ١ | کانزا | ٦ | ٢٢ | نایلۆن | زاخۆ | م.ل | – |
| ٥ | | ٢ + ٢ | کانزا | ٤ | ١٢ | نایلۆن | دهۆک | م.ل | [illegible] |
| ٦ | | ٢ + ١ | کانزا | ٢ | ١٢ | نایلۆن | دهۆک | م.ل | [illegible] |
| ٧ | | ٢ + ١ | کانزا | ٢ | ١٢ | پەڕۆ لە ... | ئاکرێ | م.ف | [illegible] |
| ٨ | کەرکوکلی تورکمان | ٢ + ١ | کانزا | ٤ | ١٤ | نایلۆن | هەولێر | م.ل | [illegible] |
| ٩ | | ٢ + ٢ | کانزا | ٤ | ١٤ | نایلۆن | هەولێر | م.ل | [illegible] |
| ١٠ | | ٢ + ٢ + ٢ | کانزا | ٦ | ٢٢ | نایلۆن | کەرکووک | م.ل | [illegible] |

دەروێشانە بکەوێت. دەشتوانین بڵێین یەکە ئەرکیان ئەرکێکی ئایینییە، واتە مەرجی گۆرانی زانین و ئامێر ژەنینی تێدا بێت بۆ گەیشتن بە ئامانجە ئایینییەکە. بەڵام مۆسیقا پێویستە هەل و مەرجی دیکەی گرتبێتە خۆیەوە وەکو دەنگ خۆشیی، هەروەها بوونی بەهرەی مۆسیقایی لە ئامێر ژەنین و گۆرانی گووتن و بیر تیژیی.

هیچ زانیارییێکی ورد یان راستمان دەربارەی لایەنی ئابووری ئەو کەسانەوە نیە، نە لە بارەی دەستکەوتیان دەزانین، بەڵام ئامێر ژەنی دنیایی ئامێری تەنبوور، لە هەموو خاکی جزیرەو ناوچەکانی کەرکووك و هەولێردا، ئەوە بە هۆی پیشەیێکی سەرەکی دیکەوە دەژین وەکو فەلاحەت و دارتاشی یان گۆشت فرۆشتن و جۆلایی.

تەلەعفەری (١٩٧٤) دەڵێ: لە تەلەعفەردا دەستەیێك نیە رووویان کردبێتە گۆرانی گوتن تا بیکەنە هۆیێك بۆ ژیان و

...یان پێ دەست بکەوێ. پاشان پارە وەرگرتن لە ڕێزی ...نی بێژەکاندا هەر نیە، هەر چەندە لە تەلەعفەردا لە ساڵی ١٩٠٧ بەو مانا ئابووری‌یە یەکێکمان دەست نیشان کرد، بەڵام ...کۆڵینەوەی ژیانی ئەوەی بۆ دەرخستین کە لە ڕەچەڵەکدا ...وتیارە، رووشی کردبوو.

...ستە بەرکردنی ژیانی خۆی بە هۆی مۆسیقاوە چونکە هیچ ...یشێکی دیکەی دەست نەکەوتبوو. ئەم خۆ بۆ تەرخان کردنەش ...ۆرێکی دیاری کراوە، کە لە ناکۆکی بەدەر نیە، هەر ئەو ...ۆرانی گووتن یان ئامێر ژەنین بەرانبەر بە پارە، بۆ هەر کەسێ ...ێ کۆمەڵە کەسانێکی بێگانە ڕەت دەکردەوە. وای بە باشتر ...ەزانی لە سنوری کۆمەڵەکەی خۆیدا خۆی تەرخان بکات بۆ ...ەو پیشەیە، تاکو بە پارەی خەڵکی تەلەعفەر ئەو بەزم و ئاهەنگانە ...ێژی کە لە مانگێکدا جارێك یان دوو جار ساز دەکرا.

...ەوە دەچێ خۆ تەرخان کردنی و ژیان لەسەر مۆسیقا ڕەت کردنەوەیەکی ڕەهاو یەکجارەکی نەبێت کە ملکەچی گۆرانی بارو دۆخە. ئەم ڕەت کردنەوەیەش وەکو گووتمان لە دووفاقی و ناکۆکی بەدەر نی‌یە. بۆ وێنە لەسەر پاکی ناوچەکانی باکور (ئەوانەی خۆیان بۆ دەهۆڵ و زورنا ژەنین تەرخان کردووە ئەو قسەیە نایان گرێتەوە):

کە لە هەندێ تەنبوور ژەنمان پرسیار کرد کە بۆچی خۆیان بۆ مۆسیقا تەرخان ناکەن و ئەو هۆیانە چین ڕێیان لێ دەگرێ، زۆریان پێیان وتین کەوا مۆسیقا پیشەیەکە دەستکەوتی نیە: ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کۆمەڵ ئەگەر چی بیری مۆسیقا ژەنین بەرانبەر بە پارە ڕەت کردووەتەوە، بەڵام هەندێ جار دوور کەوتنەوە لە مەسەلەی خۆ تەرخان کردن بۆ مۆسیقا هۆیەکەی کەچی ئەو پارەیەیە کە دەیاندرێتی. وا دیارە بیری مسۆگەر بوون لەمەدا سەرکی بێ، چونکە خۆ تەرخان کردنی کەسێ بۆ مۆسیقا وای لێ دەکات لە ژێر بەزەیی و سۆزو داوا کارییەکانی کەسانی تردا بێت، لە کاتێکدا ئەگەر پەیوەندی بە شوێنێکی مسۆگەرەوە بوو، ژیانی بۆ دابین بکات ئەوە خۆ تەرخان کردن ڕەت ناکاتەوە. یەکێك لە ئامێر ژەنەکان پێی گووتین کەوا خۆ تەرخان نەکردنی بۆ مۆسیقا لەبەر ئەوەیە کە شارەکەی (تەلەعفەر) دەزگایەکی لێ نی‌یە لەلای خۆیان دایمەزرێنن. هەر چۆنێ بێت ئەو تێروانینە دوو لا یەنی و ناکۆکە لە لای ئامێرژەن هیشتاکە زاڵەو مۆسیقا ژەنەکان خۆشیان هەستی پێدەکەن لە داب و نەریتی کۆمەڵدا بەهرەی گۆرانی بێژو تەنبوور ژەن چەندەکی بەرز بیت و چەندیش کۆمەڵ بە چاوی ڕێزەوە تەماشای چالاکی‌یەکەی بکەن، تەنانەت ئەگەر هەستی بەوەش کرد کۆمەڵ ناتوانێ پشتی تێبکات و دەستی لێ هەڵگرێ، ئەوە چاك ئەوەش دەزانێ ئەو تێروانینە رووێکی دیکەی هەیە کە لە بارو دۆخی تردا وەکو ژن هێنان دەخرێتە پێش هەموو شتێك، کۆمەڵگای تەقلیدی ناچێ بە عەقڵیاندا ژن بدەنە تەنبوور ژەن - یان هەر مۆسیقا ژەنێکی دی - چونکە لەو بروایە دان کە مۆسیقا ژەن لە توانایدانیە ئەرك و لێپرسینەوەکانی ژیان لە ئەستو بگرێ.

## ٤-٢ فێر بوونی ژەنینی ئامێری تەنبوور

فێر بوونی کۆن کە زانیاری مۆسیقا لە دەمی مامۆستاوە دەگەیەنێ بەو کەسانەی دەیانەوێ فێرببن، لەو ناوچانەدا کە تەنبووری تێدا بەکار دێت نەزانراوە، هەموو ئامێر ژەنەکان لەگەڵ جیاوازی ئاستی هەر یەکێکیاندا بە یەك ڕیگا فێری بوون کە ئەویش (گوێ گرتنە - سماعی) فێر بوونیشی دوو مەرجی هەیە، ئارەزوی زۆرو توانایان بەهرە.

زۆر زەحمەتیش نیە توانای ئەو ئامێر ژەنانە هەست پێ بکەین، کە سەرمان لێیان سور دەمێنێ، کاتێ بەو کارامەیی‌یەوە لاسایی ئەو دەکەنەوە کە گوێیان لێ دەبێت. فێر بوون لە ڕێی سەرنج دانی کەسانی دیکەوە دەبێ لە دانیشتن و چایخانەو یانەو قوتابخانەکاندا، ئامێر ژەن (زین العابدین رەزا) لە تەلەعفەر دەڵێ لە ساڵانی نێوان (١٩١٧-١٩٢٠) دا سەرنجی ئامێر ژەنە کۆنەکانی دەدا لە وانە (محەمەد عومەر) و (خضیر عربو) و (سەعید محەمەد) و (ابرام الله) و (سلمان جدوع)، پاشان دەگەرایەوە ماڵەوە بۆ بەیانی‌یەکەی ئەوەی تاقی دەکردەوە کە لەوانە گوێی لێ دەبوو.

(غائب عبدلهادی)یش کە خەڵکی زاخۆیە، فێری ئەو ئامێرە بوو بەهۆی چوونی بۆ ئەو چایخانەیەی کە (محەمەد عارف جەزراوی)ی تێیدا دادەنیشت و ئەو ئامێرەی دەژەنی.

(محەمەد یونس)یش کە خەڵکی تەلەعفەرە بەهۆی سەرنجدانی کەسانی دیکەوە لە کاتی ژەنینی ئەو ئامێرە فێر بوە، قسەی هەموو ئەو ئامێرژەنانە هەر هەمان مەبەست بە دەستەوە دەدات، واتە هەر هەمویان بە ڕێگەی سەرنجدانەوە فێری بوون. هیچ کامێکیش لە وانەی لێمان پرسین، لەسەر دەستی یەکێك لە مامۆستا یەکانی ئەو سەردەمە دەرسی نەخوێندووە. ڕێگای بەستنەوەی گوێ سووکیو دەوری هەست بینین لە سەرنجدانی وردەکارییەکانی ئامێر ژەنین و بەکار هێنانی دەست دەبێتە تەواو کەری گوێ گرتن بۆ ئێزگەکانی توورکیا و سووریاو هی دیکە. لە ئامێر ژەنێك زیاترمان بیست کە مۆسیقییەکان زۆر لە گوێ گرتنی ئێزگەکانەوە فێردەبن. لەوانەشە ئەو کەسە لە ئامێر ژەنێك زیاترەوە فێربێ. وا دیارە زۆربەی ئەوانەی چوونەتە ئەو بوارەوە تەنیا بە پشتی تواناکەیانەوە دەستیان پێ نەکردووە، بەڵکو بارو دۆخێکی پڕ لە کارەسات پاڵی پێوەناوە. زۆربەی هەرە زۆری ئامێر ژەنەکانیش لەسەر وەڵام دانەوەی یەك رایان هەبوو کە پێمان دەگووتن: کێ فێری ژەنینی ئەو ئامێرەی کردی؟

دەیانگوت: «ئاگری دڵ» یان عیشق بە تایبەتیش نووچ دان و مایە پووچی تیایدا. هەر ئەوەشە زۆربەی هەرە زۆری گەنجانی ناوچەی تەلەعفەروشەنگار پاڵ پێوە دەنێ تاکو گوزارشت لە کارەساتەکانی خۆیان بکەن، چونکە ئامێر ژەنین و گۆرانی چرین دوو هۆی لەبارو گونجاون بۆ ئەوەی حەسرەتی خۆیانی پێ دەربکەن لەبارو دۆخێکی دیاری کراودا. لەم دوا دواییەشدا ـ واتە لەم دە ساڵەی دواییدا ـ ئامێری تەنبوور و ئامێر ژەنەکانیان گۆرانی زۆریان بەسەردا هات، ئەو گۆرانەش هاوشانە دەگەڵ ئەو گۆرانکارییەی بەسەر ناوچەکانی باکووری عیراق ـ کوردستاندا ـ هات تەلەفزیۆن بڵاو بوەوەو چووە زۆر شوێنی دوورە دەست، هەروەك چۆن شریتی کاسێت بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش بڵاو بوەوە، ئێستا ڕەشماڵێك لە جزیرەو ماڵێك لە بناری شاخی نابینی ـ هەر چەندە هەژارو دەست کورتیش بن ـ کە شریتی کاسێت و ڕیکۆردەری تێدا نەبێت، ژمارەی ئەو قوتابیانەی چوونە زانستگەکان زۆر بوو هەموو ئەو گۆرانکاریانە کاری کردە سەر ڕۆڵی کۆمەلاتیو جۆری تەماشاکردنی ئامێرەکە لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە. ئەو ئامێر ژەنەی جاران حەزی نەدەکرد بەرامبەر خەڵکانی زۆر دەرکەوێو نە دەچووە چایخانە تاکو ئامێر نەژەنێ، ئەمڕۆ کاسێت داگیری کردووەو دەنگیشی گەیشتە زۆربەی ئەو ناوچانەی کە خۆی حەزی نەدەکرد تێیان بچێ. ئەوەنێکی نوێی ئامێر ژەنیش دەرکەوتن کە بۆ ئێزگە بەرهەمیان تۆمار کردو ئەو ئامێرەیان بردە ناو زۆربەی تیپە ڕۆژهەلاتییەکان و تیپەکانی شاییو هەڵپەرکێ. لە پاڵ ئەو بارو دۆخە تازەیەی ئەو ئامێرە، ئامێری تەنبوور بووە ئامێرێکی ئاواز ژەنینی سەر بەخۆ، هەر وەکو عوودی عەرەبییان ئەو ئامێرانەی وەکو ئەو وان و لە توورکیادا هەن. دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ دەورەکەی تەنیا ئەوە بوو شان بە شانی گۆرانی لێ بدرێت. هەروەها تەنبوور دانەرو مۆسیقاژانی نوێی بۆ هاتە مەیدانەوە. تەنانەت لە شاری بەغداشدا کە هەرگیز مەڵبەندێ نەبووە ئەو ئامێرەی تێدا بژەنن، لە ئێزگەدا ئامێر ژەنێکی تایبەتی تێدا دەرکەوت و هەروەها ئامێرسازێکی شارەزاش سەری هەڵدا..

## پاشکۆو سەر چاوەکانی

٥ـ١ ئەو دارانەی لە دروست کردنی ئەو ئامێرەدا بەکار دێت. لەولا زۆر جۆرە دار هەیە کە لە دروست کردنی تەنبووردا دەست دەدات. ئەمەش لە ناو چەیەکەوە بۆ ناوچەیێکی دی بەپێی خوو نەریتی وەستاکانی ناوچەکە جیاوازن، هەروەها ئەو جیاوازییە بە پێی توانای دەورو بەرو ژینگە ڕووەکی یەکەوە دەگۆڕێ، کە هەر وەك باوە دوو تا سێ جۆر ڕووەك لە دروست کردنی یەك ئامێردا بەکار دێ.

چاکی ئەو ئامێرەش بە کۆنی ئەو دارە دەپێورێ کە لە دروست کردنیدا بەکار هاتووە گرنگترین داری گونجاوی ئەو ئامێر سازییەش ئەمانەن: گوێزو توو و قەیسیو سیسەم و کەوەتو ساجی گوڵ و بەروو و کەفودو هەنجیرو گوێزو چنار. ئامێر سازەکانیش لە هەڵبژاردنی ئەو دارانە جیاوازیان هەیە، هەیانە دەڵێ داری توو کەوەتو ساجی گوڵ بۆ دروست کردنی تەنبوور دەگونجێت ، چونکە دارەکانی دی بە باشی ئاوازو نەغمەکە ڕێك ناخات یان (پێویستە دار قسە بکات) بە تەبیعەتی حاڵ هەموو دارەکانیش بە یەك شێوە قسە ناکەن.

ـــ تەنبوورانەی کە لەو لێکۆڵینەوەدا پشتیان پێ بەستراوە

| ـــ | سەرچاوە | ژمارەی ئامێرەکە | مێژووی کڕینی | کۆکەرەوەی ئامێرەکە | ئامێر سازەکە |
|---|---|---|---|---|---|
| ـــووری | تەلەعفەر | ٩/٧١ | ٧١/٨/٢٢ | شەهرەزاد قاسم حەسەن | محمد یونس |
| | سکنیەی ژوورو | ١/٤/١٠ | ٧١/٧/٤ | لوتفی ئەلخوری | حیدر شیخ مراد |
| ـ ـ | دهۆك | ٢/١٥/٧٢ | ٧٢/١٠/٤ | شەهرەزاد قاسم حسن | علی حمد عمر |
| ـ ـ | دهـــوك | ٢/١٥/٧٢ | ٧٢/١٠/٤ | شەهرەزاد قاسم | کەلاڵ اسماعیل |
| ـ ـ | زاخـــو | ٤/١٦/٧٢ | ٧٢/١٠/٥ | شەهرەزاد قاسم | عبدالعزیزسلمان |
| ـ ـ | عەقرە | ١/١٤/١٠ | ٧٢/١٠/٤ | لوتفی ئەلخوری | عبدالعزیزسلمان |
| ـ ـ | هەولێر | ٣/١٩/٧٢ | ٧٢/١٠/١٠ | شەهرەزاد قاسم | یونس خطاط |
| ـ ـ | هەولێر | ٤/١٩/٧٢ | ٧٢/١٠/١٠ | شەهرەزاد قاسم | بدرخان طه |
| ـ ـ | کەرکـــوك | ١/٢١/٧٢ | ٧٢/١٠/١١ | شەهرەزاد قاسم | بشیر فون ـ صنع ولیم |
| جیگور | زاخۆ ـ | ——— | ——— | ـ غائب عبدالهادی | غائب عبد الهادی |

★) لە باســەکــەی بەرێزان «گۆرگیس و میخائیل عەواد» لە باوکیــانەوە ـ حەننا عەواد ـ زانیویانە کەوا زاراوی (جونبەر) وەکو ناوێ بۆ ئەو ئامێرە لە شاری مووسڵدا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا باو بووە. (میخائیل و گورگیس عەواد: ١٩٧٨) ئەو سەر چاوانـــەی لە باســەکــەدا ناویان هاتووە.

( ٥ ـ ٣ )


ـ ئەحمەد حامید ئەلسەراف: الشبك ـ بەغدا ١٩٥٤

ـ عەلی ئەلتــەعفــەری: الأغاني الشعبية والآلات الموسيقية في التلعفر، التراث الشعبي، ژمارە: ٦، ١٩٧٤

ـ عەتــا تەرزی باقی: المقـامـات الشعبية في كركوك ـ التراث الشعبي ژمارە ٣، ١٩٦٥

ـ عبداللطيف بندر اوغلو: الملحمة في الأدب التركماني ـ التراث الشعبي ـ ژمارە ٧، ٨، ١٩٧٢

ـ فارابي: كتــاب المــوسيقى الكبــير ـ ساغ کردنەوەی غطاس عبدالملك خشبة ـ قاهرة: ١٩٦٧

ـ صبحي انور رشيد ـ تاريخ الآلات الموسيقية في العراق القديم

ـ فارمەر هـ. ج: الموسيقى في الف ليلة وليلة. وەرگێرانی ئەنصار

ـ قاهیرە ١٩٤٥

ـ میخــائیل عەواد گۆرگیس عەواد «الفنان العراقي حنا عواد وآثــره في الآلات المــوسيقي الشرقيــة، بحث قدم لمؤتمر بغداد الدولي الثاني في كانون الأول ١٩٧٨.

(١٥ لاپەرەیە) ، بەغدا بە رۆنیۆ

– Sach, C: The History Of Mucical Lnstram ents, Newyork) 1978 (Reprinted Edition

– Schaeffner , A,: Les Origines des Instramente de masique paris 1969

– Hassan Scn : L'es Instram ents de muslque en Irak et leur) ro le dans la Societe traditioneelle, paris 1980 (roneo

– Hassan Sch : The long Necked lutein Iraq , Asian music Vol xiii – 2

Mokrm : La Mus, que Sacree des Kurdes Fideles de Veite, InE MS paris – 1968

– Mauguin B,: Chants Sacreesd, Anatotxlie, OcorA OCR ,) 56 1971 (?

– pocne CH; Musiciens Kurdes S riens, Fes tiraidid, Auto Mne a paris 1976

– Reinhard C,V; Turquie Traditi Ohs Masicales Paris 1968


پەراوێزو تێبینییەکانی وەرگێر کە بە ئەستێرە جیا کراونەتەوە.

★ لە کتێبی (حضارة الدولة) الدوستكية، ج ٢ چ ٥ ١٩٧ ل ٢٣٨ دەربــارەی عوودو رەچەڵەك و. مێژووی سەرهەڵدانی لە وڵاتی کوردەواریــدا نوسراوە: هەنــدێك لە لێتۆژەرەوەکان وەکو پرۆفسۆری ئەڵمانی (شتاور) و (ئایجن)ی قوتابی ئەولەسەر ئەو باوەڕەدان کەوا عوود حوریــیەکـــان دروستیـــان کردووە کە ئەوانـــەش لە گەلانی کوردستـــانی کۆنن لە نیـوەی یەکــەمی، هەزارەی دووەمی پێش زاییــنــدا، ئامــێرێکی عوود لە ناوچەی گۆمی (وان) باکــووری عیراقــدا لە سەردەمی حورییەکاندا دۆزراوەتــەوە، هەروەهــا لە (نــووزی، یورغــان تەپە)ی نزیك کرکـــوك تابلۆیـــەك دۆزراوەتـــەوە کە وێنـــەی عوود ژمنێکی بەسەرەوە بووە.

نووزیش پایتەختی حورییەکان بور کەلەوێ هەزاران تابلۆی

مسماری تێدا دۆزراوەتەوە. لە سەدەی پانزەهەمی زاییندا لە کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکیدا عوود بەکار هاتووە.

★ لە لێکۆڵینەوەکەی کاك (عبدالرقیب یوسف) کە لە گۆڤاری (رۆشــنـبـیری نوێ)دا لە ژمــارە (١١٥) و (١١٧)ی ساڵی ١٩٨٨دا بڵاویانی کردەوە، لەو دوو گوتارەیدا وێنەی تەنبوور کێشراوە لە نێو تابلۆ هونەرییەکانی کتێبی (شەرەفنامەی) شەرەفخان.

ئەمــەش بەڵگــەیــەکی دیکەیە کەوا چوار سەد ساڵ لەمەوبەر لەچەند تابلۆیەکی هونەریدا وێنەی تەمبوور بەرچاو کەوتووە، واتــە ئەو کاتە تەنبوور لە کوردستاندا باو بووە و لەناو ئامێرە مۆسیقاییەکانی دیکەی کوردستان جێگای خۆی هەبووە.

★ خاتــوو (شــەهــرزاد) وای دەرخستووە گوایە کوردەکان و یەزیدیەکان جیا بن لە یەکتر، بەڵام لەراستیدا یەزیدیەکان لە (یەزد)ەوە نەهاتوون، بەڵکوو لە وڵاتی کوردستانەوە هاتوون و کوردن. بڕوانە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە (١١٢)ی ١٩٨٧. کوردەکانی ئێستا وەرگێڕانی ئازاد عبدالواحد.

★ لێتــوژەرەوە وای نیشــان داوە کە (شەبەك) و (صارلی) لە تیرەی توورکمانەکان بن، بەڵام (صارلی) تیرەیێکن لە (کاکەیی) و (شــەبــەك) لە هۆزی (گــۆران)ن، بڕوانــە کتێبی (الشبــك والصارلیة)، تألیف أحمد الصوف.

★ محەمەد عارف جزراوی، باشترین تەنبوور ڤانی کورد بووە، ئێستا پێی دەڵێن: (مێرێ تەنبووران).

★ مەبەستی لە (راتینج) یان (راتیلج)ە کە لە کتێبی: [تزکرة اولی الألبــاب و والجامع للعجب العجاب)ی داود ئەنطاکی - المکتبة الثقافیة - بیروت - ل ١٦٥ نوسراوە (صمغ الـعـوبە)].

★ وشەی (میانە)م بۆ نێوان ژێ وژێ. می. سۆ. لا. بەکار هێناوە.

★ ئۆکتاف: نووسیویەتی دوور (ئوکتاف) واتە لە دوو ژێ پێك هاتووە کە دوو چین دەنگن.

★ پەردە ! لە پردی ژێیەکانەوە دەست پێدەکات، تا زمانەی نزیك کلیلەکان.

أ - پەردە = یەك تۆنی تەواو

عربە = ٢/١ی پەردە

نم = ٢/١ عربە خواروو

تك = ٢/١ عربە سەروو

★ (کۆك‌کردنی ژێیەکان بە میانەیێکی شەشی) واتە کۆك‌کردن لە نێوان دەنگی بنچینەو وەڵامی هەمان دەنگ واتە (قەرارو جەواب)

★ (نصب الـمـطربیــة) مەبــەست لە کۆك کردنێکە کە لە سەر دەنگی گۆرانی بێژ دەسازێنرێ.

★ (کۆك کردن بە میانەی پێنجی . رێ . لا) واتە (رێ. می، فا، سۆل، لا) دەگرێتەوە.

★ ئەمانە رستەیێکی سەر بە جیهانی مۆسیقایە، زیاتر برایانی شارەزا لە مۆسیقــایتێ دەگــەن کە بریتیە لەو جێگەیەی بۆ ژێیــەکــە داتاشراوە لەسەر پردی ژێیەکەو ئەو جێگەیەی لە خوارەوەی ئامێرەکەدا ژێیەکانی لێ دەبەسترێت.

★ ژێی قەرارە دەنگی گرە، چونکە تا تەنبوورڤان دەستی بباتە دواوە دەنگــەکــە گرتــر دەبێ. جەوابیش تاکــو دەست بێنێتە پێشەوە ئەوە دەنگەکە (زیل) واتە باریك دەر دەچێ.

★ بۆ روون کردنەوە دەڵێن: لە کاتی لێدانی پارچە مۆسیقاییێکی کلاسی، مەودای دەنگی ئەو مۆسیقایە پێویستی بەدەنگی دیکە دەبێت‌لە دەنگە گرەکانیدا واتە لە (قەرار)دا. لێرەدا لێدانی ئەو مۆسیقــایــە پتــر دەنگــەکانی سەرەوەی هەمان ژێی بۆ بەکار دەهێنــرێت، چونکــە ژێ گرکــە ئەوەنــدە خاوە، لێــدانی لە دەنگەکانی خوارەوەیدا شتێکی زۆر ئاسان نیە.

★ واتــە ژێ گرەکە بەبێ پەنجە بەکار دەهێنرێت بۆ دروست کردنی جۆرێ لەرینەوە لە ئاوازەکەدا.

★ وەکو ئیسماعیلیە شیعەکانی سوریەو ئێران.

★ مەبەست لە (الفرق العلویة)یە لە توورکیادا.

★ من لەلای خۆمــەوە وشــەی (بێژەن) لە جیاتی (ئیقاع) بە راستتــر دەزانم وەك لە (رەزم) چونکــە (ئیقــاع) کە لە (و قع الاقدام) مەوە هاتووە، بۆ هەمان مەبەست ئەو وشەیە لە ناوچەی بادیناندا بەکار دەهێنن.

O

# شانۆنامەی کوڕە ئەستێرە

ئامادەکردنی : عوسمان چێوار

« بیری ئەم شانـۆنامەیە لە چیرۆکێکی ئۆسکار وایلدەوە وەرگیراوە کە مامۆستا نەرمین خالید لە ئینگلیزی ـ یەوە وەریگێڕاوە.»

**تابلۆی یەکەم**

(کۆرس چەند منداڵێکن لە کوڕو لە کچ ، جل و بەرگی ئاڵ و والآی هاورەنگیان لە بەردایە، لەسەر ئاوازێك بە جولاندنەوەوە)

کۆرس: کە گۆی زەوی لە دایك بوو
هەرچی سەر ئەرز
هەرچی بن ئەرز
بۆ خۆشیو شادی
ئینسان بوو

★★★★

گشت کەس نان و ئاوێکی بوو
جل و جێگەی خۆیان هەبوو
ژیان بە ختیاریو
سادەبوو

★★★★

بەلآم چاو چنۆك پەیدابوو
تووشی دەردی
خۆ زلی بوو
بەم بەش کردنە
قایل نەبوو.

★★★★

زۆرداروو زۆر لێ کراوان
لەیەك توخم
بەدوو تاقم
لەناو مرۆڤا
پەیدا بوو.

★★★★

یەکێك لە کۆرسەکە: لەو ساتەوە هەتا ئێستا، شانۆو ئەکتەر، لەبـەر چاوی ئێـوەی بینەر ، ئەم یارییە، ئەم والآو گریان و شاییـیــە، بە سەد تەرز، بۆ خۆشیو دەرس، بۆ ئێـوەی بەرز، پیشان ئەدەین .

**ـ تابلۆی دووەم ـ**

(کۆر سەکە هەر خۆیان دیمەنی دارستانێك دروست دەکەن،)
دوو داربڕ ئەم سەرو ئەو سەری شانۆ دەگرن )

داربڕی دووەم: تەمەڵی بەسەر هەستە تەورەکەت بوەشێنە.

داربـڕی یەکەم :تەورم زۆر وەشاند، ئارەقی ناو چەوانم زۆر ڕشت بەلآم بێ هودە بوو

داربڕی دووەم: بەتەمەڵیو تەوەزەلی ژیان ناچێتە سەر ، ئەبێ هەوڵ بدەین ، ژیـــان خۆش گوزەران تر کەین، دەی هەستـە تەورەکەت بوەشێنە

داربڕی یەکەم :(هەڵ ئەسێ) باسی کام خۆش گوزەرانی ئەکەیت ؟

جگە لە تێرکردنی وورگی منالّەکانمان چیترمان بە دەس هانی؟

داربـڕی دووەم : ڕاستــە بۆ خۆمــان هیچی وامــان بە دەس

نەهانی، بەڵام کارکردن یاسای ژیانە، حەواندنەوەی ویژدانە.
**داربڕی یەکەم:** منداڵ! ژیان! ویژدان! ئەمانە دادی من نادەن ، من بەختیاری بێ ماندوو بوونم ئەوێ، من تێرێو تەسلیم ئەوێ (لەیەکتر دەچنە پێشەوە)
**داربڕی دووەم :** تۆ... تۆ تەنها خەمی خۆتە
**داربڕی یەکەم :** بەڵێ خەمی خۆمە.
**داربڕی دووەم :** دەبڕو تا ماوی بە دوای سێبەری خۆتا رابکە.
**داربڕی یەکەم :** چیە گاڵتەم پێ ئەکەی؟
**داربڕی دووەم :** ئەگەر تۆناوا بێت ، نەک من بەڵکو خەڵکی گوندەکەشمان هەموو گاڵتەت پێ ئەکەن
**داربڕی یەکەم :** چاوی خۆت و گوندەکەشت دەربێت .
**داربڕی دووەم :** ئاگات لە دەمت بێت .
**داربڕی یەکەم :** ئاگام لێ نابێت و ئەولا تریش .
(لە وەدان پەلاماری یەکتری بدەن ، لە ئاسمانەوە چەخماخە لێ دەدرێ ، هەور دەگرمێنێ، دەنگی هاوارو ناڵین دێ، ئەمان لە یەکتر جیا دەبنەوە ، ئەستێرەیەک لە ئاسمانەوە دێتە خوارێ، دەنگەکان هێور دەبنەوە، ئەستێرەکە شەق دەبات ، ئەمان دەترسن ، دوای و چانێک داربڕی دووەم لە ئەستێرەکە نزیک ئەبێتەوە)
**داربڕی دووەم ؛** خەوە؟ خەیاڵە؟ جادوو!
**داربڕی یەکەم :** نەخەوەو نەخەیاڵە بەڵایەو داباریوە.
**داربڕی دووەم :** وەرە سەیرکە، منداڵێکی جوانە ئەڵێی فریشتەیە
**داربڕی یەکەم :** ئاخ لە دەست منداڵ .منداڵ و فریشتە !ئەوە شەیتانە
**داربڕی دووەم :** (مەلۆتکەیەک لە ئەستێرەکەوە دەردێنێ) کاکۆڵی زەرد، روخسارپەری، جلەکانی بەزێو چنراو، گەردنی بە ملوانکەی زێڕ- داپۆشراو.
**داربڕی یەکەم :** چی ...چی؟ جلەکانی بە چیو ملی بەچی؟
**داربڕی دووەم :** جلی زیوینی لە بەردایەو ملوانکەی ئاڵتونی لە ملدایە.
**داربڕی یەکەم:** چاکە .. چاکە .. جل و ملوانکەکەی لێ بکەرەوەو خۆشی بخەرە چاڵێکەوە.
**داربڕی دووەم :** هەی چاو چنۆک ئەوە ئەڵێی چی ؟ چارەنووسی ئەم منداڵە بەدەست من و تۆ نیە، ئەمە راسپاردەیە، ئەبێ وەک چاومـان بیپارێزین ، ئەبێ پەروەردەی بکەین تا گەورە ئەبێو ئەبێ بە رۆڵەیەکی بە سوود بۆ گوندەکەمان .

**داربڕی یەکەم :** (تورە دەبێ) ئەی سوودی من ؟ئەی سوودی تۆ
**داربڕی دووەم :** لەگەڵ خەڵکا .. لەگەڵ خەڵکا بە ئاکام دێ.
**داربڕی یەکەم :** (بەفیڵ بازییەوە) باشە .. باشە تۆ راست ئەکەیت.. ئینجا وەرە بامن و تۆ رێکەوین .. من کابرایەکی هەژار و داماوم ..
لە توانـاما نییە منداڵەکانی خۆم بەخێو بکەم .. لەبەر ئەوە با منداڵەکە بۆ تۆ بێت قەیناکە .. منیش تەنها ملوانکەکەیم دەوێت بەسمە قەیناکە.
**داربڕی دووەم :** ئەوە فێڵ لە کێ ئەکەی ؟ ئەم منداڵە راسپاردەیە رسپاردە ئەبێ وەک خۆی بمێنێتەوە.(منداڵەکەهەڵ دەگرێو دەبێ

**- تابلۆی سێیەم -**

(کۆرس دیمەنی ژوورێکی ساکاری ناودێ دروست دەکات
**داربڕی دووەم :** خۆی بە ژووردا ئەکات ، مەلۆتکەیەکی پێیە، خێزانەکەی بە دیار چوار منداڵەوە بەکزییەوە دانیشتووە)
ژن : ئەوە چیە پیاوەکە ئەڵێی بەبێ دارگەراویتەوە؟
داربڕ: داری چی ئافرەت وەرە مژدەم بەرێ، وەرە سەیرکە.
ژن : ( سەیری مەلۆتکەکە دەکات ) ئەوە چیە ! منداڵە منداڵ چی لێ بکەین ؟
**داربڕ : ئافرەت ئەم منداڵە جیاوازە ، ئەم منداڵە دیاری خوایە ئەمە کوری ئەستێرەیە.**
**خوای ئەکرد کوری رۆژ ئەبوو ئێمە منداڵەکانی خۆمان پێ بەخێو ناکرێ نە خوازەلا ئەمە.**
**داربڕ : نابێ ئافرەت ردت کردنەوەی دیاری خوا بەلای گەورەی بە دوا دێ ، ئەگەر لە دەمی خۆمان گرتوتەوە ئەبێ ئەم منداڵە وەک هی خۆمان بەخێو بکەین تا گەورە ئەبێو فام ئەکاتەوە.**
**ژن : بڵێم چی ! مادام کارەکە لای خواوەیە چۆن ئەڵێی باوابێ.**

**- تابلۆی چوارەم -**

کۆرس : لەسەر ئاوازی مۆسیقا بە گۆرانییەوە)
کاتی شانۆو بێ بینەر
وەک یەک نـابێ هەتاکو سەر
رۆژو مانگ و ساڵی ئێوە
زۆر هێواش ئەروا بەریوە
رۆژتان لای ئێمە چرکەیە
مانگتان لای ئێمە خولکەیە
بۆیە عومری کۆرپەی منداڵ
لای ئێمە گەیشتە دە ساڵ

کۆرسەکە دیمەنی دارستانەکە دروست دەکەنەوە)
- ربر: (بەکورە ئەستێرە) کورم تۆ ئیستا تەمەنت دەساڵە، کاتی ـەوە هاتـووە فام بکـەیتەوەو چاکەو خراپە لێك جیا بکەیتەوە، ـنیش رەنجی زۆرم لەگـەڵ داوی. ئەبێ بە قســەم بکەیت و ـ‌ رمەتیشم بدەی . چونکە من باوکی تۆم و وا بەرەو پیر بوون ـەچم .
کورە ئەستێرە ! یەکەم من کوری تۆ نیم بەلکو کوری ئەستێرەم .
ـووەمیش من حەزم لەکارکردن و ماندوو بوون نیە بەلکو هەر حەزم لەیاریو گاڵتە جاڕییە.
دااربر : رۆڵە وەفات هەبێ ، من تۆم دۆزیەوەو بەخێوم کردی،وەك منالەکانی خۆم سەیرم کردی ، خێزانەکەم بە شیری خۆی گۆشی کردی ئیستا منالەکانم خوشك و برای تۆن .
کورە ئەستێرە: نەخێر ئەو ناشیرینانە خوشك و برای نین ، من کوری ئەستێرەم و زۆر جوانم ، من وەك شازادە وام و ئەوانیش لە سوالکـەر ئەچن ئەوان ئەبێ هەموویان خزمەتی من بکەن
دااربر: ئەگەر تۆ ئاوا لووت بەرز بیت رۆژگار نەفرەتت لێ ئەکا. هەرکەسیش روژگار نەفرەتی لێ کرد ئاکامی باش نابێت .
(ئەروات بۆ دااربرین)
**کورە ئەستێرە فیکەیەك لێ دەدا چەند منالێکی هارو هاج دەردەکەون.**(کورە ئەستێرە بە لووت بەرزیەوە ئەم گۆرانیە دەڵێ)
ئاکام چی‌یە ! رۆژگار چی‌یە
خۆشی ئەم ساتەی
ئێستایە
لەشم زیوەو ملوانکەم زێر
من لە بەرزیو خەلکی لە ژێر
ئەنووم ئەخۆم ئەخۆمەوە
هەر من گرەو ئەبەمەوە
دەی وەرن خزمەت کارم بن
نۆکەرو
پالەی مالم بن
(دوو منــاڵ خۆیــان ئەکەن بە ئەسپ ، کورە ئەستێرە دەبێتە سوارو بە دارستــانـەکـەدا دەگـەرێ، پیرەژنێـك دێت ، جلی سوالکـەری لە بەردایـە، مانـدووەو لە ژێر سێبەری دارێکدا دادەنیشێت کورە ئەستێرە دەیەوێت بە ئەسپەکەی بیکات بە ژێرەوە)
پیرەژن : مەکە رۆڵە وامەکە، من پیرەژنێکی ماندوو هیلاکم لێم گەرێ با نەختێ بحەوێمەوە.
کورە ئەستێرە: نەخێر لاچۆ رێگە لە ئەسبی من مەگرە، نازانی من شاسوارم کەس نابێ رێگە لە ئەسپی من بگرێ .
پیرەژن : رۆڵە گیان خۆتت لێ نەگۆرێ، نەتۆ شاسواریت و نە ئەم منالەش ئەسپە، ئەمە یارییەو ئێوەش منالی ئاسایین
کورە ئەستێرە: من منالێکی ئاسایی نیم ، من کوری ئەستێرەم ، ئەگەر باوەریش ناکەی ئێستا نیشانت ئەدەم ... ئادەی منالان بەرد بارانی کەن .
(منـالەکـان شالاو بۆ پیرەژنـەکـە دەبەن ، پیرەژن هاواری لێ هەلدەسێ ، دااربر بە دەنگ هاواری پیرە ژنەکەوە دێت )
دااربر: مەکەن شەیتانینە .. وامەکەن ، بەر نەفرەت کەون ، واز لەو پیرەژنە بهێنن .
(منــالەکـان دوور ئەخـاتەوە، لە پیرەژن نزیك دەبێتەوە) ئەی پیرەژنی داماو چی تۆی گەیاندۆتە ئەم شوێنە؟
پیرەژن : با وانـاکەم ، ئاگری جگەر هەلی گرتووم، دە ساڵ لە مەوبەر سێ چەتەوڵ کورەکەیان دزیم ، لەو ساوە هەتا ئێستا من سەرگەردانیو عەوداڵی کورەکەمم ، چەند شاران و بیابانم بریوە بەلام کورەکەم ، بەندی دڵەکەم بێ سەرو شوێنە.
دااربر: باشە ئەو کورەی تۆ هیچ نیشانەیەکی جیاوازی هەبوو کە لە منالیتر جیا بکرێتەوە.
پیرەژن : بەلێ براکەم .. بەلێ، ملوانکەیەکی ئالتون لە گەردنیا بوو جلی زیوییینی لەبەر دابوو.
دااربر: (ئەچێت پەلی کورە ئەستێرە دەگرێت و دایدەبەزێنی) .. وەرە، وەرە ئەمە دایکتە، دەی ماچی بکە.
کورە ئەستێرە : چی ؟ کێ ماچ کەم . ئەم سوالکەرە ! ئەم پیرەژنە ناشرینە.
پیرەژن :کورەکەم .. بەندی دڵەکەم .. وەرە دایکی خۆت ماچ بکە.
دااربر : دەی خێرا ماچی بکە.
کورە ئەستێرە: ماچ کردنی بۆ قێك یان مارێك لەمە باشترە، من تف لە دەم و چاوی وا دەکەم
پیرەژن : (بەپەرۆشی‌یەوە)نەکەی کاری وا نەکەی.
دااربر توورەیە نەکەی کاری وا نەکەی .
(کورە ئەستێرە تف دەکات)
پیرەژن : (بەگریانەوە) بە نەفرەت بیت (دارستانەکە ئەهەژێت ، وەك بوومەلەرزەو رووخاندنی ئاسمان لە ساتێکدا روو بدات).
(کۆرس بە ئاوازێکی پر لە قین و توورەیی)

**ـ تابلۆی پێنجەم ـ**

کۆرس : نەفرەت ، نەفرەت ، نەفرەت
لەو کەسەی خۆی زل ئەکات

★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★

به گەشەو کەڵەی سەرمەستی
گیانی بە هەوا فوو ئەدا
ئەفسوس .. ئەفسوس .. ئەفسوس
با بزانێ کە میزەڵان
کاتێ دەگاتە کەشکەڵان
بە دەرزییەك ئەتەقێت
هەرچی تیایە گشت دێتە خوار

(کۆرس گەمارۆی کورە ئەستێرە ئەدەن ، لە پڕێکدا هەموویان دەقیژێنن و لێی دوور ئەکەونەوە، کورە ئەستێرە دەردەکەوێت . ناشرین بووە، بە شێوەیەك کە هەرچی ببینێ قیزی لێ ئەکاتەوە)

**کورە ئەستێرە: (بەمناڵی (١) وەرە یاریم لەگەڵ بکە.**
**مناڵی (١): لاچۆ ... لاچۆ تۆ ناشرینی .**
**کورە ئەستێرە: ئەی تۆ ! بۆ وا دوور راوەستاوی؟**
**مناڵی(٢): تۆ رەوزنی، تۆش وەك جاران نەماوی.**
**کورە ئەستێرە : ئێوە چاوتان جوان نابینێ، ئەچم لە رووبارەکەدا سەیری جوانیی خۆم ئەکەم ، ئەو ئەزانێ چەندە جوانم .**
**(کۆرسەکە ووردە ووردە سەر شانۆ چۆڵ دەکەن )(کورە ئەستێرە بە تەنها ئەمێنێتەوە وا خۆی نیشان ئەدا کە لە رووبارەکەدا سەیری جوانی خۆی دەکات) . ئەی هاوار بۆ وام لێ هات کوا جوانییەکەی جارانم ؟ کوا پرشنگی چاوەکانم ؟ ! کوا ... کوا ؟ مناڵینە وەرن ... وەرن دەرمانم کەن ، لەم ئازارە رزگارم کەن بۆچی بە جێتان هێشتم ؟ بە تەنهایی بەرگەی ئەم ئازەرە ناگرم ئەی ئێوە، پەلەوەری دارستان ، ئەی باڵداران ، کوانێ دەنگتان کوانێ رەنگتان ؟ ئاورێکم لێ بدەنەوە. من هەر کورەکەی جارانم (چۆلەکەو کۆترو پەپو دێن)**
**چۆلەکە:(بەترسەوە دەردەکەوێت )تۆ چەند جار بەردت تێ ئەگرتین ،.ئەمەش ئاکامی کارتە.**
**کۆتر: تۆ هێلکەی ئێمەت ئەدزیو ئەتشکاند تۆ ئازاری هەموومانت ئەدا، تو خۆ پەرست بوویت ،ئەمەش ئەنجامی تاوانەکانتە.**
**کورە ئەستێرە: ئەی ئێستا ؟! چارم چییە ؟ ئەی پەپوو ـ سلێمانکە، ئەی دانای گشت زەمانە، چارەسەرێ.. دەرمانێ ـ رێگەیەکم بۆ نیشان بکە.**
**پەپوو: کورم رۆڵە تۆ مناڵی**
**هەر خۆت دەردو هەم دەرمانی**
**دایکت مەرهەمی زامتە**
**دڵی هێلانەکەی گیانتە**
**تا نەیبینیو لێت نەبووری**
**رووی خۆت هەر ئاوا دەمێنێ.**

**ـ تابلۆی شەشەم ـ**

کۆرس : دڵی دایکێ کە رەنجا بێ
رێگا هەروا ئاسان نابێ
کورە شاخ و دۆڵی بڕی
گیانداروو رێبواری ببینی

★★★

خەڵك قێزیان لێ دەکردەوە
مناڵانیش بە بەردەوە
لەم دێو ئەودێ دەریان دەکرد
کەس رووی خۆشی تێ نەدەکرد

★★★

رێگای سێ ساڵی ئاوا بوو
پڕ لە کۆسپ و درك و داڵ بوو
تا لە دەروازەی شارێکدا
کەوت و ووزەی لە بەر برا

(کۆرس ، دیمەنی شوراو دەروازەی شارێك دروست دەکەن ،کورە ـ ئەستێرە ماندووەو دێت لە دەروازەکەدا دەکەوێت )
پاسەوانی (١): (سەتڵێ ئاو بە کورە ئەستێرەدا دەکات )کورە. هێی راست بەرەوە، ئەمە دەروازەی شارە، دەی راست بەرەوە. بزانین چیت ئەوێ؟
پاسەوانی (٢): بڵێ بزانین ، لە کوێوە هاتووی، بۆ کوێ دەچی؟
کورە ئەستێرە: من !..من ! من داماوم ، من سێ ساڵی رەبەقە پەژموازم بە دوای دایکما ئەگەڕێم ئەمەوێ بچمە ژوورێو بیدۆزمەوە.
پاسەوانی (١): ئەمە شاری بۆق نییە هەبێو نەبێ رێگات لێ وون بووە
کورە ئەستێرە: من وا نەبووم دایکم نەفرەتی لێ کردم ، بۆیە وام لێ هات
پاسەوانی (٢): جا ئێستا دایکت ئەتوانێ چیت لێ بکات .
کورە ئەستێرە: پەپو سلێمانکە پێی ووتم .. ئەگەر دایکت دۆزی ـ یەوە داوای لێبووردنی لێ بکە ئەگەر قایل بوو ئەوا چاك ئەبیتەوە (جادوگەرێك دێت)
جادوگەر: سڵاو لە پاسەوانی شار
پاسەوانی (١) و (٢) سڵاو لە جادووگەری شار .
جادوگەر: ئەم زیندەوەرە سەیرە سەیرە چییە !

ـسـەوانی (١): قوربان بۆق کوری بۆق .

ـدوگـەر: (بەدەم جادوگەری‌بەوە) بۆق ! بۆق ! ... وا بزانم گورە بێت یا بچووك هیچ ئاژەڵێ یان زیندەوەرێك بێزی نایەت ـیخوات ،لە بەر ئەوە پارە ناکات ، بەڵام من لە بەر خاتری ئێوە ـمادەم لێتان بکرم ،بە چەند ئەیفرۆشن .

ـسەوانی (١) و(٢) : (راوێژ لەگەڵ یەکتری دەکەن ) قوربان ـپارەی قاپێ شەراب

جادوگەر: قاپێ شەراب بۆ ئەم بۆقە؟! باشە لەبەر دڵی ئێوە قەیناکە.

(جادوگەر پارە ئەدات بە پاسەوانەکان ئینجا پەلی کورە ئەستێرە دەگرێ‌و دەیبات). (بە کورە ئەستێرە) من تۆم بە پارە کریووە لەبەر ئەوە تۆ ئێستا بەندەی منی‌و چیت پێ دەڵێم ئەبێ بە قسەم بکـەی، گوێ بگـرە دارسـتـانێك هەیە پێ‌ی دەڵێن دارستانی درنـدان لەو دارسـتـانەدا تاجێك هەیە پێ‌ی دەڵێن دارستانی درندان لەو دارستانەدا تاجێك هەیە پێ‌ی دەڵێن تاجی شایان ، هەرچی درو گەوهەری دنیا هەیە بەو تاجەوەیە برۆ بیدۆزەرەوەو بۆم بێنە ئەوسا منیش ئازادت دەکەم .

کورە ئەستێرە: ئاخر من ئەمەوێ دایکم بدۆزمەوە.

جادوگەر: دایکیشت هەر وەکو خۆت لە بۆق ئەچێ؟

کورە ئەستێرە: بەڵێ. بەڵام زۆر داماوە.

جادوگەر: ئم ..کەوا بوو منیش ئەبێ دایکت بدۆزمەوە.. ئم بۆق باق..بیق ..یا نی بۆقی بۆقان

کورە ئەستێرە: یانی چی؟

جادوگەر: یانی دایکت لە بۆق بۆقانە.

کورە ئەستێرە بۆق بۆقان لە کوێ‌یە

جادوگەر: لە هەموو دنیادا تەنها من ئەزانم لە کوێ‌یە... هەر کاتێ تۆ تاجـەکـەت بۆ هێنام، منیش ئەتبەم بۆ بۆق بۆقان و دایکت بۆ دەدۆزمەوە....باشە.

کورە ئەستێرە: باشە.

## ـ تابلۆی حەوتەم ـ

[کـۆرس دیمـەنی دارستانی درندان دروست دەکەن، دەنگی پەلەوەر تێکەڵ بە دەنگی ئاژەلە درندەکان دەبێ ، کورە ئەستێرە دێت ،بـە ترسـەوە بە دارسـتـانـەکـەدا دەگـەرێ، گوێ‌ی لە هاوارێـکـی پڕ لە ناسـۆر دەبێ، بەدەم هاوارەکـەوە دەچێ، کەروێشکێك قولێکی لە گەرووی مارێکی زلدایە)

کەروێشك :(بەکورە ئەستێرە) هەی بۆقی دووپێ، مەترسە، وەرە یارمەتیم بدە.

کورە ئەستێرە: چی بکەم ؟نازانم چۆن یارمەتیت بدەم ؟

کەروێشـك : وەرە لەم مارە نزیـك بەرەوە، ئەم مارە قێز لە تۆ ئەکاتەوە، لە تاوە هێلنج دەدات و قۆلم بەر ئەدات .

کورە ئەستـێرە:(لە مارەکـە نزیك دەبێتەوە) دەی، ئەی ماری بێ‌فەڕ قۆڵی ئەو کەروێشکە داماوە بەر بدە، ئەگینا ماچت ئەکەم

کەروێشك : ئافەرم وەرە ماچی بکە با ئەمیش ببێت بە بۆق .

مار:(کەروێشکەکە بەر دەدات) ئاخ ئەی بۆقی دوو پێ‌ی پیس ، چۆن ئەم ژەمە خۆشەت لە کیس دام ... ئای کە پیسی ...ئای کەپیسی (مارەکە دوور ئەکەوێتەوە)

کەروێشك : زۆر سوپاس ئەی بۆقی دوو پێ.. وەرە من قێزت لێ ناکەمەوە چونکە تۆ چاکەت لەگەڵ کردم ...

رەوشتی جوان کەسێکی ناشرین شیرین دەکات .

کورە ئەستێرە: من بۆق نیم من کوری ئەستێرەم دڵی دایکی خۆم رەنجاندووە بۆیە وام لێ هاتووە

کەروێشك :ئەی چی تۆی گەیاندۆتە ئەم دارستانە؟!

کورە ئەستێرە: هاتووم بە دووای تاجی شایاندا دەگەرێم .

کەروێشك :تاجی شایان .. تاجی شایان ..ئابیرم کەوتەوە ..لە کلۆری دارە گەورە دایە وەرە .. وەرە با پیشتانت بدەم .

(لەبەشی دواوەی‌دارستانەکەدا لە دارێکی گەورە نزیك دەبنەوە خەریکن دەست بۆ دارە گەورەکە بەرن )

دارە گەورە: نەکەن ... نەکەن لە خۆرا دەستم بۆ نەبەن دەنا بەسزای خۆتان دەگەن .

کورە ئەستێرە: بۆچی چیمان کردووە.

کەروێشك :ئەمە کورێکی باشە، چاکەی لەگەڵ کردووم .

دارە گەورە: چاکە؟ چاکە بەبێ پاداشت .

کەروێشك : بەڵێ بەڵێ بەبێ پاداشت .

دارە گەورە: چاکـە.. چاکـە مادام وایە، ئەوەی لە کلۆرمدایە ببیەن .

(کورە ئەستێرە دەست دەبات تاجەکە دەردەهێنی) ئەو تاجەی وا لە دەستایە، دانایی لەگەڵ دایە، ئەوەی لەسەر سەری دەکات بە مەرامی دڵی ئەگا (کورە ئەستێرە خەریکە لەسەری دەکات ) پەلە مەکە، پەلە مەکە بەر لەوەی کە تاجەکە لەسەر بکەی ئەبێ بێ تەماع ، بێ ریا، بەبێ پاداشت ، بۆ خوا چاکە بکات .. تێ‌گەیشتی.

کورە ئەستێرەو کەروێشك : بەڵێ .. بەڵێ هەرکەس بە بێ تەماع ، بە بێ ریا، بەبێ پاداشت بۆ خوا چاکە بکات بە ئاواتی خۆمی ئەگا.

★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★

**« تابلۆی هەشتەم ـ**

(پیاوێکی پیری داماو ، جلی سواڵکەری لە بەردایە، دەم و چاوی لە بۆق ئەچێت لە چۆڵەوانی‌یەکدا دەردەکەوێت ).

سواڵکەر: خێرەو مەندان ، گرفتارو داماوم ، لێ قەوماوم

(چەند کەسێك بە لایدا تێ ئەپەڕن بەبێ ئەوەی یارمەتی بدەن ، دووای ئەمــانە کورە ئەستێرە دێت تاجەکەی بە گەڵای دار داپۆشیووە). رۆڵە بچکۆل ، لە ڕێی خودا یارمەتییەکم بدە ئەگینا حاڵم وا بڕوا ئەمرم .

کورە ئەستێرە: باشە مامە گیان بۆچی وات لێ هاتووە؟ دەم و چاوت لە بۆق ئەچێ !

سواڵکەر: تۆش قێزم لێ دەکەیتەوە؟

کورە ئەستێرە: باشە مامە گیان بۆچی وات لێ هاتووە؟ دەم و چاوت لە بۆق ئەچێ!

سواڵکەر: تۆش قێزم لێ دەکەیتەوە؟

کورە ئەستێرە: نەخێر، من ئێستا قێزت لێ ناکەمەوە، ئیتر هەرگیز قێز لە ئینسان ناکەمەوە، بەڵام ئەڵێم تۆش دڵی دایکت لە خۆت رەنجاندووە؟

سواڵکەر: نەخێر من دڵی خەڵکم لە خۆم رەنجاندووە.

کورە ئەستێرە: باشە بە تەمای چیت ؟

سواڵکــەر: هیــچ ، تازە من چاك بوونەوەم بۆ نی‌یە هەرگیز بە مەرامی دڵی خۆم ناگەم

کورە ئەستێرە: باشە مەرامی دڵی تۆ چی‌یە؟

سواڵکەر: ئەوەیە بگەڕێمەوە دۆخی جارانم .

کورە ئەستێرە: (بۆ خۆی) ئەوەی دارە گەورەکە پێی ووتم بۆ ئەم باشە (بە سواڵکەر) دەها مامە گیان ئەمەم لێ وەر بگرە بە مەرامی دڵت ئەگەی (تا جەکەی دەداتێ) بەڵام مەیکەرەوە تا من ئەرۆم چونکە نامەوێ سوپاسم بکەی (ئەڕوات).

**ـ تابلۆی نۆهەم ـ**

**(کۆرس دیمەنی دەروازەی شار دروست دەکەنەوە، کورە ـ ئەستــێرە دێت ، جوان بۆتــەوە، بەڵام خۆی هەستی پێ ناکات ،پاسەوانەکان ئیکلامی بۆ دەکەن ).**

**پاسەوانی (١): قوربان گەورەم زۆر دەمێکە، شارەکەمان چاوارِوانت ئەکات .**

**پاسەوانی (٢):پــیرەکــانی شار ئەیــانووت ئالەم رۆژەدا کوری پاشامان دێت و دڵمان خۆشی دەکات .**

**پاسەوانی (٣): (روو دەکاتە شارەکە) هۆ خەڵکی شار، هۆ خەڵکی شار، مژدەتان لێ بێت وا کوری پاشامان هات وەرن بەپیری‌یەوە.**

**کورە ئەستێرە: ئێوە بە هەڵەدا چوون من کوری پاشا نیم، من کوری پیرەژنێکی سواڵکــەرم دایکم ناشرینــەو خۆشم ناشرینم . بەڵام زۆرم خۆش دەوێت ، من بەدوای دایکما دەگەڕێم .**

**پاســـەوانی (١): قوربـــان تۆ زۆر جوانی ، فەرمـــوو لەم قەلغانەدا سەیری خۆت بکە.**

**(کورە ئەستێرە سەیری خۆی ئەکات ، هەست بە جوانی خۆی دەکات ).**

**کورە ئەستــێرە: راست دەکــەی جوان بوومــەتــەوەبەڵام ئەمانە هیچی دڵم خۆش ناکەن تا دایکم نەدۆزمەومو لێم نەبووری، بەختیار نابم .**

(پیاوە ماقوڵانی شار دەستە دەستە دێن بۆ لای )

پیــاوە ماقــوڵی (١): (ئیکــلام بۆ کورە ئەستــێرە دەکـــات و شمشێرێکی-ئاڵتونی پێش کەش دەکات) فەرموو قوربان ئەمە شمشێری پاشایەتی‌یە، جەنابتان ئێستا پاشامانی چۆن ئەمر ئەفەرمووی سەرمان لە ڕێگاتەیە.

پیــاوە ماقــوڵی (٢):قــوربان زۆر دەمێکە چاوەروانی ئەم رۆژ خۆشەین کە جەنابتان بێن لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشن .

کورە ئەستــێرە: من ناتوانم ببمە پاشاتان تا دایکم نەدۆزمەوە (لەم ساتــەدا پیرەژنــە سواڵکــەرەکــەی دایکی‌و لەگــەڵ پیاوە سواڵکــەرەکەدا دێت بەڵام پیاوە سواڵکەرەکە جوان بۆتەوە) .

(کورە ئەستێرە بەرەو پیریان ئەچێ‌وهاوار دەکات) بوەستن من بەرەو پیری ئێوە دێم (رائەکات بۆ لایان ئەکەوێت بەسەر قاچی دایکی‌دا) بمبوورە دایە گیان بمبوورە. (دایکی دەست دەخاتە سەر سەری).

دایك : هەستە کورم هەستە، ئەمەش باوکتە.

(کورو باوك دایك بەیەك شاد ئەبنەوە)

کۆرس : هۆ دایکەکان

هۆ باوکەکان

کاتێ منالّتان گۆش دەکەن

فێری رەوشتی بەرزی کەن

ژمێ شیرو میهرەبانی

قومێ ئاوو خۆشەویستی لەتێ نان و زمان راستی

دوور بوون لە درۆو لووت بەرزی

شەیدای رێگای حەق پەرستی

بەمە نەوەمان پێ ئەگات

خەڵك بە مەرامی‌خۆی ئەکات

O

# كاروانى رۆشنبيرى لەكوردستاندا

## سلێمانى

ئاراز

**پیشانگای تایبەتی‌ی قوتابی‌ی هونەرمەند «ئاراز حەمە حسین»**

پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە سلێمانی لە رۆژانی ١٩ تا ١٩٩٠/٣/٢٦ داو لە هۆڵی سوورکێو پیشانگایەکی تایبەتی‌ی بۆ قوتابی‌ی هونەرمەند «ئاراز حەمە حسین» کردەوە.

ئاراز لەم پیشانگایەدا کۆمەڵێك کاری خۆی پیشان دا؛ لەو کارانەی کە لە



**قۆناغی خوێندنی پەیمانگادا کردوونی کە تێکەڵ بوون لە کاری ئاوی‌و زەیتی‌و سکێچ و بابەتەکانیش بەسەر مۆدێل و نەقڵ و ستیل لایف دا دابەش ببوون.**

**لە وەڵامی چەند پرسیارێکدا کە لێمان کرد ئاراس دەڵێت**: (راستی‌یەکەی لەم رۆژانەی دوایی‌دا هیچ کارێکی هونەری شێوەکاری بە چاوی هەڵسەنگاندنی هونەریەوە لە لایەن جەماوەرەوە تەماشا ناکرێ؛ تاوەکو بخرێتە

کێشی تەرازووەوە کاری پاك و رەسەن لە کاری نزم جیا بکرێتەوە کە دوورە لە بنەما راستەقینەکانی هونەرەوە کاتێکیش لێی دەپرسیت ئەم کارە دەچێتە چ خانەو قوتابخانەیەکەوە، لە وەڵامدا دەڵێت: ئەمە شێوازی خۆمە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە خوێندنی ئەکادیمیانەی سەرەتای ژیانی هونەریی کز بووەو بەم جۆرە لە زۆربەی کاتدا جگە لە خۆیان کەسی دی لە کارەکانیان ناگات.

بە رای من قوتابی‌ی هونەرمەند پێویستە بناغە ئەکادیمیەکەی لە سەرەتاوە پتەو بکات و هەوڵیش بدات سوود لە گشت تەوژم و قوتابخانە هونەریەکان ببینێت و تاقیان بکاتەوە بۆ پتەو کردنی وەسیلە‌ی تەعبیری لای خۆی.

من زیاتر پەیرەویی رێبازی واقیع[illegible] دەکەم، لەبەر ئەوەی گەلەکەمار[illegible] پێویستی‌ی بەم قوتابخانەیە هەیە بۆ ب[illegible] خستنەوەی کۆمەڵێك شتی لە یاد چوو.

ئەوەی گومانی تێدا نی‌یە پەیمانگا[illegible] مامۆستا رۆڵیان گرنگە لە پێگەیاندنی[illegible] قوتابی‌دا؛ بەڵام ئایا کام مامۆستایە؟ ب[illegible] داخەوە دەڵێم کە نموونەیان کەمە).

**قوتابی‌ی هونەرمەند ئاراس حەما[illegible] حسین:**

ـ لە ساڵی ١٩٦٨ دا لە سلێمانی لە دایك[illegible] بووە.



- لە ساڵی ١٩٨٥ دا چووتە پەیمانگای هونەرە جوانەکان و بەشداریی پێشانگا ساڵانەکانی کردووە.
- قوتابیی دوا قۆناغی خوێندنی پەیمانگای ناوبراوە.

**«پێشانگایەکی تایبەتی»**

**چالاکی قوتابخانەکانی سلێمانی لە رۆژانی ١ تا ٥/٣/١٩٩٠و لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی پێشانگایەکی تایبەتی بۆ قوتابی «سلام عمر صالح» کردەوە.**

کردنەوەی ئەم پێشانگایەو چەندان پێشانگای دی لەم بابەتە لە لایەن بەرێوەبەرێتی چالاکیی قوتابخانەکانەوە لەو بایەخەوە دێ کە بەرێوەبەرێتی ناوبراو دەیدات بەو وزە هونەریانەی کە لە نێو قوتابیان دا بەدی دەکرێ بۆ زیاتر هاندانیان و خستنە رووی ئاستی هونەرییان.

- **سلام عمر صالح لە ساڵی ١٩٧٠ دا لەسلێمانی هاتووەتە دنیاوە.**
- قوتابیی قۆناغی دووەمی ئامادەیی پیشەسازیی سلێمانییە.

**«پێشانگای هاوبەشی چەند قوتابییەکی هونەرمەند»**

هەر لە لایەن بەرێوەبەرێتیی چالاکیی قوتابخانەکانەوە لە سلێمانی و لە رۆژانی ٢٠ تا ٢٥/٣/١٩٩٠ داو لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی پێشانگایەکی هاوبەش بۆ چەند قوتابییەک کرایەوە کە بریتی بوون لە:



● **ئامانج کامل حامد**
- لە ساڵی ١٩٦٨ دا لە سلێمانی لەدایك بووە.
- بەشداریی پێشانگای قوتابخانەکانی کردووە.
- قوتابییە لە ئامادەیی هەڵکەوتی کوڕان.

● **ئازاد أحمد صالح**
- لە ساڵی ١٩٦٨ دا لە سەرچنار لە دایك بووە.
- بەشداریی پێشانگای قوتابخانەکانی کردووە.
- قوتابییە لە ئامادەیی هەڵکەوتی کوڕان.

● **سەیوان عبدالله حسن**
- لە ساڵی ١٩٧٢ دا لە سلێمانی لەدایك بووە.
- قوتابییە لە ئامادەیی هەڵکەوت.

● **محمد رشید**
- ساڵی ١٩٧١ لە سلێمانی لەدایك بووە.
- بەشداریی پێشانگای قوتابخانەکانی کردووە.



● **عابد خالد رسول**
- ساڵی ١٩٧٣ لە سورداش لەدایك بووە.
- قوتابییە لە ئامادەیی هەڵکەوت.

**«مەڵبەندی سەرپەرشتی زانستی لە سلێمانیو چەند چالاکییەك»**

مەڵبەندی سەرپەرشتی زانستی لە سلێمانی لە ٢٥/٢/١٩٩٠ هوە دەستی بە چەند چالاکییەکی خۆی کرد لەوانە:

● سازکردنی دیدارێکی بۆ لێدوان و هەڵسەنگاندنی ئەو راپۆرتە زانستیانەی لە لایەن قوتابیانی مەڵبەندەکەوە ئامادە کرابوون کە سەرجەم گەیشتە (١٧) راپۆرتی هەڵبژێرراو لە (١٥٠) راپۆرتی پێشکەش کراو کە (٧٣) یان بۆ ئەمیندارییەت نێرراوە. ئەم راپۆرتانە لەژێر چاودێریی بەرێزان (مەریوان أحمد رشید، پەروین علي فتاح، سعاد قادر، کریم عبدالله، کاوە محمد جمال)دا ئەنجام دراون و بەسەرپەرشتی مامۆستا (أمین کریم)، لەو راپۆرتانەش:

**١- بەشی بایۆلۆجی**: باسێك بە ناونیشانی (ئایدز)هوە لە لایەن قوتابی (هێمن ابراهیم)هوە.

هەروەها باسێك بە ناونیشانی (مایتۆ کۆندریا)وە لەلایەن قوتابی «گۆران عثمان علي)هوە.

**٢- بەشی فیزیا**:

باسێك بە ناونیشانی (وزەی ناوکە ئەتۆم)هوە لە لایەن قوتابی (عبدالقادر توفیق)هوە

هەروەها باسێکی تر بە ناونیشانی (تەکنۆلۆجیاو شارستانیی مرۆڤایەتی)هوە



له لایەن قوتابی (محمد مجید عارف)موه.

**٣ـ بەشی کیمیا:**

باسێـك بەنـاوی (دروستیی ژینگـەی مرۆڤایەتی) لەلایەن قوتابی (چرۆ جلال)موه.

باسێکی دی بەناوی (پیس بوونی ئاومکان بەنەوت)

**٤ـ بەشی کۆمپیوتەر:**

باسێـك بەنـاوی (یـەکەکانی هەڵگرتن و پاراسـتــن)موه لە لایـەن قوتـابـی (هـەردموان)، هەروەهـا باسی (ڤـایرۆسی کۆمپیوتەر) لە لایەن قوتابی (تارا عمر حمه أمین)موه

**٥ـ بەشی گەردوونناسی:**

باسێك بەناوی (مانگه دەسکردەکان)موه لە لایەن قوتابی (نیگار فائق عمر)موه.

باسێکی تریش بەنـاوی (المجرات)موه لە لایەن قوتابی(غالب رحمن)موه.

**٦ـ بەشی ئەلکترۆن:**

باسێـك بە ناونیشـانی (تـەلەفـزیـۆنی رەنگاورەنگ لە لایەن قوتابی (جبار عثمان محمد)موه.

● سازکردنی کۆڕێکی کراوه بۆ بەشەکانی (فیـزیـا، کیمیـا، بایـۆلۆجی، ئەلکترۆن) کەتیـایـدا ئامـاده بووان سەبـارەت ئەم زانسـتـانـە پرسیـاریـان ئاراسـتـەی بەشـداراني ئەم کۆڕە دەکـرد کە برێتی بوون لە بەرێزان:

**(سـەیـدان محمد رؤوف، ناسك حمه امين، نەوزاد نوري، سلام محمد حمه سعيد).**

**ئەم کۆڕە نزیکەی دوو کاژێری خایاند**

**دهۆك** مەتین

**«دەزگەها رەوشەنبیری و چەند بزاڤەك»**

بـەهـەلکـەفتنـا رۆژا رەوشـەنبـیریا کوردی، رۆژا سەرەدانـا سەروکـێ فەرماندە صدام حسین «خودێ بهێلیت» بو دەزگەها رەوشەنبیری و بەلاڤکرنا کوردی ل بەغدا، دەزگەهـ بزنجیرەکا کۆڕا ل دهوکێ رابـو ل رۆژا ٨/٣/١٩٩٠ ل هۆلا ئێکەتیا نڤیسڤانێت کورد ل دهوکێ.

لڤێ رۆژێ هێـژا رشید فنـدی کۆرەك سەبارا «شعرا کلاسیکی» پێش کێش کر. هێژا حجي جعفر کۆر گێڕا.

ل پێشیێ سەیدا وصفي حسن رێڤەبەرێ دەزگـەهێ ل دهوکێ گوتارەك خاند، تێدا تلا خو درێژکره وان دەستکەفتێت مەزن یێت کو هاتینه بجهـ ئینان ل ژێر ئالایێ سەرکـردایەتیا سەروکێ تێکوشەر صدام حسین « خودێ بهێلیت».

پـش سەیـدایێ رشیـد دەست بیـابەتێ خوکر، ژرێڤە تبابەکێ لسەر دەستپێکرنێت هوزانا کوردی ئاخفت و گوت: «هێژائێت بسپـور هەتـا نوکـە نەگـەهـەشتینـە چ ئەنجـامێت گومـان بر لسەر دەستپێکرنا هوزانـا کوردی، ئو ل دوی ژێـدەرێـت بەدەست بومـه خویـا دبیت ئەدەبێ مه ژسالێت هزارو پێنج سەدێو هێژڤە دەست پێدکەت، گەر بەری هینگێ هەبیت ژی، چ ژێ نەگەهەشتیه دەستێ مه».

ددویڤدا هێژایێ موحازر بێهنەکێ ل دەڤ ئەزمـانـێ نڤـیسینـا شعـرا کوردی ل دەستپێکرنا راوستیا، ناڤبری ئاشکرا کر کو لگـەل زمـانێ کوردی زمانێت ملەتێت هەڤسوی ژی بکار دهاتن، ئو ئەگەرێت ڤێ چەندێ ژی بدرێژی ل قەلەم دان.

پشتی هینگێ هاتە سەر نیڤشکێ ڤەکولینا خو، نێت و مەرەم و بابەتێت ناڤدار دشعرا کوردییا کلاسیکیدا ل سەر خالێت ژێری پارڤەکرن:

**١ـ پەسن:** پەسنا خودێ و پێغـەمبـەراو ئاینیی و پەسنا کوردایەتیێ و پەسنا مێرێت کوردا، نمونه ژشعرێت:

(فەقیێ تەیران، باتەیی، گرگاش و خانی) ئینان.

**٢ـ سالوخدان «وصف»:** نمونەك ژشعرا خانی «باغێ» میر زین الدین» ژمەرا خاند لگەل چەند مالکەکا ژشعرێت: (بەکر بەگێ ئەرزی و فەقیێ تەیـران سەیدای سەبارا ڤی بابەتێ کاك رشیدی خویاکر کو شعر





كوردى دبابەتێ سالوخدانێدا شعرەكا ئارمانجبەر بو دوير ژفسق و فجورو تشتێت پويچ.

**٣ـ فلسفەو علوم العقل و علم الفلك:**
بو ڤان زانيارىيا چەند نمونەك ژشعرێت جزيرىو خانى خاندن.

**٤ـ شيرەت و سنج و رەفتار:**
بو ڤى بابەتى نمونە ژشعرێت ئەحمەد نالبەندى ئينان.

**٥ـ بابەتێ ئەڤينيێو تەسەوفێ:** تبابەكێ لسەر ڤان هەردوو بابەتا ئاخفت و شعرێت فەقيێ تەيران و ماجن ى لسەر ئينان.

**٦ـ ملەت پەروەرى:** ديسان بدرێژى بەحسێ ڤى بابەتى دشعرا كوردىدا كرو مشە نمونە ژشعرێت جزيرى و خانىو نالبەندى ئينان.

**٧ـ كرێت كرن «الهجاء»:**
تبابەكێ لسەر ڤى بابەتى ژى ئاخفت و بوراو بوچونێت خو پەنا برە بەر شعرێت جزيرىو خانى.

**٨ـ يارىو ترانە:**
كاك رشيدى ديا ركر كو مشە بابەتێ يارىو ترانەو حەنەكا دهەوزانا كوردىيا كلاسيكيدا هاتيە، ب چەند نمونەكا ژشعرا: نالبەندىو حسنى بامەرنى ئەڤ لايە دەست نيشان كر.

**٩ـ بابەتێ زانستى:** لسەر ڤى بابەتى ژى تبابەكێ ئاخفت و نمونە لسەر ژشعرا جزيرى بومە ئينان.

ل دوماهيێ هژمارەكا برادەرێت حازر لسەر بيرو رايێت دبابەتێدا هاتين ئاخفتن ژوان:

**تێلى امين ـ نزار محمد سعيد ـ شڤان على.**

**ئەڤەو ڤى كورى نێزيكى دوو سەعەتا كێشا.**

**«تێكەلى دناڤبەرا چيروكێو خاندەڤانى»**
ل ژێر ڤى ناڤنيشانى، ل ئێڤاريا رۆژا ١٠/٣/٩٩٠ كورەك بو هێژا «كريم جميل بيانى» هاتە سازكرن، هێژا نزار محمد سعيد كور گێرا.

ژرێڤە موحازرى پێناسينەك دا كورتە چيروكێو توخم و پشك و جوينێت وێ ژلايێ ناڤەروكێ ل قەلەم دان و مەرجێت سەرەكى بێت كەساو كريارێ دچيروكێدا دەست نيشان كرن.

**چيروكا «كولى» يا هێژا محمد سليم سوارى وەكو نمونە بو هزرو بوچونێت خو هەلبژارت.**

ددويڤدا ئەگەرێت كارتێكرنا چيروكێ لسەر خاندەڤانى هژمارتن و چەند نمونە ژچيروكێت برادەرێت چيرۆك نڤيس ل دەڤەرێ لسەر ئينان.

پشتى ل دەڤەرێ لسەر ئينان.

پشتى هينگێ بدرێژى لسەر وەرارێ درويدانێدا ئاخفت و تلا درێژكرە كەس و ئاشوپێو تبابەكێ ل دەف راوستيا.

**ل دوماهيێ برادەرێت هێژا، نزار محمد سعيد، حجى جعفر، محمد طاهر گوهەرزىو سگڤان عبدالحكيم،** ددان و ستاندنێدا پشكدار بون.

ئەڤەو ڤى كورى نێزيكى سەعەت و نيڤا كێشا.

**ديسان ل ئێڤاريا رۆژا دوو شەمبێ رێكەفتى ١٢/٣/٩٩٠ كورەك بو هێژا «انور محمد طاهر»** هاتە رێكخستن ل ژێر ناڤنيشانێ «ئاڤاهىو دراما دچيروكا كوردىدا».

هێژا «صديق شرو» ئەڤ كورە برێڤە بر.

كاك انورى سێ چيروك وەكو نمونە ژچيروكێت هێژا حسين عارف ىو رۆوف



بێگەردیو عبدالله جندی هەلبژارتن و ئاڤاهیێ وان چیروکا ئاخفت پشتی کورتیەکا روید انێت وان بەرچاڤ کری.

پاشی بدرێژی لسەر خالێت ژێری دڤان هەر سێ چیروکا ئاخفت:

**١- سالوخدان**
**٢- جه**
**٣- دەم**
**٤- قارەمان**
**٥- رەمز**
**٦- تەکنیك.**

ل دوماهیێ کاك انوری خویا کر کو چیروکا کوردی چیروکەکا ئارمانجبەرەو چیروك نڤیسێت کورد ل گەل ئێش و ئازارو ئاریشێت ملەتێ خو دژیو بەرهەمێت وان دویری نێت و مەرەمێ و ئارمانجێت کەسوکی بون پشتی بابەت تەڤان بوی چەند هێژایەك ل گەل موحازریو بوچونێت وی کەفتنە قادا بگرو بکێشێ ژوان:

**«نزار محمد سعید، حجی جعفر، کریم جمیل بیانی، رشید فندی».**

**«لەیلو مەجنونا هوزانڤان حارث ێ بدلیسی دکۆرەکیدا»**

بهەلکەفتنا جەژنێت ئاوداری نەوروزا پیروز، ژبزاڤێت ریڤەبەریا رەوشەنبیریو لاوان و بچاڤدێریا هێژا پارێزگەرێ دهوکێ ل ئێڤاریا روژا ١٥/٣/٩٩٠ ل هولا رەوشەنبیریو لاوان کۆرەك بو هێژا **«عبدالرحمن مزوری»**، هاتە سازکرن ل ژێر ناڤنیشانێ **«ڤەکولینەك سەبارا لەیلو مەجنونا هوزانڤان - حارث - ێ بدلیس ی»، سەیدا انور محمد طاهری کۆر بریڤەبر.**



ژریڤە سەیدایێ موحازر بدرێژی لسەر لەیلو مەجنونێ ل با ملەتێت عەرەبیو تورکیو فارسی ئاخفت ددویڤدا کره بەحسێ ڤێ چیروکێ ل با کوردا وکوت: ملەتێ کورد نەهـ دڤێت نفیسی بێت ڤێ چیروکێ هەنە، چار ژوان بزاراڤێ هەورامی، سێ بزاراڤێ کرمانجیا ژێریو دوو دمق بکرمانجیا ژوری.

پاشی سەیدایێ مزوری کورتیا لەیلو مەجنونا حارث ێ بدلیسی ئەڤا کو ب هوزان هاتیە ڤەهاندن بو مەگێراو بیرو راێت دوو زاناو شارەزاێت کورد دەربارا ئەگەرا ڤەهاندنا ڤێ چیروکێ ل قەلەم دان.

رایا عەولی یا قەناتێ کوردوێە دبێژیت: **«ئەڤ چیروکا هوزانی ل دوی داخازا کیژمکێ هاتیە ڤەهاندنی».**

رایا دی یا نفیسەرێ هێژا عبدالرقیب یوسف بو هندێ دچیت کو ئەڤ چیروکە هاتیە ڤەهاندن ل دوی داخازا مەزنەکێ کوردا ل وی سەر دەمی».

**مزوری رایا عبدالرقیب پەسند کرو گوت:**

بدلیسی بخو دیاردکەت کو بەگزادە عالی عبدالله خان ژێ خاستیە چیروکەکا هولێ ب زمانێ کوردی دانیت. پاش ب درێژی ل پەی ژیانا عبدالله خان ی چو، ئول هزار خو بەرچاڤ کر کو عبدالله خان عبدالله چەرمکیێ دیاربەکرییە ل سالا «١١١٥» مشەختی بویەو سالا «١١٧٤» چویە بەر دلوڤانیا خودێ، هەیامەکێ والیێ حەلەبێو دیاربەکرێ بو، مروڤەکێ زاناو خوشنڤیس بو.

پاشی بومە بیرو راێت چەند زاناو شارەزا ئینان، ژوان: **«رودینکو» و «ژابا»** کانێ ئەڤ چیروکە دانانە، یان وەرگێرانە.

مزوری رایا خو ژێ دیارکرو ل دوی بەراوردکرنا حەفت لبێت ڤێ چیروکێ بو هندێ چو کو دانان و ئافراندنە، نە وەرگێرانەو دەست نیشان کر کو بدلیسی بو دانانا چیروکا لەیلو مەجنونا کوردی ب نیظامێ گەنجەوی داخبار بویە. پشتی هینگێ کەکێ موحازر ب بەفرەهی لسەر رەوانبێژیێ دڤێ چیروکێدا ئاخفت و مشە نمونە ژێ بو هێژایێت حازر خاندن.

هێژاێت بابەت پتر ربساندی ب دان و ستاندن و پرسیارو بەرسڤا ئەڤێت ژێری بون:

**«قسیم محمد حسن، حسین توفی، حجی جعفر، صدیق شرو، عارف رشدی».**

**ئەڤە ڤی کۆری نێزیکی سەعەت و نیڤا کێشا.**

O

# نامەی ڕۆشنبیری پایتەخت



**● تابلۆی سێ هونەرمەندی کوردو پەیکەری تاقە ئافرەتێك**

لە مانگی ڕابردوودا، لە هۆڵی «جواد سلیم» هونەرمەندان «هیمەت کاکەیی و ئیسماعیل خەیات و نامق علی قادر» هەریەکەیان بەجیا وێنەی تابلۆیەکیان لەسەر پەیکەری هونەرمەند «محمد حسین عبدالله» کێشا بوو، زۆر لە هونەرمەندە ناسراوەکانیش لەم پیشانگەیەدا بەشداری‌یان کردبوو.

ئەوەی ڕاستی بێت هەر سێ هونەرمەندەکە زیرەکانەو، بە شێوەیەکی هونەری توانی‌بوویان مامڵەت لەگەڵ



پەیکەرەکەدا بکەن و، کارە هونەری‌یەکەیان سەرنجی بەشێکی زۆری بینەرانی ڕاکێشا.

دەبێ ئەوەیش بڵێین کە **هونەرمەند «هیمەت کاکەیی»**، لە کارە تایبەتی‌یەکەی خۆی‌دا نەی هێڵابوو پەیکەرەکە وەك شێوەکەی خۆی بمێنێتەوە بەڵکو کردبووی بە دوو بەش و، خاکێکی تایبەتی‌ی بۆ دروست کرد بوو، ئەویش بە هۆی بنکەو دیوی دواوەی «باك ڕاوند» پەیکەرەکەو، لەسەر ڕێبازی تایبەتی خۆی کاری بەسەر جەستەو تابلۆکە دیار بوو، بەشێوەیەك هەردوو بابەتەکە تێکەڵاوی یەکتری بوو بوون.

لە پشتی جەستە لەت کراوەکە نەخشەی سرووست بە تایبەتی «دەشت، شاخ، دۆڵەکانی کوردستان» وەکو ئاسۆیەك دەهاتنە بەر چاو؛ هەروەها ڕەنگە گەرمەکانیش دووبارە بۆنی تێکەڵ بوونی مرۆڤ و خاکیان لێ دەهات.



**● هونەرمەند «اسماعیل خیاط» یش**

بە هەردوو ڕەنگە سەرەکی‌یەکانی خۆی «ڕەش و سپی» و، بەکارە تەجریدی‌یەکانی لەسەر سینگ و ڕانی پەیکەرەکە وێنەی تابلۆ نازدارەکەی کێشا بوو.

لەلای ئەویش «سرووشت بە گشتی، باڵندە، ئاژەڵی ئەفسووناوی، گیای بنی دەریا و، ماسی‌یەکانی ئەلوەن»، بە شێوەیەکی ئەندازەیی مامڵەتیان لە گەڵدا کرابوو.

**● هونەرمەند «نامق علی قادر» یش**

ئەمجارەیان و، لەم کارە هونەریەیدا بە شێوەیەکی «ڕەق» پەیکەرەکەی دواندبوو، بەڕەنگێکی زۆر و تێکەڵاو، دڕندایەتی ژیان و کۆمەڵی بەرامبەر بە بوونی ئافرەت بەر جەستە کردبوو.

**● سرووشت و ژیان دەست لە ملانی یەکدی دەبن..**

لەم دوایی‌یەدا هونەرمەند «فؤاد شاکر هەمەوەندی»، لە هۆڵی نیشتمانیی بۆ هونەری نوێ پیشانگایەکی وێنەی فۆتۆگرافی سازکرد، لەو پیشانگایەدا هونەرمەند بیست و حەوت وێنەی «ڕەش و سپی» هەمەجۆری پێشکەش بە جەماوەر کرد.

ئەوەی شایانی باسە ئەم پیشانگایەی هەمەوەندی سێزدەمین پێشانگایە دەربارەی وێنەی فۆتۆگرافی سازی دەکات و، ئەمجارەیان وێنەکان سۆزو خۆشەویستی‌ی هونەرمەندیان بۆ



ـرووشتی کوردستان بەر جەستە دەکرد..

وێنەکان لە نێوان خودی خۆیو ەرمخت دا زمانێکی تایبەتی‌یان هەبوو، ئەمە جگە لە ڕەسەنایەتیەکی هەمیشە کە لە تاقیکردنەوەکانی‌دا؛ واتە لە تاقیکردنەوەکانی هونەرمەند دا بەدی دەکرێ.



کامیرای کاك «فؤاد»ی هونەرمەند وێڵی دوای وێنەی خۆماڵی‌و شوێنەوارەکانەو، مێژوو زیاتر ڕۆشن دەکاتەوە، هەر ئەوەشە وای لە هونەرمەند کردووە کە بە هۆشمەندی‌یەکی بەرزەوە سەرکەوتن بە جیهانی هونەرەکەی خۆی ببەخشێت و لە هەر وێنەیەکیشدا چیرۆکێك وەیا شیعرێك بەر جەستە بکات، ئەوەی جێگەی سەرنج بوو لەم پیشانگایەی هەمەوەندی، ئەو بایەخە زۆرە بوو بە ڕەنگی «ڕەش» بەرادەیەك کە وێنەکان لە ڕووی ڕووناکی‌یەوە خۆیان لەخۆیاندا چراخانێکی هونەری‌یان دەنواند.

ئەوەی راستی بێ ئەم هونەرمەندە ئازیزەمان تا ئێستا لە چەند پشانگایەکی دەرەوەی وولاتیشدا بەشداری‌ی کردووە، بۆ نموونە لە ساڵی «١٩٨٥»دا لە پیشانگای «زغرب»ی دەولەتی‌دا بەشداری‌ی کردووە، هەروەها لە پیشانگاکانی «بەریتانیاو ئەمساو، ئیسپانیاو، یەکێتی سۆڤیەت و پاریسیشدا» بەشداری‌ی کردووە، جگە لەو پیشانگایانەی کە لەسەر خاکی وولاتدا سازی کردوون، بە هەر حاڵ لەم پیشانگایەی هونەر مەند «فؤاد



هەمەوەندی، سرووشت و ژیان یەکیان گرتۆتەوەو دەست لە ملانی یەك بوونەتەوە.



# پۆستەی کاروان

ئەدرەس : هەولێر : ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت : ٢٠٨٨٢

**سۆران / ئامادەی کردووە**

ئازیزان ...

وا لەم ژمارەیشدا جارێکی دیکە وەڵامی بەشێکی تری ئەو بەرهەم و نووسین و نامەو شیعرو چیرۆکانەتان دەدەینەوە کە بە دەست و قەڵەمی رەنگینی ئێوەی خۆشەویست نووسراونەتەوە، ئەو بەرهەمە هەمە جۆرانەی بۆتان ناردووین و دەتانەوێ وەکو دیاری‌یەکی خنجیلانە پێشکەشی خوێنەرانی گۆڤارەکەتانی بکەن، بەڵام بەداخەوە لەبەر هەندێ ناتەواوی و کەم وکورتی لە گۆشەکانی تری کاروان دابراون و، بوونەتە میوانی ئەم گۆشەیە..

ئێمە لە کاتێکدا کە پڕ بە دڵ حەزمان دەکرد هەر هەموو بەرهەمەکانتان لاپەرەکانی «کاروان» یان برازاندایەتەوە، لە هەمان کاتدا پێتانی رادەگەیەنین و دەڵێین نەچووە بچێ، هەوڵی ئێوە کەمی بەسەردا رەت بووە، زۆری ماوە، بەڵام ئەو زۆرە هەوڵ و کۆششی زۆریشی گەرەکە، چونکە یەکێ بیەوێ کەرەستەی چاک و پووخت ئەنجام بدا دەبێ ئەرک و ماندوو بوونی زۆریش بچێژێ، لە کۆنیشا گوتوویانە «دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە». دەفەرموون ئێوەش بێ سڵ کردنەوەو سارد بوونەوە پێشتر گەشتێک بە گوڵزاری شیعرو ئەدەبیاتی کوردیدا بکەن، بەووردی لە بەرهەمی نووسەرو شاعیرە ناسراوو بەناو بانگەکانی کوردو بیگانە بکۆڵنەوەو، بەشێکی ئەو زانیاریانە بزانن کە ئەوان پێیدا رەت بوون و، ئەو کارەی ئەوان لە ژیانی رۆژانەی خۆیاندا پەیرەویان کردووە، ئێوەش هەرنە بێ چارەگێکی ئەو تاقی کردنەوانە بەبەر چاوەوە بگرن تاوەکو بتوانن سوودی لێ ببینن و تیایدا شارەزا ببن، بۆ ئەوەی بتوانن ئەو هیواو ئاواتە مەزنانەی لە دڵتاندایە هەرنەبێ بەشێکی بچکۆلانەی لێ بهێننە دی.

ئەلبەتە هەموو لایەکیشمان مەبەستمانە لە رێگەی ئەو بڵاوکراوە کوردیانەوە، جا چ گۆڤار، یا رۆژنامە کوردیەکانمان بن، بابەتێکی چروپڕو، تێر تەسەل و، پڕسوود پێشکەش بە خوێنەرە ئازیزەکانمان بکەین، ئەوانەی بە پەرۆشەوە چاویان بڕیوەتە قەڵەمی بە برشتی نووسەرو ئەدیب و رۆشنبیرانی کورد بۆ ئەوەی بە بەرهەمە نایاب و سەرکەوتووەکانیان شادو

بەختەوەر بن و، ڕێگەی دوا ڕۆژێکی ڕووناکیان بۆ ڕۆشن بێتەوە..

**ئێستاش فەرموون ئێوەو وەڵامی بەشێکی دیکەی ئەو بابەت و نووسین و بەرهەمانەی بوونەتە میوانی گۆشەکەتان گۆشەی پۆستەی کاروان، هیوادارین وەڵامەکانمان جێگەی ڕەزامەندیتان بن و پێشەکیش سوپاستان دەکەین...**

● **بۆ ئەو بەڕێزانەی ئەم بەرهەمانەیان بۆ ناردووین:**

«کچێ نازێ، کوڕە شەهید، تۆلازێ گوندی، دڵی شاعیر، ڕێبواری ماندوو، خۆشەویستی خەیاڵ، هەر دێمەوە، چاوکاڵ، بەڵێن بدە، هاتەوە بۆم غەم، داماو، ئاوات، هاوکاری‌ی عیراق بۆ برای فەلەستین،ماڵی چۆڵ، گیانە خۆ من، دووبارە زستان وا گەڕایەوە، ئەی کەو، لەبەر بەهاری باغی بەردەریا، ووتم بەیار، کاکە گیان، ووشە بۆ گونجاندن، کڕنۆشی ڕۆح، فەلەستین و دوژمنی گەلی، کاروانی دونیا، بۆ خۆشەویستێک».

سوپاستان دەکەین بۆ هاوکاری کردن و دڵسۆزیتان بەرامبەر بە گۆڤارەکەتان؛ بەداخەوە ئەو بەرهەمانەی لەسەرەوە ناومان بردوون و، ئێوەی ئازیز بۆتان ناردووین نەگونجان بۆ بڵاوکردنەوە، خۆزگە هەوڵی زیاترتان دەدا بۆ ئەوەی بەرهەمەکانتان بەشێوەیەکی سەرکەوتووتر بگەیشتنایەتە گۆڤارەکەمان، بەهەر حاڵ سوپاستان دەکەین و، چاوەڕوانی هەوڵی دیکەتانین.

● **بۆ ئەم دۆستە ئازیزانەی بە بەرهەمەکانیان «کاروان» یان بەسەر کردۆتەوە:**

«ن.ک.ع، ستار احمد عبدالرحمن، ابراهیم هەژار، شادی کریم أمین، کریم غفور سماقوڵی، جلال احمد حسن، س. عثمان سعید، ئەمین پشدەری، ش. ماوەتی، بیمار ڕۆژبەیانی، خالد.ح. هەرکی، سلێمان صابر سەودا، لەوەند سعدی گلی، ل.ف.ف. بێ باک».

برایان، پڕ بەدڵ سوپاستان دەکەین، کە بەم گەرم وگوڕی‌و، بەم جۆش و خرۆشەوە دەستتان داوەتە قەڵەم و کەوتوونەتە نووسین، ئەمەیان خۆی لەخۆی‌دا کارێکی دڵخۆش کەرەیەو، ئێوەش مایەی ڕێزو خۆشەویستین کەوا بە چووستی دەتانەوی بە شیعرو بە نووسین خزمەتی ووشەی ڕەسەنی کوردی بکەن؛ بەڵام لێرەدا دەمانەوێ پێتانی ڕاگەیەنین، مادامەکێ ئێوە ئەم ڕێبازەتان گرتووە، چەند خۆشتر دەبێ گەر بێتو بە شێوەیەکی شارەزایانەو بێ پەلەکردن قۆناغ قۆناغ بە پیری‌یەوە بچن، چونکە ڕێگای دوورو درێژ بەهەنگاوێک دەست پێ دەکا، بۆیە خۆزگە ئێوەش پێشتر بەووردی لە چۆنیەتی نووسین و نووسینەوەی شیعردا شارەزا دەبوون، ئەوسا هەوڵی بڵاوکردنەوەتان دەدا، بۆ ئەوەی ئەو بەرهەمەی ئەنجامتان دەدا خێرو فەرو بەخششی زیاتری بدایە بە دەستەوە. دووبارە سوپاستان دەکەین..

● **بۆ کاکە «خلیل عمر صدیق»**

کاکی برا، ئەو شیعرەی بەناوی «ئەژیێمەوە» بۆت ناردووین، هەوڵدانێکی سەرکەوتووەو هیوای باشتری لێ دەکرێ؛ بەڵام بەداخەوە لەگەڵ ڕێبازی گۆڤارەکەماندا ناگونجێ، خۆزگە بەرهەمی باشترت بۆ دەناردین و، هەربژیت.

● **«ژان» پارچە شیعرێکە کاک «ئا.ح.ر» بۆی ناردووین..**

براگیان پێشەکی سوپاست دەکەین بۆ هاوکاری و دۆستایەتیت لەگەڵ گۆڤارەکەماندا.. بەڵام دەبێ ببووری کە شیعرەکەت هێندە لەبار نەبوو بۆ بڵاوکردنەوە، خۆزگە شیعرو بەرهەمی سەرکەوتووترت بۆ دەناردین.

● **بۆ کاکە «م. دڵنیا»..**

برای باش، ئەو پارچە شیعرەی بەناوی «ڕامان»ەوە بۆت ناردووین تەنها ئەم کۆپلەیەی خوارەوەی شیاوی بڵاوکردنەوە

بوو ، چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین و سوپاست دەکەین..

● رامان ●

پار ئەم کاتە
هەرچی ووشەی ناسك هەبوو
بەبن گوێی مندا دەت چرپاند..
چی رازی نهێنی هەبوو
یەك یەك بۆمنت دەدرکاند.
پار ئەم کاتە..

بولبولێکی خۆشخوان بوویت و،
ئاوازی خۆشت بۆم دەچری..
لە بازاری حەقیقەتدا
دیاریی ئەوینت بۆم دەکری.

★★★★★★

**● کاکە «رێبوار. ا.ح» لە سلێمانی..**

برا لە، سوپاست دەکەین کە بە پارچە شیعرێك بەشداریی لە دەوڵەمەندکردنی گۆڤارەکەماندا دەکەی؛ خۆزگە پەلەت نەدەکرد بۆ ئەوەی شیعرەکەت تا سەر بەرێکی بڕۆیشتایەو ئەو کزییەی بەباڵای خۆی نەدیایە، بە هەرحاڵ هەولدانەکەت مایەی رێزو خۆشەویستیی ئێمەیەو، چاوەڕوانی بەر هەمی باشترو سەرکەوتوو ترین و، هەربژیت..

**● بۆ کاکە «شمس الدین. م.ی»..**

سوپاس بۆ نامەکەت و ئەو پارچە هۆنراوەیەی بۆت ناردووین.. بەڵام دەبێ بمان بەخشی کە هۆنراوەکەت تەنها ئەم کۆپلەیەی خوارەوەی لە بار بوو بۆ بڵاوکردنەوە، چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین و، هەر بژیت..

**● کاتێ کە یادت دەکەم ●**

دەڕوانمە ئەستێرەکان
لێرەو لەوێ
لە پێش نیگام دێن و دەچن..
تا بلۆی جوانیی و،
سۆزو میهری خۆشەویستیم
پێ دەبەخشن...
کاتێ هەڵدێن لە تاریکی نیوە شەوێ!

★★★★★

**● کاکە «خ. عزیز کەریم»..**

سوپاست دەکەین بۆ ئەو شیعرەی بەناوی «هیوا»وە بۆت ناردووین.. ببوورە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو.

**●برای ئازیز؛ کاکە «دانا قادر عزیز» لەسلێمانییەوە:**

براکەم سوپاسی ئەو هەستە پاك و ناسکەت دەکەین کە لە نامەکەتدا دەرت بڕیبوو، هەروەها پیرۆزباییت لێ دەکەین بۆ ئەو وێنە جوانەی بۆ شیعرەکەت کێشا بوو، هیواداریین بەردەوام بیت.. چاوەڕوانی شیعری سەرکەوتووترین و، هەربژیت..

**● بۆ کاك «احمد محسوب احمد» لە پارێزگای نەینەوا..**

برا گیان ئەو شیعرەی بە زمانی عەرەبییەوە بۆت ناردووین بەداخەوە بۆ بڵاوکردنەوە لەبار نەبوو، خۆزگە هەوڵی ئەوەت دەدا بەرهەمی سەرکەوتووترت بۆ دەناردین.

**● بۆ کاکە رزگار عەزیز فەقێ لە قەزای «صدیق»..**

سوپاست دەکەین بۆ بەشداری کردنت لە دەوڵەمەند کردنی گۆڤارەکەمان، ببوورە شیعرەکەت شیاوی بڵاو کردنەوە نەبوو..

**● بۆ کاك «کوردی احمد ابراهیم»، لە پارێزگای هەولێرەوە..**

کاکە گیان، چیرۆکی ژانەکانی ژیان، کەتۆ بە چیرۆك ناوی دەبەی بریتییە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی زۆر ئاسایی ژیانی لادێییەك، بەشێوەیەکی زۆر سادەو ساکار، جگە لەوەی لە هەردوو دیوی کاغەزەکەت نووسیوەو لەگەڵ رێبازی «کاروان»یش ناگونجێ، بۆیە دەبێ ببووری کە دەڵێین ناشێ بۆ بڵاوکردنەوە، هەربەم بۆنەیەشەوە دەڵێین وا چاکە زیاتر بەرهەمی نووسەرو چیرۆك نووسانی کورد بخوێنیتەوە بۆ ئەوەی لە هونەری چیرۆك نووسین و شێوەی دارشتنی رووداوی چیرۆکدا چاکتر شارەزا بیت و، بتوانیت بەرهەمی باشترو

سەرکەوتووترمان بۆ بنێری..

● **بۆ ئەو برایەی ئەم شیعرەی خوارەوەی بۆ ناردووین..**

«یـارو بهار».. برای ئازیز؛ ببوورە کە دەڵێین شیعرەکەت شیـاوی بڵاوکردنەوە نەبوو، خۆزگە هەوڵی زیاترت دەدا بۆ وە دەست هێنـانی شارەزاییـەکی باشتـر لە بواری شیعـرو ئەدەبیاتی کوردیدا.

● **بۆ ئەو برا نووسـەرەی بەنـاوی «دلێر»ەوە ئەم بەرهـەمـەی بۆ ناردووین: «ئـەو گەلە نازی گەر ناوی سەرکردەکانی نەژیەنێ»..**

کاکی برا ئەم جۆرە نووسینانە زیاتر شارەزایی و پسپۆڕیی گەرەکە لە بواری لێکۆڵینەوەی مێژووییدا، هەر چەندە هەوڵی ئەوەت داوە لە ڕێـگـەی یەك دوو سەر چاوەی کۆن شتـێ پێشکـەش بە خوێنەران بکەیت، بەڵام بەداخەوە تیایدا سەر نەکـەوتـوویت و، مەبـەستی سەرەکی باسەکەت نەپێکاوە.. بەهـەرحاڵ وەکو گوتمان ئەم جۆرە نووسینانە شارەزاییەکی ووردو چاکی پێویستە، سوپاست دەکەین.

● **بۆ ئەو بەرێـزانـەی ئەم شیعـرانەیان بۆ ناردووین: «چیای گوشینە، بۆ کوردەکانی ئێران، تۆران، بانگەوازێ، هاوەڵی خەم».**

سوپـاسـتـان دەکـەیـن بۆ ئەو هەستـە بە سۆزەی لە نامـەکانتاندا دەرتان بڕیوە بەرامبەر بە گۆڤارەکەتان «گۆڤاری کاروان» داخمان ناچێ کە بۆمان نەکرا ڕێگە بە شیعرەکانتان بدەین بڵاو بکرێنەوە، چونکە هێشتا بە چاکی تەعبیر لە شیعری کوردیی سەرکـەوتـوو ناکـەن، خۆزگـە لە مەودوا بەرهـەمی باشترتان بۆ دەناردین.. دووبارە سوپاس.

**بۆ کاکە «شوان ڕێدار» لە بەغداوە..**

برای ئازیزو خۆشەویست ئەو بەرهەمەی لە ژێر سەردێری «کەتۆ هاتی»یەوە بۆت ناردووین، بەداخەوە تەنها ئەم کۆپلەیەی خوارەوەی شیـاوی بڵاوکـردنـەوەبوو، هیوادارین لێمان دڵگیر نەبی، چاوەڕوانی بەرهـەمی سەرکەوتوو ترتانین و هەر بژیت..

● **کەتۆ هاتی** ●

**کەچی هاتیو ،**
**تاڵی پرچـت خاو بوونەوەو**
**دەستەکانت هەڵ دەلەرزین..**
**منیش ناچار**
**لە ئامێزم گرتیتەوە**
**تاکو چیتر**
**ئەشکی غوربەت، تارمایی شەو**
**وونت نەکاو،**
**لە پێخەفی ناو دڵمدا**
**دوا شەکەتیت بۆ دەر بکەم**

★★★★★★

● **بۆ ئەو برا ئازیزەی ئەم دوو بەرهەمەی بۆ ناردووین: «ڕاوە کەو، هاوڕێی باش»..**

پێشـەکی سوپـاست دەکـەین بۆ بەشـداری کردنت و بە دەنگەوە هاتنی بانگەوازەکەمان؛ بەڵام دەبێ بمان بەخشی کە هەردوو بابـەتەکەت بۆ بڵاوکردنەوە لەبار نەبوون و، لەگەڵ بۆ چوون و بەر نامـەی گۆڤارەکەماندا نەدەگونجان، چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین و، دووبارە سوپاس.

● **بۆ ئەم برا بەرێزانە:**

«عمر مینە گەلاڵی، فایەق وەهاب نامۆ، صلاح الدین أنور».

سوپـاسـتـان دەکـەین بۆ هاوکـاریو دۆستایەتیتان، بمان بەخشن لە بڵاونـەکـردنەوەی بەرهەمەکانتان، چونکە ساکارو لاوازبوون و، شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون...

● **بۆ ئەو نووسەرە ئازیزانەی ئەم چیرۆکانەیان بۆ ناردووین:**

**«کورتەی ماکبێس، دوو هاوڕێی دڵسۆز، پەیمانی هەورو گزە با، ئاسك»**

هەر بژین بۆ دڵسۆزیتان و دۆستایەتیتان؛ بەڵام بە داخەوە هەر چوار چیرۆکەکە لەبەر زۆر هۆی هونەرییەوە بۆ ئەوە نەدەگونجان لە «کاروان»دا، یا لە پاشکۆی کاروانی منداڵاندا بڵاویان بکەینەوە؛ ئیتر دەبێ لیمان دڵگیر نەبن و، بەردەوام بن لە ناردنی بەرهەمی باشترو سەرکەوتووتر، پێشەکیش سوپاستان دەکەین..

● «سزای ستەمکاری».. شانۆگەرییەکە برایەك لە سلێمانییەوە بۆی ناردووین..

برای باش، لەگەڵ رێزماندا بۆ ئەو هەوڵەی داوتە لەگەڵ چیرۆکەکەو، کردنی بەشانۆگەری؛ بەڵام ئەوەی جێگەی داخە شێوەی ئامادەکردنەکەی سەرکەوتوو نییەو، بۆ «کاروان»یش ناگونجێ.. دەبێ ببووریی‌و، سوپاست دەکەین..

● بۆ کاك «ك. رێناس»..

براله، ئەو چیرۆکەی بەناوی «خۆپەرستی»یەوە بۆت ناردووین و، لە عەرەبییەوە وەرت گێراوە، ناشێ بۆ بڵاوکردنەوە چونکە وەرگێرانەکەی رەوان و سەرکەوتوو نەبوو، خۆزگە بابەتی باشترت بۆ دەناردین..

● «شەرە جوێن، صلاح الدین ئەیووبی»، دوو پارچە شیعری ئەم دوو برا ئازیزەمانن.. «ج. محمد شێخانی» «ج. رجب شوانی»..

ببوورن لە بڵاونەکردنەوەی ئەو دوو شیعرەی ناردووتانە، وا چاکە پەلە نەکەن و، هەوڵی زیاتر بدەن بۆ ئەوەی باشتر لە هونەری شیعر نووسینْ دا شارەزابن، ئەوسا روو لەم مەیدانە بەربڵاوە بکەن، چونکە هەوڵدانی وا ماندووبوون و خۆرۆشنبیرکردنی پێویستە و، سوپاستان دەکەین..

● برایێ هێژا «ز.ط. سلیمان»..

ئەو چیرۆکا ل بن ناف و نیشانێ «کارو کرێکار» تە بومە فرێ کری، نافەرۆکا وێ گەلەکا سستەو هەژی بەلاف کرنێ نینە، ئەم هیڤی خازین کو چیرۆکێت پر بهاوو چێتر بۆمە فرێ کەی‌و، سوپاسیش بۆتە...

● بۆ ئەو برا ئازیزانەی ئەم شیعرانەی خوارەوەیان بۆ ناردووین:

«کۆچێکی سبی، دیاری، پێنووسەکەم، بۆ دواجار، سێ وێنە شیعر، کچە چاوشینەکە، پەلکە زێرینە پارچە شیعرێکی شێخی نەمر»..

سوپاسی هەوڵ و کۆشش و ماندووبوونتان دەکەین، کە بەردەوام هاوکاریمان لەگەڵدا دەکەن و، بە ئاواتەوەین گۆڤارەکەتان زیاتر گەشە بکات و، خێراتر بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێ، جا ئێمەش بۆ ئەوەی ئەو ئاوات و هیوایەی ئێوە بە تەواوەتی بێتە دی‌و، گۆڤارەکەتان بە دڵی هەموو لایەکتان بێت، ناچارین بە ئێوەی ئازیز بڵێین؛ دەبێ بمان بەخشن لە بڵاونەکردنەوەی ئەو بەرهەمانەی بۆتان ناردووین، چونکە بە چاکی پێ نەگەییوون و، نەبوونەتە شیعر.. دووبارە سوپاستان دەکەین..

● لە کۆتایی گۆشەی ئەم ژمارەیەماندا بەو دوو برا ئازیزەمان دەڵێین، کە ئەم دوو بەرهەمەیان بۆ ناردووین: «هەموو تاوانی خۆمانە، شێتی».

ببوورن چونکە هەردوو بەر هەمەکە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون، چاوەروانی بەرهەمی سەرکەوتووترتانین و هەربژین.

**دۆستە ئازیزەکانم؛**

**ئەمجارەش بە وەڵامدانەوەی ئەو نامەو نووسینانەی سەرەوە، پۆستەی ئەم ژمارەیەمان بەرێ دەکەین و، داوا لەو براو دۆستە ئازیزانەمان دەکەین کە وەڵاممان داونەتەوە لیمان زویر نەبن و، رێنمایی‌و پێشنیازەکانمان بە دڵێکی فراوانەوە لێ وەربگرن، چونکە ئاواتی هەموو لایەکمان خزمەتی ئەدەب و رۆشنبیریی و کەلەپووری نەتەوەکەمانەو، پێشەکیش سوپاس بۆ هەموو لایەك و، هەربژین..**

